

رۆمان



# لە پێناو ئاواتەکاندا

ئیقبال سەفەری



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی




بەڕێوەبەرێتیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی

سلێمانی

# لە پێناو ئاواتەکاندا


- نووسەر: ئیقبال سەفەزی
- بابەت: ڕۆمان
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: سۆران عوسمان
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: رووپاک مەحمود
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
- قەبارەی کتێب: A٤ ٢/١
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٠٦)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (٢٦٧٦)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران.
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

کۆتایی وەرزی پاییز بوو، کەش و هەوایەکی تا ڕادەیەك لەبار، بەشێکی وڵاتی کوردانی گرتبۆوە. ڕژێمی پاشایەتی ڕووخابوو و دەوڵەتێکی تازە دامەزراو خەریکی قایمکردنی ژێرخانی دەسەڵاتی خۆی بوو.

هاوکات، گەلێك تاقم و ڕێکخراوی سیاسی دامەزرابوون و ئەوانی کۆنیش جموجۆڵی ئاشکرایان دەستپێکردبۆوە. ئێمەش گەنجانی تازەپێگەیشتوو، دەستە دەستە بە شار و لادێیەکاندا دەگەڕاین و لەگەڵ خەڵکدا، دادەنیشتین و بە خەیاڵ بنەمای دونیایەکی یەکسانییمان دانابوو، بێجگە لە لادێکان، لە زۆر شاریش، وەك شارەکانی کرماشان، ئیلام، ئەیوان، کامیاران، ڕەوانسەر، سەرپێڵی زەهاو، جوانرۆ، قەسری شیرین و کرندی خۆرئاوا کۆبوونەوەمان بۆ خەڵك پێکدەهێنا.

بۆ ئەوەی نیشانمان دابا کە باوەڕمان بە یەکسانی ژن و پیاو هەیە، دەچووینە نێو خەڵك و گەورمان دەماڵی، مەشکەمان دەژەند، دروێنە و دەسکەنەمان دەکرد، جلمان دەشوشت...

بەردەوامیش وشەکانی وەك: سۆسیالیزم، کۆمۆنیزم، مارکسیزم، لینینیزم و گەلێك وشە و دەستەواژەی لەو جۆرە ببوونە وێردی سەر زمانمان و مێشکی خەڵکمان پێوە دەهەژاند. هەرکەس لایەنگری لە بۆچوونەکانمان نەکردبا، بەبێ یەك و دوو، وەك نۆکەری ئیمپریالیزم چاوی لێدەکرا و دەبووە سیخوڕ و بەکرێگیراوی ئەمریکا!

قەتم لە بیر ناچێ کە چۆن ڕۆژێکیان، هێندە لەگەڵ کرێکارێکی کورەخانەی خشت بڕین لە شاری سەرپێڵی زەهاو دواین" تاکو پاڵتۆ ئەمریکییەکەی بەری داکەند و لەبەر چاوی ئێمە سووتاندی! ئای چەندە چەپڵەمان بۆ لێدا و چەندە ئافەرینمان بۆ نارد و چەندە دەستخۆشیمان لێکرد. ئیدی قەتمان بیر لێنەکردبۆوە کە ئەم هەژارە پاش ئەوەی کە پاڵتۆکەی سووتاند، چی لەبەر بکات، هەتا ساردیی زستان بڕستی لێ نەبڕێ. ئای کە چ دیمەنێکی سەیر بوو!

چەپڕەویی ئێمە هێندە خوار ببوو کە لە ناوچەکانی کرماشان و ئیلام، پێی دەڵێن چەپی چەواشە. هەموو تاکارێکمان تەنیا لە ڕوانگەیەکەوە دەبینی، کە بۆ خۆمان بە خەیاڵ دروستمان کردبوو. لە ڕاستی دا تامەلان لە خەیاڵ پلاوی خۆمان چەقیبوویە بێخەبەر لەوەی کە هاکا پەڕۆ سەوز بەسەرەکانی ئیمامی ئۆممەت، پەڕۆکانی سەریان بکەنە پەتی سێدارە بۆمان. تازە لەوەش خراپتر ئێمە بەردی دایکی سۆسیالیستمان! لە سینگی

خۆمان دەدا، کەچی دایکە سۆسیالیستەکە، کوڕەکانی ئیمامی بۆ لە ناوبردنی ئێمە تەیار دەکرد! ئەویش لەبەر ئەوەی کە دایکی سۆسیالیست ئەوانی بە دژی ئیمپریالیزم دەزانی و بەرژەوەندی ئیسلام و سۆسیالیزم لە دژی ئێمە لێك گرێدرابوو!

هێندەی پێنەچوو کە لەلایەن ڕێڕەوانی ڕێگای کەربەلاوە دەرەتانمان لێ بەرتەسك کرایەوە و هاتوچۆمان بۆ نێو شارەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەم و کەمتر دەبۆوە. گۆڕەپان کەوتبووە دەستی کوڕەکانی ئیمام و لە حەق نەگوزەرێین، ئەگەر ئێمە بە لێدوان خەڵکمان دەهێنایە سەر ئەو باوەڕە کە پاڵتۆ ئەمریکییەکانی بەریان بسووتێنن، کوڕەکانی ئیسلامی بێگەردی محەممەدی، بە تەنیا فیشەکێکی «ژێ سێ»ی دروستکراوی کارگە بەرهەمهێنەرەکانی ئەورووپا و ئەمریکا، پاڵتۆکەی بەریانی دەکردە کفنیان. بە تێپەڕینی ڕۆژەکان، گۆڕەپان لە ئێمە بەرتەسکتر دەبۆوە. لەو سەردەمەدا بەدەگمەن هەڵدەکەوت کە ماڵێك بێ چەك بێت. منیش وەك زۆربەی هاوڕێکانم چەکێکم هەبوو و زۆریش خۆمم پێوە ڕادەنا، چونکە چەکی من قەنناسەی نیوە ئۆتۆماتیکی دووربینداری دروستکراوی وڵاتی دایکی سۆسیالیست، یەکیەتیی سۆڤیەت بوو! لە ڕاستیدا لام شورەیی بوو چەکی بەرهەمهێنراوی وڵاتی ئیمپریالیستی هەڵگرم یا لە شان کەم. من خۆم پێ کوڕێك بوو کە دونیایەك وشە و دەستەواژەی وەك: سۆسیالیزم، کۆمۆنیزم، مارکسیزم، لێنینیزم و گەلێکی دیکە دەزانم. لە ئاخافتن دا بۆ هیچ دانامێنم. دژی خوورخدەی بورژوازیم، ئەوەی وەك من بیرنەکاتەوە لە دەستەی (ستوونی پێنجەمە)! لایەنگری پێکهێنانی دیکتاتۆری پرۆڵتاریام و

یەکسانییەکم دەویت لە جۆری یەکیەتیی سۆڤیەت. جا وەرە ئەم چاولێکەرییە ببینە و لە خۆت بایی مەبە و گەزگەز بالاّ مەکە! لەگەلّ مەشکەژەن مەشکەم دەژەند، لەگەلّ گەورِمالّ، گەورِمالّم. لە تەشی رِستن و مانگا دۆشینیشدا کەس تای نەدەکردم. چوار دانە ئارمی بەرابەری ژن و پیاویشم ب ەخۆمدا هەلّواسیبوو، لەگەلّ وێنەیەکی لە تەنەکە دروستکراوی لێنین. دونیایەکم بۆ خۆم پێکهێنابوو، کە لەگەلّ فیلمە خەیالاّوییەکانی" هۆلیۆد"یش مەزەندە نەدەکرا.

ئێوارەیەك لە کۆبوونەوەیەك دەگەرِامەوە کە بۆ دروستکردنی شانەیەکی خۆمالّی گرتبوومان" تووشی یەکێك لە دۆستە نیزیکەکانم هاتم کە لە شارەوە دەگەرِایەوە. پاش هەوالّپرسی، باسی بارودۆخی شاری کرماشانی بۆ کردم و گوتی:

- ئەمرِۆ لە کرماشان چەند کەسیان لە سێدارە دا. چوار کەس لەوانە بە پەرِۆی رِەش چاویان بەسترابوو، پاشان بە پارچەیەکی سەوز کە لێی نووسرابوو «الله اکبر»، لە داریان دان و نیزیکەی چوارسەد کەسێکیش لەویّ کۆببوونەوە و دروشمی مردن بۆ ئەمریکایان دەدا.

پاشان درێژەی بە قسەکانی دا:

- بە رِاستی ئەو دیمەنانە یەکجار زۆر نارِەحەت و خەمباریان کردم، بە تایبەتی کاتێك کە مەلایەك رِایگەیاند کە ئەوانە دژی شۆرِشن و بەلّگەشی ئەوە بوو کە ئەوانە پالّتۆی ئەمریکییان لەبەرکردووە و باسی بەرابەری و یەکسانییان کردووە و دروشمی دژە شۆرِشیان داوە و ناوی دژەشۆرِشیان هەلّگرتووە.

- منیش باسی دانیشتنەکەی خۆمان و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە شانەیەکی تەشکیلاتیدا کردبوومان، بۆ کرد. ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد و هەرکەسە بەرەو ماڵی خۆمان ڕۆیشتین.

بە دوای ئەوەدا هەموو ڕۆژێك هەواڵی سەیر و سەمەرە دەهات کە جێگای سەرسوڕمان بوون. لەو سەروبەندەدا کتێب خوێندنەوە گەلێك باو بوو، چونکە وەرگرتنی زانیاری لەسەر سیستەمەکانی دەسەڵات و ئابووری، بە تایبەت دیکتاتۆری کرێکاری و ئابووری سۆسیالیستی جێگای تایبەتیان هەبوو. ئەو کات زیاتر لە پەنجا دانە کتێبم هەبوون کە زۆربەیان لەسەر شۆڕشی کرێکاری و سۆسیالیستی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا و ئەمریکای لاتین بوون. هەروەها چەند کتێبێکیش لەسەر شۆڕشی فەرانسە و چین. زیاتر لە پێنج شەش حەوتوو بوو کە خەریك بووم بە خویندنەوەی کتێبەکانەوە و هەر لە ماڵەوە مابوومەوە. لەو ماوەیەدا دایکم وەڕەز کردبوو. ئەو پێی دەگوتم:

- ئاخر خۆ ئەتۆ کتێب بۆ ئەوە ناخوێنییەوە تا ببیتە مەلای ئایینێکی نوێ، پاشان ئەگەر هاتوو واش بێ، خۆ ئەم ماڵە حوجرەی فەقێیان بۆ ئەم ئایینە نوێیە نییە. هەستە هەوایەکی تازە هەڵمژە و تەکانێك بە خۆت بدە. هێندە دانیشتووی و خۆر لێی نەداوی، سپی هەڵگەڕاوی و بەم ڕدێنە نەتاشراوەت ڕا وەك قوتابی حوجرەکانت لێهاتووە!

من دەمزانی کە دایکم پەرۆشی منیەتی، بەڵام خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بۆ من گرینگ بوون. ئەو گرینگبوونە لە دوو بواردا خۆی دەنواند. یەکەم دەبووایە من تاکتیك، تیۆری و ستراتیژی ئەو وڵات و شۆڕشانەم لە

باری پراکتیکی و مێژووییەوە زانیبا. دووەمیش، جیاوازی نێوان سیستمەکانی دیکە، کە لە ڕۆژئاوا دەسەڵاتیان هەبوو بناسم. دەتوانم بەڕاشکاوی بڵێم کە ئەو کتێبانە زانیاری منیان لەسەر ئەوەی بە دوایدا دەگەڕام قووڵتر کردەوە.

ئێوارەیەك لەگەڵ دایکم خەریکی نانخواردن بووین. لەپڕ پرسیاری ئەوەی لێکردم کە تا کەی دەمەوێ بە تەنێ بژیم و بۆ چی لە بیری پێکهێنانی ژیانێکی هاوبەشدا نیم؟ گورج لێی هاتمە دەنگ و پێمگوت:

ـ جارێ کاتی ئەوە نەهاتووە و هەرکاتیش بزانم کات لەبارە، بێ دڵێت ناکەم.

بەدوای ئەوەدا بڕیارمدا سەردانی هاوڕێیەکم بکەم کە لە زۆربەی جەولەکاندا پێکەوە هاوسەفەر بووین و ئەویش وەك زۆر لە هاوەڵانی دیکە چەپ بوو، بەڵام دەمێك بوو کە لە بەر زگئێشە ناڕەحەت بوو" منیش لێی بێخەبەر بووم. لەو سەردانەدا بۆ لای ئەو هاوڕێیەم دوو مەبەستم هەبوو. لە لایەکەوە ئاگاداربیم لە باری لەشساغی ئەو بوو. لە لەیەکی دیکەشەوە دەبا باسی خوێندنەوەی کتێبەکانم بۆ بکردایە، چونکە ئەو لە من بە تەمەنتر و ڕادەی زانیاریشی لەسەر وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی و سۆسیالیستی لە من باشتر بوو. هەروەها لە بیریشم دا وامدانابوو کە باسی بە سەرکردنەوەی چەند کەس لە هاوەڵانمانی لەگەڵدا بێنمە گۆڕێ.

ئێوارێ کە تاریك داهات، بە نێوکۆڵانە تەنگ و پێچپێچەکانی دێ دا خۆم گەیاندە دەرکی ماڵی شێرزادی هاوڕێم. لە دەرگای ماڵم دا و پاش ماوەیەکی کورت، بێگەردی خێزانی دەرگای لێکردمەوە. بە دوای چاك و

چۆنیدا چووینه ژوورەوە. ماڵەکەیانم وەك ئاشی بێ ئاشەوان دەهاتە بەر چاو. دانیشتین و پرسیاری شێرزادی هاوسەریم لێکرد. بێگەرد بە لادەمێکەوە وەڵامی دامەوە و گوتی:

- دەستخۆش پاییزە برا! ئاوا لە هاوەڵە گیانی گیانییەکەت دەپرسیتەوە؟ جا ئەو هەر هیچ" خۆ ئەوە من دووگیانم و پێویستم بە یارمەتی هەیە. خۆ ناشکوری نەبێ من نە ئاژەڵم هەیە تاکو شیر و ماستم هەبێ و مەشکەم بۆ بژێنی. نە مەزراشم هەیە کە دروێنە و دەسکەنەم بۆ بکەی. دەبوو جارێك هاتبای و هەواڵێکت پرسیباین.

منیش داوای لێبوردنم لێکرد و پێم گوت:

- ئەوە چەند حەوتوویەکە سەرقاڵم بە خوێندنەوەی هێندێك کتێبەوە" هەر بەو بۆنەوە نەمتوانیوە سەردانتان بکەم.

بێگەرد گورج وشەکەی لە زارم وەرگرت و گوتی:

- باش دەزانم ، هەر ئەو کتێبانە بوون کە قوڕیان بە سەر شێرزاد دا کرد.

درێژەی داو گوتی:

- وابزانم هێندەی پێ ناچێ ئەتۆش و هاوەڵەکانی دیکەیشتان ڕێگای ئەو دەگرنە پێش و بەبێ ئەوەی کەسێك بە جێ و ڕێتان بزانێ، وەکو ئەو بزر دەبن!

من کە قەت چاوەڕوانی ئەو جۆرە هەڵوێست دەربڕینەی بێگەرد نەبووم، گەلێك بە خۆدا شکامەوە، چونکە بە ڕاستی ئەو هەر وەك ناوەکەی بێگەرد بوو. بە سەر سوڕمانەوە گوتم:

- جا من هیچ پێوەندییەك لەنێوان كتێب خوێندنەوە و لێدوانەكانی تۆدا نابینم و تەنیا هەواڵی هاوسەرەكەتم پرسی.

بێگەرد بە دەم لێدوانەوە جامێك دۆی بۆ هێنام كە وەك كاسە هاوسێ بۆیان هێنابوو، پاشان داوای لێبوردنی كردو گوتی:

دەمبوری كە بەبێ پێشەكی ئاوا هەڵوێستم دەربڕیوە، بەڵام چارم نییە و تەنیایی و بێكەسی هەم سەری لێشێواندووم و هەمیش بێهیوای كردووم. بە بیستنی ئەو قسانەی بێگەرد هەستم دەكرد كە نیگەرانییەك لەشی داگرتووە و زۆر بە پەرۆشە، بەڵام نەمدەزانی هۆكاری ئەو پەرۆشی و نیگەرانییە لە كوێوە سەرچاوە دەگرێت. لای خۆم وام بیر دەكردەوە كە ڕەنگە گرفتی خێزانییان هەبێ.

پاش ئەو گلەیی و گازندانە پرسیم:

- ئێستا شێرزاد لە كوێیە؟ سەردانی دوكتۆرتان كردووە بۆ چارەسەری زگنێشەكەی؟

پاش هێندێك ڕامان گوتی:

- شێرزاد بزر بووە و تەنیا ئەوەندە دەزانم كە ڕووی لە ئاوەدانیان نەكردووە.

- دەزانی هۆی بزر بوونەكەی چییە؟

- بەباشی نازانم و لام وایە ئەگەر ڕزگاری بێ، خۆی بە وردی بۆتی دەگێڕێتەوە، من هەر ئەوەندە دەزانم كە بزر بووە و هیچی دیكە.

پاش هێندێك ڕامان و وردبوونەوە لە بنەمای وتەكانی بێگەرد، هاتمە سەر ئەو بڕوایە كە ڕەنگە شێرزاد تووشی گرفتی دەروونی هاتبێ. بە

هەرحاڵ پاش هێندێ دڵدانەوەی بێگەرد، ماڵئاواییم لێکرد و بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

من گەلێك پەشۆکابووم و نەمدەزانی چی بکەم. بە گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە گرفتەکە لەگەڵ دایکم دا بێنمە گۆڕێ، بەڵام نەمدەزانی چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەم، هێندەی پێ نەچوو کە دایکم ڕووی تێکردم و پرسی:

چۆن بوو وا خێرا گەڕایتەوە؟

- چووم بۆ سەردانی ماڵی شێرزاد و بێگەرد، بەڵام شێرزاد لە ماڵ نەبوو بێگەردیش گلەیی لێکردم کە سەردانمان نەکردووە، پاشان پێم گوت:

- دایکە گیان! شێرزاد لە ماڵ نییە و بێگەردیش تەنیایە، بێجگە لەوەش ئەو دووگیانیشە و لەوانەیە پێویستی بە یارمەتی هەبێ.

هەر بەو بۆنەوە داوام لێکرد ئەگەر بۆی دەکرێ بچێت بۆ لای و شەوانەش لە لای بمێنێتەوە. هیچ نەبێ ئەوەم دەزانی کە دایکم زیاتر لە چەند ساڵێك لەگەڵ بابم نەژیابوو و بەباشی مانای تەنیایی هەست پێکردبوو. بۆ خۆم تەنیا ئەوەندەم دەزانی کە باوك و دایکم لە ساڵی ١٩٥١دا ژیانی هاوبەشیان پێك هێنابوو. چوار پێنج ساڵی ئەوەڵ منداڵیان نەبووە و پاش ئەوەی کە منیش وەك یەکەمین منداڵیان چاوم بە دونیا پشکووتبوو" تەمەنم لە ساڵێك تێپەڕی نەکردووە کە باوکم لە سێدارە درابوو، پاشان دایکم بەتەنێ بەخێوی کردبووم و پێی گەیاندبووم. منیش سەرەڕای ئەوەی تەمەنێکم تێپەڕاندبوو و گەنجێکی خوێندەواریش بووم، قەتم لێ نەپرسیبوو، نەشمدەزانی کە باوکم لەسەرچی لە سێدارە درابوو. لەو سەردەمەیشدا پڕوپاگەندەی دەسەڵاتی شا، هێندە بە هێز

بوو کە کار گەیشتبووە هەبوونی پشتوێنی ئیمام ڕەزا لە پشتی حەمەڕەزاشا. هەر بەو هۆیەوە و زۆر هۆکاری دیکەش، پێم باش نەبوو کە خەڵکانی دیکە ئاگاداری لە سێدارە درانی بابم بن. لە پێوەندی لەگەڵ سەردانی دایکم و مانەوەی لە لای بێگەرد دوو مەبەستم هەبوون. یەکەم ئەوەی کە بەڵکو بتوانێ یارمەتی بکا و لە تەنیایی دا نەمێنێتەوە. دووەمیش مانەوەی ئەو لای بێگەرد، دەرفەتێك بوو تا بەڵکو بتوانێ هۆی بزربوونی شێرزادی بۆ دەربکەوێ. لەو کاتەدا منیش بۆ خۆم دونیایەك پرسیار ڕووی تێکردبووم، بەڵام وەڵامێکی ڕوونم بۆیان نەبوو. دایکم هێندێ کەلوپەلی کۆکردەوە، منیش هاوڕێیەتیم کرد تاکو دەرکی ماڵی بێگەرد و شێرزاد. پاش ئەوە، تا گەڕانەوەی دایکم - کە چوار ڕۆژی خایاند، بە خوێندنەوەی بەشێك لە پاشماوەی کتێبەکانەوە خەریك بووم. سەر لە بەیانییەك کە ڕۆژێکی هەتاویی و بێ گوڕوتین بوو. فەرەنجییەکەم خستە سەر شانم و بەرەو بەرانبەری دێ کە خۆرەتاو بوو وە ڕێکەوتم. لەپڕ دایکم بانگی کردمە دواوە. بەرەو لای ئەو گەڕامەوە و پێکەوە چووینەوە ماڵ و لە تەنیشتی دانیشتم. بەبێ پێشەکی چووە نێو ناخی گرفتەکەی بێگەردەوە و گوتی:

ـ بێگەرد هێندێك لە بە سەرهاتی شێرزادی درکاندووە، بەڵام ئەوەشی پێگوتم کە گرفتەکە هێندە ئاڵۆزە کە بۆ گێڕانەوە نابێ.

منیش گوتم:

ـ نامەوێ بە ناخی گرفتەکەیان بزانم، چونکە لەوانەیە پێوەندی بە ژیانی تایبەتی خۆیانەوە هەبێ. لە ڕادەی یەکەمدا دەمەوێ بزانم خودی شێرزاد لە کوێیە و چی بەسەرهاتووە؟

دایکم لە وەڵامدا گوتی:

ـ بێگەرد برِوایەکی قووڵی پێتە و دەیەوێ گرفتی شێرزاد لەگەڵ خۆت بێنێتە گۆرِێ.

ـ زۆرباشە، ئێوارە هەردووکمان پێکەوە دەچین بۆ لای.

بە دوای ئەوەدا بە پیاسە بەرەوخۆرەتاو، وە رِێکەوتم. لە رِێدا چەند کەسێکم تووش بوون کە پاش هەواڵپرسیی، هەواڵی شێرزادیشیان لێپرسیم.

لە وەڵامدا دەمگوت:

ـ چ زانیارییەکم لە سەری نییە، ئەوەندە دەزانم نەخۆشە.

ئینجا ماڵئاواییم لێکردن. پاش وچانێك رِاکشان لەبەر خۆری کەم گورِ و تین، بەرەو ماڵ گەرِامەوە. لە رِێگای گەرِانەوەدا، تووشی پورە گەلاوێژ هاتم. هێشتا چەند گەزێکی مابوو بگەمە لای، رِۆژباشم لێکرد.

وەڵامی دامەوە و گوتی:

ـ رِۆڵەگیان! تا کەی دەتەوێ بە تەنیا بژی. بۆ بیرێك بە حاڵی ئەو دایکە لە دونیا خێرنەدیوەت ناکەیەوە؟ دەزانی رِۆژگارێك بریقەی سەرگۆنای لەگەڵ تیشکی هەتاودا شەرِی دەکرد. مرۆڤ حەزی دەکرد لای دانیشێ و گوێ لە قسە خۆشەکانی بگرێ. ئەوەتا ئێستا وەك کۆتەرە داری لێ هاتووە و بە ناشوکریش نەبێ کەس ئاورِێکی لێ ناداتەوە.

منیش سەرەرِای ئەوە کە سوپاسی هەستی دڵسۆزیم کرد و گوتم:

سەبارەت بە ژیانی هاوبەش، هێشتا زووە و با کاتی خۆی بێت" بیرێك لە حاڵی خۆم دەکەمەوە. سەبارەت بە دایکیشم، ئەو بۆ خۆی خاوەن برِیارە و لە لایەن منەوە هیچ چەشنە گرفتێکی لەسەر رِێگادا نییە. ئەو دەتوانێ

لەگەڵ کەسێکی دیکە ژیان پێك بهێنێت و خۆی لەو تەنیاییە ڕزگار بکات!.

پورە گەلاوێژ ئەو ڕادەربڕینەی منی گەلێك بە گەنجانە زانی و گوتی:

ـ کوڕی بابم! ڕاستە خوێندەواری، بەڵام خۆ لە وڵاتی فەرەنگ گەورە نەبووی و هەر لەم کۆمەڵەدا پێگەیشتووی. نووری چاوەکەم! بۆ مەگەر بۆ خۆت نازانی لەم کۆمەڵەی ئێمەدا هەر ئافرەتێك مێردەکەی بمرێ، یان بکوژرێ، گەلێك دژوارە جارێکی دیکە مێرد بکاتەوە؟ ئێستا کە دەرفەتی مێردکردنی بۆ نییە، خۆ بە لانیکەمەوە دەکرێ ئەتۆ ژیانی هاوبەش پێك بێنی و وەنەوشیش لە کۆڵ نانکردن و تەپ و دووکەڵ بێتەوە.

ئەو بە هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ ماڵئاوایی لێکردم و منیش ملی ڕێگام بەرەو ماڵ گرتە پێش. لە ماڵەوە هەستم کرد کە ژووری نووستنەکەم کە کتێبەکانیشی تێدا بوو، زۆر شپرزەیە. هەندێك جووڵەم وەخۆ خست و ژوورەکەم پاك و خاوێن کردەوە. کتێبەکان کە هەر دانەیەکیان لە جێگایەك بوون، لەسەر جێگای پێشووی خۆیان داناوە و پاشان قەزانێك ئاوم گەرم کرد و خۆم شوشت. تا ئەم وردە خرپپرەم کرد، خۆر ئاوا بوو. دایکم بۆ شێوی ئێوارە نیسکاوی لێنابوو. پاش ئەوەی شێومان خوارد، بەرەو ماڵی بێگەرد وەڕێ کەوتین.

بێگەرد لە گەیشتنمان بۆ ئەوێ گەلێك خۆشحاڵ بوو و تا ڕادەیەك گەشایەوە و بە پێچەوانەی جاری ڕابردوو، هیوایەك بە ناوچاوانیەوە دیار بوو. وا دەردەکەوت کە قسەکانی دایکم شوێنێکی باشی لەسەر ورەی دانابوو. پاش خواردنەوەی سەرو پیاڵەیەك چایی، باسی بەسەرهاتی

شێرزادمان دەست پێ کرد. بێگەرد لەپێشدا نەیدەویست گرفتەکە بەو جۆرەی کە هەبووە بگێڕێتەوە، بەڵام من بەوە ڕازی نەبووم و پێم گوت:

- ئێمە بە مەبەستی یارمەتی و دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ ئەو گرفتەی ئێوە هاتووینە لات. مادام کە نەزانین ڕاستییەکان کامانەن، ناتوانین ڕێگاچارەیەکی باشیش دەست نیشان بکەین. لەو نێوانەدا، بێگەرد ویستی شتێك بڵێ، کە دایکم وشەکەی لە زاری گرت و گوتی:

ـ لە چاوەڕوانیدا مانەوە دەبێتە هۆی گرفتی زیاتر و لەوانەیە تووشی ڕووداوی نالەبارتریشمان بکا، بێجگە لەوەش ئێمە بە گشتی چارەنووسێکی نادیارمان هەیە و ناشزانین لە سێبەری ئەم مێژەربەسەرە تازە بەدەسەڵات گەیشتووانە چ دوارۆژێك چاوەڕوانمانە.

منیش کە ئەزموونێکی ئەوتۆم نەبوو، وامدەزانی کە دایکم هەستی بەوە کردبوو کە لە سێبەری مێزەربەسەراندا، چارەنووسمان بەرەو چ هەڵدێرێکەوە دەچوو، چونکە ئەو تەمەنێکی تێپەڕ کردبوو، یان لانیکەم ئەزموونی ئەوەی هەبوو کە چۆن و لەسەر چی بابم لە سێدارە درابوو. بەو حاڵەش، هیچی لای من نەدرکاندبوو. بە دوای قسەکانی دایکم دا، فرمێسك لە چاوەکانی بێگەرد هاتنە خوارێ و بە دەنگێکی تا ڕادەیەك نووساوەوە لە قوڵپی گریانی دا. منیش کە لە لایەکەوە نیگەرانی چارەنووسی شێرزاد بووم و لە لایەکی دیکەشەوە دڵم بەو چارە ڕەشییەی بێگەرد دەسووتا، پرسیم:

ـ کە وابێ دەزانی چی بەسەر هاوسەرەکەت هاتووە؟

ئەو لە وەڵام دا گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵام نازانم لە کوێیە.

بێگەرد کە شەرمی شکابوو گوتی:

ـ کاکە شوان! تازە شێرزاد جارێکی دیکە وەك خۆی لێنایەتەوە و منیش نیگەزانی ئەوەم کە ئەتۆش بۆ خۆت گیرۆدەی ئەو دەردە ببی.

من کە هیچم بە خۆمەوە شك نەدەبرد، پرسیم:

ـ ئەدی من لەبەر چی گیرۆدەی دەردی شێرزاد دەبم؟

ـ جارێ پێم خۆش نییە بچمە نێو ئەو بابەتەوە و تەنیا دەڵێم کە شێرزاد نەخۆشە و نەخۆشییەکەشی نائاساییە.

ـ دەتوانی بڵێی چۆن نائاساییە؟

لە وەڵامدا گوتی:

ـ بەڵێ، زگنێشەیەکی زۆر دژوار تووشی ببوو کە بڕستی لێ بڕیبوو و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش خراپ و خراپتر دەبوو.

ـ سەردانی دوکتۆرتان کردووە؟

ـ بەڵێ، چووینە لای دوکتۆرێکی زۆر بە ناوبانگ لە کرماشان، بەڵام دوکتۆر گوتی دەرمانی نییە.

ـ بۆ مەگەر شێرپەنجەیە کە دەرمانی نەبێ؟

ـ نا نا کاکە شوان، بریا شێرپەنجە با.

بە بیستنی ئەو لێدوانانە تا ڕادەیەك دڵنیا بووم کە بێگەرد بە گرفتی هاوسەرەکەی دەزانێ، بەڵام نایەوێ و یان لە ڕووی هەڵنایە باسی بکات.

دوایین پرسیارم بەمجۆرە ئاڕاستەی کرد:

ـ بە شوێن و جێگای شێرزاد دەزانی؟

نا، ئەوەندە دەزانم خواردەمەنی وەك ئارد و ڕۆن، قەیسی تەماتە و میوەی وشككراوەی لەگەڵ خۆی بردووە و ڕێگای شاخی داڵەهۆی لەبەر گرتووە. ئیتر لە كوێ بێ و مابێ یان نە، چ زانیارییەكی دیكەم لەسەری نییە.

من تا درەنگانێكی شەو لەوێ دانیشتم، بەڵام دایكم لای بێگەرد مایەوە. كە گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، تەواوی ئەو شەوە لە بیری بەسەرهاتی شێرزاد دا بووم، بەڵام بە هیچ ئاكامێكی گونجاو نەگەیشتم. لەم پێوەندییەدا و بە سەرنجدان بەوەی كە خۆم خەڵكی ئەو ناوچەیە بووم، دەمزانی لە دوارۆژەكانی كۆتایی وەرزی پاییزدا داڵەهۆش گەلێك ساردە و شێرزاد ناتوانێ لە هەركوێ پێی خۆشبێ بمێنێتەوە. هەر بۆیە تا ڕادەیەك دەمزانی بۆ بە دواداگەڕانی شێرزاد ڕوو لە كام قوژبنی ناوچەكە بكەم. هەرجۆر بوو شەوگارم دایە سەر تاكو بەیانی دایكم هاتەوە.

پاش خواردنی بەرچایی، داوام لێكرد كە یارمەتیم بكا و توێشووی چەند ڕۆژێكم بۆ ئامادە بكات. ئەویش نكۆڵی نەكرد و بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ توێشووی بۆ پێچامەوە، بوومەلێڵەی ئێوارێ كە داهات، چەك لە شان و بە كوڵەپشتییەوە لەگەڵ دایكم بەرەو ماڵی بێگەرد وەڕێ كەوتین. لە ڕێگادا چەن كەسێك تووشمان هاتن و دەیانپرسی ئەوە بۆ كوێ دەچی شوان؟ لە وەڵامدا دەمگوت دەچمە شەونشینی.

گەیشتینە ماڵی بێگەرد و دایكم چووە ژوورەوە. بێگەرد زۆر خولقی كرد كە منیش بچمە ژوورەوە، بەڵام من خۆمم داپێچابوو و پێمخۆش نەبوو دانیشم. ماڵئاواییم لێیانكرد و هێشتا لە حەوشەكە وەدەر نەكەوتبووم كە

بێگەرد هاتە پێشم و هەردووك دەستی گرتم و سەرەڕای ئەوەی دەستی دەگوشیم، بە گوێیدا چرپاندم:

ـ کاکە شوان! دەستم بە داوێنت، نەکەی سرِی شێرزاد لای کەس بدرکێنیت، چونکە ئەگەر بێت و خەڵکانی دیکە بەم هەتکە بزانن، ئەوە هەتا هەتایە پەڵەیەکی نەگبەت دەبێتە نازناوی منداڵی منداڵەکەشم.

ئەو درێژەی دا و گوتی:

ـ ئەگەر هاتوو شێرزاد مابێ و چاوت پێی کەوت، پێی بڵێ کە من زۆرم نەماوە و هاکا منالێکم هاوردە دونیا. شوانە گیان! لێی بپرسە چ ناوێك لەسەر منداڵەکە دانێم؟.

منیش بۆ ئەوەی ورەی پێبدەم، پێم گوت:

ـ دڵنیا بە کە شێرزاد ماوە و لەوەشدا گومانم نییە کە پێشنیار دەکا من ناوێك بۆ منداڵەکەتان هەڵبژێرم.

دیسان دڵی تاقەتی نەگرت و پرسی:

ـ باشە، تۆ چ ناوێکی بۆ هەڵدەبژێری؟

کەمێك ڕاوەستام و گوتم:

ـ ئەگەر کوڕ بێت و بڕیاریش وابێ کە من ناوی لەسەر دانێم، ئەوە ناوی دەنێین ستالین. ئەگەریش کچ بوو، بۆ خۆت ناوی بۆ هەڵبژێرە.

ئەو جارەش دڵی تاقەتی نەگرت و پرسی:

ـ جا لەو هەموو ناوە، بۆ ڕێك ستالینی ناو بێ؟

من شانێکم هەڵتەکاند و لە وەڵامدا گوتم:

ـ لەبەر ئەوەی ئەو بوو لـەمبۆزی گەورە ئیمپریالیستەکانی بە خۆڵدا ماڵی. ئەو بوو کە بە ئازایەتی و لێزانی خۆی تەنگی بە نازییەکان و فاشییەکان هەڵچنی و بە دابەزاندنی یەکسانی و دادپەروەریی، هەژاران و لێقەوماوانی کردە خاوەنی سەروەت و سامان و ئازادی و سەربەستی. نازانی چۆن ڕێبەرێك بوو! ئەوە ئەو بوو کە بە تەنیا بڕیارێك ئەڵمانی کردە دوو بەشەوە و بە دونیای سەلماند کە لە توانایدایە هەموو نەگونجاوێك بگونجێنێ.

درێژەم دا و گوتم:

ـ ناوی دیکەش هەن کە دوای گەڕانەوەم باسیان لەسەر دەکەین.

لەو قسانەدا بووین کە دایکم لێم هاتە پێش و گوتی:

ـ ئیتر بەسە شوان، مەگەر ئێمە بۆ خۆمان نەهامەتیمان کەمە، تاکو ئەتۆش هێندەی دیکەی پێ زیاد بکەی؟

ئەو هێندە توورە بوو کە لە ژیانمدا وا بە توورەیی نەمدیتبوو.

بڕێکی دیکەش لێم هاتە پێش گوتی:

ـ چی دیکە نامەوێ گوێم لە لاساییکردنەوەی ناوی ئەم سەرۆك و ئەو ڕێبەری بێگانە بێ. ئەم چاکە شۆڕەمان کە بە زەویدا دەکشێ و کەسیش بە دەشایی لێمان نایکڕێ، دیاری و بەراتی ئەو جۆرە بیرۆکە خەیاڵاوییانەیە کە ئێوەمانان کردووتانە بە کۆڵەباری مێشکتان. بەڵێ، ئەو چەندین وڵات و یەك لەوان ئەڵمانیشی کردووە دوو بەشەوە، بەڵام هەر ئەویش بوو پشتی ئێمەی شکاند.

من ئەم هەڵچوونەی دایکمم وەك ناسزایەك بە خۆم هاتە بەرچاو، بەڵام چونکە ڕێزێکی تایبەتیم بۆی هەبوو و ڕێگاشم لەبەر بوو، چ هەڵوێستێکم لە خۆ نیشان نەدا و بە جۆرێك تووڕەییەوە ماڵئاواییم لێیان کرد و لە حەوشە وەدەرکەوتم.

هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوومەوە کە دایکم بانگی کردم و پێی گوتم:

- دەزانم دڵم ئێشاندوی، بەڵام کە گەڕایتەوە هێندێك بابەت هەن کە دەبێ پێکەوە باسیان لەسەر بکەین.

هێندەم گوێ بۆ شل نەکرد و ڕێگای هەورازی شاخی زستانەم بەرەو داڵەهۆ گرتە پێش.

لە ڕێگادا بیرم لە دوایین قسەکانی دایکم دەکردەوە و لە دڵەوە دەمگوت: « ئەی دایکی چارەڕەش، ئەتۆ کە تەواوی ژیانت پڕە لە نەهامەتی و قوڕبەسەری و تەنیا چەند ساڵێك زیاتر لەگەڵ بابم نەژیاوی. ئەتۆ کە قەت خۆشیت نەچێشتووە و تەنیا هاودەم و هاوڕێی ژیانت، دەستەملان لەگەڵ خەم و پەژارە، نەداریی و چەرمەسەریی، لاواندنەوەی لە سێدارەدراوەکان و بێسەر و شوێن کراوەکان بووە، ئاخر پێم نالێی چیت هەیە تا لە گەڕانەوەمدا بۆم باس بکەی!؟».

هێندە تووڕە بووم کە لێوەلەرزەم گرت. خەریك بوو چەنەگەم لە جێ دەرچێ. لە خۆمم دەپرسی، ئەی ئەگەر دایکم شتێکی بۆ گوتن هەیە، ئیتر بۆ تا ئێستا باسی نەکردووە. لەو مانگەشەوەدا و ساردی هەوای ئەو پاییزەشەوە و لەبەر تووڕەبوونی خۆم، ڕێگام لەبەر نەدەچوو هەورازی

زستانه، ناوی خۆی بەخۆیەوە بوو. یەکێك لە دژوارترین هەورازەکانی ناوچە بوو، بۆ بڕینی ناچار دەبووم هەر چارەکە کاتژمێرێك، وچانێك بدەم و بحەسێمەوە.

لەگەڵ شەفەقی بەیانی گەیشتمە سەر ئاسۆی شاخی زستانە. پشت و پەلم کردەوە و وچانێکی باشم دا. لەبەر جەمام بوون لاقەکانم گیابوون و باش بە شوێنم دا نەدەهاتن. تاکو هەوا بە تەواوی ڕووناك بۆوە، لەو جێگایە دانیشتم. پاش ڕووناکبوونەوەی هەوا، دووربینەکەم دەرهێنا و چاوێکم بە سەر شاخەکانی کوڕیکەلان، گاوەنیا، بلچەدۆڵ و بایکوان دا خشاند و پاش حەسانەوەیەکی باش کۆڵەپشتەکەم کردەوە و چەند کلۆ دۆین لەگەڵ هێندێك گوێز و دوو دانە بژیم خوارد و قومێك ئاویشم بە سەردا کرد.

لەو کاتەدا خوتورە دای‌گرتبووم و زۆرم بیر لە تووڕەبوونەکەی دایکم دەکردەوە. ئاخر ئەو تەواوی ژیانی خۆی کردبووە قوربانیی پێ گەیاندنی من. وای بۆ دەچووم کە دەبێ تیغ گەیشتبێتە ئێسکانی، تاکو بەو جۆرە تووڕەیی خۆی دەربڕیبێ. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە بە دوای ئەو هەڵوێستەی دایکم دا کەوتمە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. هەر ئەوکات دەفتەری بیرەوەرییەکەم دەرهێنا و ئەو هەڵچوونەی دایکمم یادداشت کرد. هاوکات چاوم بە ڕیزە ناوێك لە هاوڕێیانی هاوبیروباوەڕم کەوت کە چەند مانگ پێشتر لە کۆبوونەوەیەکدا لە شاری کرندی ڕۆژئاوا یادداشتم کردبوون. لە چاوخشاندنێك بەسەر ناوەکاندا، خاڵێك بە نامۆ هاتە بەرچاوم. ئەویش ناوەرۆکی ناوەکان بوو کە زۆربەیان عەلی، موحەممەد،

شارام، حوسەین، عەلی ئەکبەر، ئەبوبەکر، عوسمان، عەلی ڕەزا، موحەممەد ڕەزا، ئەبولفەزل و هیتر بوون. تەنیا ئێمە چەند کەسێك بووین کە ناوەکانمان جیاوازی بەرچاویان پێوە دیار بوو کە هەموومان خەڵکی گوندێك بووین. وەك: شوان، شێرزاد، سەیران، جەیران، سەنگەر، چنار، جوامێر، بێستون و... هەر لەژێر ئەو یادداشتەدا نووسیم کە لە گەڕانەوەدا سەبارەت بەم ناوانە پرسیار لە دایکم بکەم.

کەلوپەلەکانم لە خۆ بەستنەوە و بە سەرنجدان بەوەی کە شارەزای گشت کون و قوژبنەکانی ناوچەکە بووم، بیرم لێ کردەوە کە ئەگەر بێت و شێرزاد لە بان داڵەهۆ بێ، ناتوانێ بەبێ ئاو بژی. لەبەر ئەوە کە بان داڵەهۆ، چەند کانیاوێکی زیاتری لێ نییە و هەواش سارد ببوو. بەباشم زانی کە گەڕان بە دوای شێرزاد دا لە سەراوی سیاوانە (نەڕەکانی) و لە بانگۆڵوانەوە دەست پێ بکەم. سەراوی نەڕەکانی یان سیاوانە سەرچاوەی ڕووباری ئەڵوەنە. ئەم ڕووبارە لە بان داڵەهۆوە دەست پێ دەکا و دەڕژێتە نێو گوندی گەشتیاری و بە ناوبانگی" ڕیژاو"ەوە. ئەمجار بە ناوەڕاستی شاری سەرپێڵی زەهاو دا تێدەپەڕێ و بە پاڵ قەسری شیریندا و بە نێو دڵی خانەقین دا، ڕێگای نەگەڕانەوە دەگرێتەبەر.

هەوا بە تەواوی سارد ببوو، بێجگە لە مێخوری دارمازوو، گەڵای داری لێرەوارەکان وەریبوون. پاش ئەوەی بڕیارمدا لە کوێوە دەست پێ بکەم، بەرەو شاخی تۆرشکە و بانبەڵاڵوکان کە لە بەشی خۆرئاواوە زاڵن بەسەر سیاوانەدا، وەڕێ کەوتم. بۆ کاتی یازدەی بەر لە نیوەڕۆ گەیشتمە سەر

یەکێك لە بەرزاییەکانی تۆرشکە و لەوێوە چاوێکم بە شاخەکانی قازان شکێن، خوڵینە، شەشدار و سەرمەریس دا خشاند.

گەلێك ماندوو ببووم، خەو دایگرتبووم و وەنەوزم دەدا. فەرەنجییەکەم ڕاخست و لەسەری ڕاکشام، پاش کاتژمێرێك لە قیڕوقاڕی دوو قەلەڕەشەدا کە بەسەر سەرمدا دەفڕین لە خەو هەستام، هەموو لەشم ئازار دایگرتبوو. قاچەکانم بێهێز و گەرووم وشك ببوو.

لەو کاتەوە بۆ چەند کاتژمێر بەردەوام بە دەوروبەری خۆمدا بە دووربین چاوم بە کون و قوژبنەکاندا خشاند، بەڵام بێجگە لە مەل و مۆر هیچ گیانلەبەرێکی دیکەم بەر چاو نەکەوت.

بڕیارمدا جێگایەك بۆ حەوانەوەی شەوم هەڵبژێرم. لە بەر ڕووناکایی خۆرەزەردەی ئێوارێ، ژێربەردێکم ڕەچاو کرد کە لە ئەشکەوت دەچوو. بەرەو ئەوێ وەڕێ کەوتم و هەتا گەیشتمە وێ، گەلێك داری وشکم بۆ ئاگری شەو کۆکردەوە. کەلوپەلەکەم دانا و گەڕامەوە بۆ سەر لوتکەکە و تا بوومەلێڵەی ئێوارێ داهات خەریکی دووربین تێگرتن بووم، پاشان بەرەو ئەشکەوتەکە گەڕامەوە و ئاگرێکم کردەوە. هێندێك ئاو کە لە جەوەنەکەدا مابوو، لە کترێ کرد و لەتەنیشت ئاگرەکەم دانا، تا چا دەمی کێشا، هەوا بەتەواوی تاریك داهات، گەلێك ماندووبووم و تێکۆشام بەڵکو بنووم، بەڵام سەرەڕای هەوڵی زۆر، خەو نەدەچووە چاوانم.

بڕیارمدا بڕۆمە خوارەوە بۆ سەر سەراوەکە، تاکو هەم دەست و چاوم بشۆم و هەم جەوەنەکەش پڕکەم لە ئاو بۆ بەیانی، چەکەکەم هەڵگرت و بەرەو نەڕەکانی وەڕێ کەوتم.

لەسەر ئاوەکە دەست و چاوم شوشت و سێ چوار گۆمەل ئاوم خواردەوە. بەدوای ئەوەدا جەوەنە و مەتارەکەم پڕ لە ئاو کردن و بەرەو ئەشکەوت گەڕامەوە. بە گەیشتنەوەم بە وێ ئاگرەکەم تازە کردەوە و لە پاڵی ڕاکشام. هەوا گەلێك سارد بوو و کەس نەیدەتوانی بەبێ ئاگر ئۆقرە بگرێ.

هەوڵدانم بۆ نووستن بێ ئاکام بوو. بەشێك لەوەی کە نەمدەتوانی بنووم، ترس و دلەڕاوکێ بوو، چونکە دزیی و جەردەیی، تالآن و چەپاوکردن لەو سەردەمەدا ببوونە پیشەی کەسانی هەلپەرەست. ڕادەی تۆڵە ئەستاندنەوەش هەر کامە و بە جۆرێك رووی لە پەرەئەستاندا بوو. بۆ خۆم گومانم لەوەدا نەبوو کە ئەگەر دز و جەردە پێم بزانن، بێجگە لەوە کە چەکیان دەکردم، لەوانە بوو بشم کوژن. لە ڕاستیشدا ئاگرەکە دەیتوانی نیشانەیەکی باش بێ تا دز و جەردەکان بەبێ گرفت بە شوێنەکەم بزانن.

کورد گوتەنی: کۆسە چوو بۆ ڕیش، سمێڵیشی لەسەر دانا.

چی دەهات خوتورەی زیاتر لەشمی دادەگرت و بیرم لەوە دەکردەوە کە لە ئەشکەوت و ئاگرەکە دوور کەومەوە. هەرچی کات تێدەپەڕی، باری دەروونیم خراپتر دەبوو و دلەڕاوکێشم لە پەرەسەندن دا بوو. تاکو وەبیری ئەوە کەوتم کە ئەگەر بێتو شێرزاد لەم دەڤەرە بێ، خۆ ناتوانێ بەبێ ئاگر شەوگار تێ پەڕێنێ، بە هەندێك قووڵ بیرکردنەوە لەم بۆچوونەم، بڕیارمدا کە تاکو توێشوی خواردنم پێ مابێ، دەبێ بە ڕۆژانە بحەسێمەوە و بە شەوانەش بەسەر شاخە بەرزەکاندا بە دوای تروسکەی ئاگردا بگەڕێم و سەرنجی خۆم بدەمە ئەو جێگایانەی کە ئەشکەوت و کەل و کونیان زیاترە. هاوکات لەگەڵ بیرکردنەوەکانم دا، چایەکم دەمکرد و چەند پیالەیەکم لێ

خواردەوە، پاشان کەلوپەلەکەم لە خۆ بەست و بەرەو سەر شاخی تۆرشکە هەڵکشام. گەیشتمە لوتکەی شاخ و وچانێکم دا و نەختێك حەسامەوە. شەوگار هێندەی نەمابوو، بەڵام ساردی شەفەق مەودای نەدام تاکو چاوێك گەرم بکەم. هەربۆیە تاکو ڕۆژ هەڵات، لەم بەرزاییەوە بۆ ئەو بەرزایی و لەم لوتکەوە بۆ ئەو لوتکە لە جموجوڵدا بووم و خەریك بووم بە دووربین تێگرتنەوە" تاکو هەوا بە تەواوی ڕووناك بۆوە، پاشان لەتەنیشت دارە قەسقەوەنێك دانیشتم و ئاگرێگی بێ دووکەڵ و جوانم کردەوە. کتریبەکەم لە پەنا دانا و پوختێك چایم بەستە بانی. هەتاوێکی گەلێك خۆش، بەڵام بێ تین لێی دەدام. تا دوو چام خواردەوە، لەشم گەرم داهات. دووربینەکەم هەڵگرت و چاوم خشاندە سەر شاخەکانی شەشدار، قازانشکێن، گۆڵوان، گەچەوڕان، مەخەڵەخاسە، بەرزەوان و کوڕیکەڵاندا.

هێندەی پێنەچوو لە پڕ خەو دایگرتم و خەریك بوو دووربینەکەم لە دەست بەربێتەوە.

بە باشم زانی وەنەوزێك بدەم و بەم مەبەستە سەرم لەسەر بەردێك دانا و لە چاوتروکاندنێکدا، خەوم لێکەوت. کاتێك وەخەبەر هاتم و چاوم لە کاتژمێر کرد، یازدە و نیوی پێش نیوەڕۆ بوو. هەستامە سەر پێ و بە لای نساردا پەنجا گەزێك لەو شوێنە دوورکەوتمەوە، بۆنێکی زۆر خۆش سەرنجی ڕاکێشام. هێندێك بەم لاو بەو لادا گەڕام، تاکو لە پڕ گەیشتمە دارە بلچێك کە بنی پڕ بوو لە گۆیژی پێگەییوو. لە ماوەیەکی کورتدا هەردووك گیرفانەکەم پڕ کردن لە گۆیژ و چەند دانەیەکیش بەڕووم لە بن دارە بەڕووەکان دۆزییەوە. لای خۆم گوتم بەختێکی باشم هەیە، ئەگینا ئەم

گۆیژ و بەڕووانە چۆن توانیویانە لە دەست بەراز، ورچ، سمۆرە، قشقاڕە،... دەربچن. گەڕامەوە بۆ لای کەلوپەلەکان و ئاگرەکەم هەڵکردەوە و چەند دانەیەك لە بەڕووەکانم کونکردن و تێم هاویشتن، چونکە دەمزانی ئەگەر بێت و بەڕوو بە ساخی لە ئاگری خەی، دەتەقێتەوە و پریشکی ئاگر جلەکانی بەرم دەسووتێنێ و یان ئاگر بەر دەبێ لە لێرەوار و لەوەڕگەکان. بە دوای چەند خولەکێکدا بەڕووەکان برژان و یەك لە دوای یەك دەستم بە خواردنیان کرد. لەو کاتەدا کە لە دونیای بەڕوو خواردندا بووم ، دەنگی فڕۆکەم وەبەرگوێ کەوت. هێندێك چاوم بە ئاسماندا گێڕا و دوو فڕۆکەی شەڕکەرم دیتن کە بە خێرایی بەرەو سنووری قەسری شیرین دەفڕین. ئەوکات وەبیرم هاتەوە، ئەی دڵەی غافڵ! خۆ من ڕادیۆم پێیە و ئاگاشم لێی نییە. گورج ڕادیۆکەم دەرهێنا و خستمە سەر ڕادیۆ تاران کە بانگی نیوەڕۆی بڵاو دەکردەوە. ڕادیۆکەم داخست و دەستم کردەوە بە بەڕوو خواردن. پاش چەند خولەکێك ڕادیۆکەم هەڵکردەوە. ئەمجارەیان باسی نوێژی هەینی و وتاری ئەو ڕۆژەش لەسەر بزربوونی مەهدی ئاخر زەمان بوو. ئەو مەلایەش کە بە سەرهاتەکەی دەگێڕاوە، دەیگوت: «مەهدی بۆ گەڕانەوە ئامادەیە و تەنیا چاوەڕوانی فەرمانی خودایە، بەڵام ئیمپریالیست و سەهیونیست پێشیان پێگرتووە! ئەو دەیگوت کە شەوانە خەو نایباتەوە و گەلێك بێتاقەتی گەڕانەوەی مەهدییە، چونکە بە گەڕانەوەی ئەو تەواوی گەندەڵییەکان، نایەکسانییەکان، بەشمەینەتییەکان، کردەوە نامرۆڤییەکان لەنێو دەچن و ئارامی و ئۆقرەیی باڵ دەکێشێتە سەر هەموو وڵاتانی ئیسلامیی «. دیسان ڕادیۆکەم داخستەوە و کەوتمە بیری گەلاڵەی ئێواری

که چۆن و له کوێوه گەڕان به دوای شێرزاد دا دەست پێبکەم، چونکه شێرزادیش بۆ من مەهدییەك بوو که بزر ببوو، بەڵام به جیاوازییەکەوە. مەهدی بەستەزمان به منداڵی له کاتی کایەکردندا و له گوندی ئەودەم و شاری ئێستای سامەرای وڵاتی عێراق، کەوتبووە چاڵاوەوە و گیانی لەدەست دابوو. له حاڵێکدا شێرزاد له ترسی ئاشکرا بوونی نەخۆشییەك که به خۆی تەڵقین کردبوو، له تەمەنی ٢٦ ساڵاندا خۆی بزر کردبوو!؟ به هێندێك بیرکردنەوە و تاوتوێکردنی بارودۆخی ناوچەکە و بەرزی و نزمی شاخەکان، هاتمە سەر ئەو بڕوایە که له لوتکەی شاخی کەڵەخانییەوە که زاڵە به سەر دۆڵی گۆڵواندا، دەست پێ بکەم، پاش هێندێك دووربین تێگرتن، بەرەو ئەو شوێنە بەرزە وەڕێ کەوتم. به گەیشتنم به وێ و پاش حەسانەوەیەکی کورت و خواردنەوەی چەند قوم ئاو، دەستم کرد به دووربین تێگرتن و، بەردەوام بووم تاکو چاو له قەراوڵ چوو. به سەرنجدان بەوەی که نەمدەتوانی ئاگر هەڵکەم، بەرزترین لوتکەی کەڵەخانیم بۆ مانەوەی شەو هەڵبژارد، ئەگەر چی دەمزانی که ئەو شوێنە ساردترین جێگا بوو. کەلوپەلەکەم دانا و دەستم کرد به کۆکردنەوەی گژوگیا و گەڵای وەریو بۆ ئەوەی هەم وەك ڕاخەر بۆ نەرم بوونی ژێرم کەڵکی لێ وەرگرم و هەم بۆ گەرم ڕاگرتنی لەشم. تا ئەو کارانەم کرد، بوو به درەنگانێك و چاوم له کاتژمێر کرد لەسەر هەشتی ئێوارێ بوو. به پەلە ڕادیۆکەم دەرهێنا و هەڵم کرد. کورتەی هەواڵەکان بەمجۆرە دەستی پێکرد: «به ناوی خودای گەورە و دلۆڤان، ئەمڕۆش به بڕیاری دادگای شۆڕشی ئیسلامیی، بیست و چوار کەس، له شارەکانی کرماشان، ئیلام، کرندی ڕۆژئاوا، سەرپێڵی

زەهاو و قەسری شیرین، بە تاوانی دژی خودا و نێردراوی ئەو، موحەممەدولمستەفا درودی خودای لەسەر بێ، لە سێدارە دراون!

پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆ چەند فڕۆکەیەکی دوژمنی بەعسی، سنووری خاکی وڵاتی ئیسلامیی ئێرانیان بەزاندوو و لەلایەن ڕۆڵە لەخۆبووردووەکانی ئیسلامی خاوێنی موحەممەدییەوە لە ئاسمانی ئێرانی ئازیزمان ڕاونران. هەروەها چل و سێ کەسی دژە شۆڕشیش لە شارەکانی سنە، کامیاران و سەقز بە دەستی سەربازانی ون ناوی مەهدی و پارێزەرانی ئیسلام، نێردراونەتە دۆزەخ».

من کە هەر لە سەرەتاوە بێتاقەت بووم، بە بیستنی ئەو هەواڵانەش هێندەی دیکە کەوتمە پەژارەوە، نەمدەزانی بیر لە دامەزراندنی یەکسانی و سیستەمی دیکتاتۆری پرۆلتاریا بکەمەوە، یان لە دامەزرانی بیروباوەڕی نیوەدوورگەی عەرەبستانی و حەبەشەیی و گەڕانەوەی مێهدی؟! هەر چەند تێکۆشام پێوەندییەك لەنێوان ئەم دوو ئایدولۆژییە دەستنیشان بکەم، بۆم نەکرا، پاشان گەلێك پرسیار ڕوویان تێکردم و وەبیری ئەوە کەوتمەوە کە ئەدی دایکم چیم بۆ دەگێڕێتەوە و بەرەو چ دیارێکی نادیارم دەبا؟ ئەی شێرزاد و بێگەرد چی لێبکەم؟ بە تایبەتی کە ئەزموونێکی ئەوتۆیشم نەبوو و سەختی و دژواریی زەمانەشم نەچێشتبوو، تارادەیەکی زۆریش ورەم لەدەست دابوو. بەسەر ئەوەشەوە لە خۆمم دەپرسی، ئەی ئاخری گەورمالێن و مەشکەژەندن و مانگا دۆشینەکەمان چی لێدێت؟ بەڕاشکاوی بڵێم من بەرگەی ئەو هەموو تەوژمەم نەدەگرت، هەر چەند کات تێدەپەڕی، دەرەتانم لێ بەرتەسکتر دەبۆوە. بە دەم سەرماوە کورژیلەم کردبوو و ڕاست

وەك گلۆڵەی خوری دەستی هەلاجم لێهاتبوو. ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە ژیانی تایبەتی خۆم بوو. جار و بار خشەیەك دەهاتە گوێم و سەرێکم هەڵدێنا و چاوێکم لە دەوروبەری خۆم دەکرد. مانگە شەوێکی ڕووناك و ئاسمانێکی بێ هەور بوو. ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە و منیش بەدەم سەرماوە هەڵدەکۆزامەوە. بڕیارمدا چیدی ڕانەکشێم و دەستم کرد بە دووربین تێگرتن. مەبەستم لەو دووربین هاویشتنانە ئەوە بوو تا بەڵکو تروسکەی ئاگرم بەرچاو بکەوێ، چونکە لەبەر چڕوپڕی لێڕەوارەکانی ئەو بەندەنە دا، بە ڕۆژیش ئەستەم بوو دەوروبەری خۆت ببینی، چ بگا بە شەو. هەربۆیەش دەبا لوتکە و بەرزاییەکانم بۆ چاودێری و دووربین هاویشتن هەڵبژاردبا. بە دوای گەلێك دووربین گێڕاندا، جێگاکەم گۆڕی بۆ سەر لوتکەیەکی دیکە و لەوێ دامەزرام، مانگ بە لادا کەوتبوو و وریچە و درەوشانەوەی ئەستێرەکان ئاسمانێکی ڕۆمانتیکیان پێکهێنابوو. چارەکە سەعاتێك بە دووربین هاویشتنەوە خەریك بووم. بایەك هەڵیکردبوو و هەردەهات و ڕووی لە زیادبوون دەکرد و قاچی ڕاستیشم بە هۆی هەڵتروشکانەوە تەزیبوو. تەکانێکم بە خۆ دا کە هەستمە سەر پێ، بەڵام نەمتوانی. بۆیە ناچار بووم بە داگرتنی دەستم لەسەر عەرزەکە بۆ هەستانەوە کەڵك وەرگرم، کە لە ناکاو کزەیەك لە دەستمەوە هەستا. وامدانا دڕکی گەون یان شتێکی دیکەیە لە دەستم ڕۆچووە و زۆرم بایەخ پێنەدا. ئەو جار لە چەکەکەم وەك گالۆك کەڵکم وەرگرت و چەند هەنگاوێك لەو شوێنە دوورکەوتمەوە. دەستم مچوڕکی پێدا دەهات و بە دەم سەرماشەوە دەلەرزیم، هێندەی پێ نەچوو کە دەنگی بەربوونەوەی بەردێك

وەگوێم کەوت. هەرچەند تێکۆشام هیچم بەرچاو نەکەوت، بەڵام وامدانا کە ئەوە گیانلەبەرێك بووە کە بەردێك لە بن پێی بەربۆتەوە. لە گۆلبانگی شەفەق نیزیك دەبوومەوە و ئازاری دەستم هەرچی دەهات زیاتر دەبوو. ددانم بە خۆمدا دەگرت و چاوەڕوانی ڕووناکبوونەوەی هەوام دەکرد، بەڵام سەرم لەگێژەوە دەهات و دڵیشم خاییس دەبوو. لە کەم ئەزموونی و نەچێشتنی دژواری و سەخڵەتی سەر ڕێگای ژیاندا، قەتم بیر لەوە نەدەکردەوە کە لەوانەیە تووشی گرفتێك هاتبم، هێندەی پێ نەچوو کە هەوا ڕووناك بۆوە و دەنگی بەربوونەوەی بەردێکی دیکەم وەبەر گوێ کەوت، ئیتر گومانم نەمابوو کە گیانلەبەرێك لە دەوروبەرمدایە. لەوانەشە کەڵەکێوی یان بەراز بن، لە کۆتایی وەرزی پاییز دا کە خەڵکی کۆچەر کوێستانەکان، ئەو ناوچانە بە جێ دێڵن" گیانلەبەرەکانی وەك: کەڵەکێوی، بەراز، ورچ و... ترسیان نامێنێ و زیاتر خۆ دەردەخەن.

هەرچی کات تێدەپەڕی، منیش بێ هێزتر دەبووم و دەمیشم ببوو بە پەڵاس و مەلاقم وشك ببوو، بۆ دواین جار دووربینەکەم بە دەستە لەرزە نایە سەر چاوم. بە دوای کەمتر لە دوو خولەکدا، چاوم بە تروسکەی ئاگرێکی زۆر کز کەوت، کە لەوبەری دۆڵی گۆڵوانەوە دەتروسکایەوە. بە دیتنی ئەو ئاگرە، کەوتمە تاوتوێکردن و لێکدانەوە لەسەر تروسکەی ئاگرەکە. چەند بۆچوونێکم بۆ هاتن کە دەستم کرد بە هەڵسەنگاندنیان. بە لێکدانەوەی خۆم وام دانا کە یان جەردە و ڕێگرن، یان ڕاوچین، یان کوارکەربن و شارۆی مازوو، گزگل، بەڕوو، جاجکە، جەوی یان شتێکی لەو بابەتانە بکەن. هەرچی دەهات باری لەشم گرانتر دەبوو، بەڵام بڕیارمدا خۆ

ڕاگرم و دەوروبەری جێگای تروسکە ئاگرەکە بخەمە ژێر چاوەدێری، چونکە لە چەندین لاوە گرینگ بوو کە ئەو شوێنە لەژێر چاوەدێریم دا بێ، خۆ ئەگەر هاتبا و جەردە و ڕێگر بوونایە، ئەوە دەبا ئەو ناوچەیەم بە جێ هێشتبا کە کارەکەم بە نیوەچڵی دەمایەوە، ئەگەریش ئەو شوێنەم بە جێ نەهێشتبا، بێگومان بەبێ ئارەق لە دەستیان دەر نەدەچووم! ئەگەر ڕاوچی بان یان کوارکەر، ئەوە دەکرا دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەم، چونکە حاڵم باش نەبوو، خۆ ئەوە هاتبا و شێرزاد یان هەر لێ قەوماوێکی دیکە بووایا، ئیتر چ لەوە باشتر.

بە ڕووناکبوونەوەی هەوا، تەنیا بە دەستی چەپ دووربینەکەم لە سەرچاو دانا و بە وردی سەرنجم دایە دەوروبەری تروسکە ئاگرەکە، لە پڕ گیانلەبەرێکم چاو پێکەوت کە نیزیکەی سەد گەز لە خواری شوێنی ئاگرەکەوە بەرەوسەر هەڵدەکشا. لەبەر ئەوەی دەستم دەلەرزی، جوێکردنەوەی گیانلەبەرەکەم بۆ سانا نەبوو، بە یارمەتی وەرگرتن لە تەڵە دارێکی وشك وەك پاڵپشت بۆ ئەوەی دەستم نەلەرزێ، بە جوانی سەرنجم دایە گیانلەبەرەکە و پاش هێندێك وردبوونەوەی زیاتر، نەفەرێکم بینی کە شتێکی ڕەش و درێژی بە کۆڵەوەیە، پاش چەند خولەکێك دیسان درێژەم بە دووربین تێگرتن دا و ئەمجارەیان بە جوانی دیار بوو کە نەفەرەکە گەیشتۆتە ناو ئەشکەوتەکە و لە قەراخ تروسکەی ئاگرەکە دانیشتووە، بۆ ئەوەی دڵنیابم کە کەسێکی دیکەی لەگەڵ نییە، بەباشی دەوروبەریم خستە ژێر چاوەدێری. دەمێکی باش بەو کارەوە خەریك بووم تاکو بە تەواوی دڵنیا بووم کە تەنیا نەفەرێکە. ئەودەم کەوتمە بیری ڕێگا چارەیەك بۆ خۆم،

چونکە دەستم بە ڕادەیەکی بەرچاو پەنەمیبوو بوو و ئازاریشی ڕووی لە زیادبوون دەکرد. گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کە پێشتر لێی دانیشتبووم و لە کاتی دەستبەگەزدان دا کزەکە لە دەستم هەستابوو، پاش هێندێك چاوگێڕان، لە پڕ چاوم بە دووپشکێك کەوت کە شەو بە تاریکی پێم لە سەری دانابوو و بەشی سەرەوەی لەشی ترنجابوو، بەڵام قاچەکانی و کلکی دەجوڵاند، بەبێ ئەوەی بتوانێ پاش و پێش بکا، بە دیتنی لەشی ترنجاوی دووپشك، تێگەیشتم کە ئەو کزەی کە بە تاریکی شەو لە دەستم هەستابوو، ئەو دووپشکە بووە کە پێیەوە داوم، تازە کار لەوەش تێپەڕیبوو کە بیبەستم بۆ ئەوەی ژارەکەی نەچێتە نێو خوێن و بە لەشمدا بڵاو نەبێتەوە.

سەرم قورس ببوو ڕشانەوەشم دەهات، بە ناچار تەنیا ڕێگا چارەیەك کە پێم وابوو دەیتوانی یارمەتیدەرم بێ، خۆگەیاندن بەو کەسەی لای تروسکە ئاگر و ئەشکەوتەکە بوو. درەنگم لێ نەکرد و بەرەو ئەوێ وەڕێ کەوتم، لە ڕێگادا چەندین جار ڕشامەوە، تا ئەو ڕادەیە کە بە لادا دەهاتم، بڕست لە لاقەکانم بڕابوو و پێم خۆش بوو بەرەو خوار ببمەوە. ئەوە لە حاڵێکدابوو کە گەیشتبوومە جێگایەك کە دەبا بەرەو ژوور ڕۆیشتبام. لەو ماوەیەدا هەر چی ئاوم پێ بوو گشتم خواردبۆوە، بەڵام هەر جارە و پاش چەند خولەکێك دەڕشامەوە، بە هەر چەرمەسەری یەك بوو، بۆ نیوەڕۆ خۆم گەیاندە نیزیك شوێنی ئاگرەکە. سەرکەوتن بۆ ئەو جێگایە حاستەم بوو و هەوڵێکی زۆرم دا سەرکەوم، بەڵام نەمتوانی، چەند جارێك بە دەنگی بەرز هاوارم کرد:

ـ کاکی ڕاوچی، کاکی کوارکەر! لێم قەوماوە و پێویستیم بە یارمەتییە، بەڵام پاش چەندین جار هاوارکردن و پاڕانەوە، کەس بە هانامەوە نەهات، پاش هێندێك چاوەڕوانی، بە ناچاری و بە دەنگی بەرز هەڕەشەم کرد و گوتم:

ـ هویَ کابرا! سوێند بێ بە چوار قاپی داڵەهۆ، ئەگەر لەو ئەشکەوتە دەرنەکەوی، دەتدەمە بەر تەقەی قەناسە.

"چوارقاپی داڵەهۆ کە یارسانیەکان و بەشێك لە خەڵکی ناوچە سوێندی پێ دەخۆن،بە شاخەکانی داڵەهۆ، شاهۆ، بەمۆ و باخەکۆ دەگوترێ".

بە بیستنی هەڕەشەکان و لە ناکاودا نەفەرێك لە ئەشکەوت وەدەر کەوت و بە دەنگێکی پچڕپچڕ وەڵامی داوە:

ـ ها برام!، چیت لە منی چارەڕەش و دەربەدەر دەوێ. بۆچی وە بەر تەقەم دەدەی، ئەوە بەس نیە کەوتوومەتە بەر شەقی خودا؟ ئەم ئەشکەوتەشم پێ ڕەوا نابینن؟

بە بیستنی دەنگی کابرا، هاوارم کرد:

ـ کاکە گیان، کاتی ئەو قسانە نییە و من لێم قەوماوە و پێویستیم بە یارمەتییە.

زۆری پێنەچوو کە کابرا گەیشتە سەرسەرم، هەر کە چاوی پێمکەوت، دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ شوکرم بە هێز و توانات ئەی خودای بە ئاگا لە خشەی مارومور. خۆ ئەمە شوانەیە. بە گیانی ئەم شوانە وەکو چۆن دەزانم چیم بە سەر هاتووە،

ئاواش زانیومە کە ئەتۆش گیرۆدەی ئەم دەردە دەبیت. بۆ ئەوەش بزانی ڕاست دەکەم، وەسیەتم لە لای بێگەرد کردووە کە ئەتۆش وەکو من گیرۆدە دەبیت، من کە لە لایەکەوە هیچم بە خۆمەوە شك نەدەبرد و لە لایەکی دیکەشەوە هێزم تێدا نەبوو، پێمگوت:

ـ ئەوەندەم ئاگا لێتە کە شێرزادی، بەڵام چاوم ڕێشکە وپێشکە دەکا و جارێ یارمەتیم پێویستە تاکو سەرکەوینە ژوور بۆ نێو ئەشکەوتەکە. ئەوجار بە وردی بۆت دەگێڕمەوە چیم بەسەر هاتووە. شێرزاد هاتە ژێر باڵم و بردمییە سەرەوە، پاشان گەڕاوە دواوە و چەك و کەلوپەلەکەمی هێنایە سەرەوە. بە دانیشتنمان، داوای ئاوم کرد، چونکە گەلێکم تینوو بوو. دەست بە جێ ئاوی بۆ هێنام و گوتی:

ـ دەبێ دەست بە ئاوەوە بگرین، چونکە ئەو ئاوەی کە لەو کونەدایە هی لانیکەم چوار تا پێنج ڕۆژمانە.

من ئەوانە نازانم، ئێستا زۆرهیلاکم و دەبێ نەك هەر ئاو پێدان، بەڵکو سەرپەرشتیشم بکەی.

لە وەڵامدا گوتی:

ـ قوڕی دونیام بەسەر، ئەدی کێ سەرپەرشتی خۆم بکا؟

شێرزاد وای دەنواند کە قەت یەکترمان نەدیبێ. من ورگم بایکردبوو و وەك ڕەشکەی لێهاتبوو و بەتەواوی لە گلوپلی خستبووم. بە خواردنەوەی جامە ئاوەکە، چووبوومە نێو دونیایەکی دیکەوە و ئیتر نازانم قسەکانی شێرزاد چۆن کۆتاییان پێهات. کاتێك وەهۆش هاتمەوە، بەیانی ڕۆژی دوایی بوو. وامدەزانی کە لە ئاویان هەڵکیشابووم و جلەکانی بەرم هەموو تەڕ و

تلیس ببوون. دەستم گەلێك ئاوسابوو، بە جۆرێك کە نینۆکەکانی پەنجەکانم بە ئاستەم دیاربوون و چەند دانە لە دوگمەی کراسەکەی بەریشم بڕابوونەوە. کە چاوم گێڕا، شێرزادم لێ نەمابوو. ئەگەر چی کاتی خوتورە و خەیالکردن نەبوو، بەلاّم بە هەزاران بیرم بۆ دەهاتن و هاوکات زۆریشم تینوو بوو. بە زگە خشکە خۆمم لە کوندە و ئاوەکە نیزیك کردەوە، بە دەستی چەپ دەرکی کوندە ئاوەکەم گرت و بە ددان گرێیەکەم کردەوە و تێر ئاوم خواردەوە. لەبەر ئەوەی دەمی کوندەی ئاوەکەم بۆ نەدەبەسترا‌وە، نەگەڕامەوە سەر جێگاکەی خۆم و هەر لەو شوێنە دەمی کوندەکەم داشکاند و سەرم نایە بانی و نووستمەوە. ئەمجار کە هەستام، زەردەی خۆر بەسەر شاخەکانەوە دیار بوو. چاوێکم بە ژووری ئەشکەوتەکەدا گێڕا، دەبینم شێرزاد بە چەقۆکەی خەریکی دار تاشینە و هەر وەك هیچ ڕووی نەدابێ. هەرکە دیتی من دەجوولێم، بە جۆرێك لە دلنیاییەوە لێی پرسیم:

ـ زۆرت ماوە؟

من کە تاقەت و توانای لێدوانم نەبوو، پرسیم:

ـ لەچی و بۆچی زۆرم مابێ؟

ـ هەر ئەوەی کە لێتم پرسی!

من دیسان سەرم نایەوە و کەوتمە بیری پرسیارەکەی شێرزاد. مەبەستی لەوەی کە زۆرم ماوە چییە؟ لای خۆم دەمپرسی بۆ شێرزاد ئاوا بێبەزەیی بووە؟ هەر لەو بیرکردنەوانەدا بووم کە دیسان پرسیارەکەی دووپات کردەوە:

ـ له ڕووت نایه بڵێی چیت بەسەر هاتووە؟ مەترسە شوان، منیش وەك تۆم بە سەر هاتووە. جیاوازییەك کە هەیە ئەوەیە کە ئەتۆ مانگی خۆتە و منیش جارێ زۆرم ماوە!

ئەو پرسیارانەی شێرزاد بۆ من نائاسایی بوون، پێم گوت:

ـ کاکە گیان! من لەم پرسیارانەی تۆ سەر دەرناهێنم، دەتوانی باشتر تێم بگەیەنی؟

هێندێك ڕاما و گوتی:

ـ بێشك دەزانی مەبەستم چییە، بەڵام خۆتی لێ گێل دەکەی.

من چاوەڕوانی ئەو جۆرە هەڵوێستەم لە شێرزاد نەدەکرد و پێموابوو ئەو کە لە من بە تەمەنتر بوو، دەبووا ئەزموونی زیاتری هەبایە. لە داخی ئەو هەڵوێستانەی شێرزاد، ئازاری دووپشك پێوەدانم لە بیر چووبۆوە. وادیاربوو ئەو هەموو ئاو خواردنەوەی ڕۆژی یەکەم و ئەو هەموو ڕشانەوە یەك بە دوای یەکە دا، تا ڕادەیەك کاریگەریی کارتێکردنی ژاری دووپشکەکەی کەم کردبۆوە. لەو باس و خواسانەدا بووین، کە قسەکانی بێگەردم وەبیرهاتنەوە کە دەیگوت دەردی شێرزاد بێدەرمانە. هەر ئەو دەم پێموابوو کە ئەو تووشی نەخۆشی دەروونی هاتووە، بەڵام ئێستا کە شێرزادم بینی ئیتر گومانم نەمابوو کە ئەو گیرۆدەی نەخۆشی دەروونی بووە و پێیوایە کە منیش وەك ئەوم لێقەوماوە. هێندێك جووڵەم وەخۆ خست و پێم گوت:

ـ شێرزاد! دەزانی دووپشك پێیەوە داوم؟ بێجگە لەوەش من بە دوای تۆدا گەیشتوومەتە ئێرە، ئەو بە سەرسوڕمانەوە پاڵی دایە لامەوە و پرسی:

ـ دووپشك؟ ئەی باشە، ئەوە بۆ زیاتر لە مانگێك دەبێ کە من لێرەم و دووپشکیش بە دەورمدا نەهاتووە؟

ـ برام خۆ لێرە و لەم ئەشکەوتە پێیەوە نەداوم، بەرلەوەی بگەمە لای تۆ، تووشی ئەم کارەساتە هاتووم، پاشانیش تازە کار لەوە ترازابوو و خۆ ئەتۆش هیچت پێ نەدەکرا.

ئەو بە گورجی لێم هاتە جواب و گوتی:

ـ کێ دەڵێ هیچم پێ ناکرێ؟

دەست بەجێ هەستا و کۆڵەپشتییەکەی هێنایە پێش و پرێسکەیەکی هەڵپێچراوی دەرهێنا و پاش ئەوەی کردییەوە، شتەکەی ناوی کردە نێو جامیلکەیەکی ئاو، پاشان هێندەی بە چێوە تاشراوەکەی دەستی شێواند، تاکو بە تەواوی تێکەڵی ئاوەکە بوو. ئەوجار هێنایە بەر زارم و گوتی بیخۆرەوە، بەبێ ئەوەی بڵێ چ ژەقنەمووتێکە.

ـ جا من نازانم ئەمە چییە و چ قازانجێکی هەیە، ئەدی چۆنی بخۆمەوە؟

ـ ئەوە زراوی بەرازە و دژی ژاری مار و دووپشك و جاڵجاڵۆکە و هەموو جۆرە ژارێکی دیکەیە، دەیخۆیەوە باش، نایخۆیەوە بە زۆریش بێ دەیکەمە قورگتەوە!

چ ڕێگاچارەم لە بەردەم نەمابوو، بەتایبەتی لەوە دڵنیا ببووم کە ئەو تووشی نەخۆشی دەروونی هاتووە، بێجگە لەوەش من هێز و توانام لێ بڕابوو تاکو هەڵوێستێك بگرم، دەبا خواردبامەوە و ئەو کارەشم کرد، ئەوەندە تاڵ بوو کە لەگەڵ هیچ مادەیەکی ژاراویدا مەزەندە نەدەکرا. پاش خواردنەوەی هەستم دەکرد کە هەر لەنێو زار و قورگمەوە بگرە تاکو نێو زگم، بە تیغ لەت لەت

کراوە. هەرچەندەم کرد دەنگم دەرنەدەهات تاکو شتێکی پێبڵێم. تەنیا بە دەست ئیشارەتم پێدا کە ئاوم دەوێ، ئەوکات لە هەمان جامیلکەدا کە دەرمانەکەی تێدا گرتبۆوە، جۆرێکی دیکە ئاوی پێدام و خواردمەوە. ئەوەندە ئاگام لە خۆ بوو کە گوتی ئەو دەبێ بچێ ئاو بێنێ، لەبەر ئەوە کە من هەموو ئاوەکەم خواردبۆوە.

من ڕاکشام و شێرزاد پاڵتۆ چڵکن و دوکەڵاوییەکەی خۆی پێدادام و ڕۆیشت. چەندەی پێچووبێ نازانم، بەڵام کاتێك وەخەبەرهاتم، دیتم شێرزاد لە ئاوهێنان گەڕاوەتەوە و پارچەیەکی تەڕکردووە و خستویەتییە سەر دەم و چاوم. پاش ماوەیەك هەستم کرد تاڕادەیەك باش بووم و سوپاسم کرد بۆ یارمەتییەکانی.

ـ ئیشتیای خواردنت هەیە شوان، دەتوانی شتێك بخۆی؟

ـ جارێ نا، بەڵام پاش ماوەیەکی دیکە لەوانەیە بتوانم.

لە ڕاستیدا ئاوسانی دەستم بە ڕادەیەکی بەرچاو کەمی کردبوو. بای زگیشم تاڕادەیەکی زۆر دامردبوو، بەڵام ئاکار و چاولێکردنی شێرزادم لێ بە نامۆ و سەیر دەهاتە بەرچاو، ئەو زیاتر چاوی بڕیبووە زگم و جاروباریش دەستێکی بە زگی خۆیدا دەهێنا.

خۆر کەوانێك ڕاست ببۆوە. بەتێپەڕینی کات چاك و چاکتر دەبوومەوە. هێندەی پێنەچوو کە هەستم بە برسییەتی کرد. شێرزاد کۆڵە پشتییەکەمی هێنا پێشەوە کە هێندێك گوێز، دۆین، خورما، بژی و کولێرەی تێدا مابوو، لە هەرکامە هێندێکی دەرهێنا و پێکەوە دەستمان

بە خواردن کرد. من ئیتر وەك پێشوو هەستم بە ئێش و ئازار نەدەکرد. ئەوەی کە دیاربوو ئاوسانی دەستم بوو لەگەڵ بای زگم.

ـ شوانە! دەزانی ئەمشەو کە چووم بۆ ئاوهێنان، گەلێك بوێر بووم؟

ـ هۆی چی بوو؟ مەگەر جاران زۆر دەترسای؟

ـ ئەمجارەیان قەناسەکەی تۆم لەگەڵ خۆم بردبوو.

شێرزاد نەیتوانی بیشارێتەوە کە بە بوونی من لەوێ، هەست بە جۆرێك متمانە دەکا، ئەو درێژەیدا و گوتی:

ـ ئەگەر ئەم چەکەی پێبایە تا ئێستا بە دەیان کەڵی نێچیر کردبوو.

ـ باشتر کە چەکت پێ نەبووە. مەگەر نازانی کە ئەم ژینگەیە هی خۆمانە و هەر بۆ خۆمانین کە دەبێ بیپارێزین؟

ورگی شێرزاد لە ڕادە بە دەر زل ببوو. وەخت و بێ وەخت لە بەر زگئێشە دەینالاند و زگی بە کراسێکی شۆڕ داپۆشیبوو. هەر باسی زگئێشەی خۆی بۆ دەکردم. منیش پێشنیارم پێکرد کە بەڕوو بە کاڵی بخوات، چونکە بیستبووم کە بەڕوو بۆ ئەو کەسانەی کە گرفتی گەدەیان هەیە باشە، هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو تاکو پرسیاری هۆی بزربوونی خۆی لێبکەم. ئەو ڕۆژەمان بردە سەر و شەویش زۆرباشی بۆ نووستین. بەیانی کە لە خەو هەستاین، قاوەڵتیمان پێکەوە خوارد. هەستم پێدەکرد کە شێرزاد دەیەوێ پرسیارێکم لێبکا، بەڵام گومانی هەبوو کە وەڵامێك وەر بگرێ، چونکە لە یەکەمین چاوپێکەوتنی لەگەڵ مندا، پێی وابوو کە منیش وەك ئەوم لێ قەوماوە. ئەوکات ورگم تا ڕادەیەکی ئەوتۆ بای کردبوو، کە سێ دانە لە دوگمەی کراسەکەی بەرم هەڵپچڕابوون. ڕەنگە

لای ئەو جێی پرسیار بووبێ کە چۆن لەو ماوە کورتەدا ئەو ورگە قەڵەوەی من بە جارێك دامردۆتەوە.

- دیتت چۆن ڕزگارت بوو، زراوی بەرازە ها! خۆ گاڵتەی پێ ناکرێ، زانیوتە کە پێشینیان زۆر لێهاتوو بوونە؟ ڕووحیان شاد بێ ئەوانەی ئەم ئەزموونە چاکانەیان بۆ ئێمە بەجێهێشتووە.

ئەو درێژەی دا و گوتی:

- بریا دەرمانی زۆر دەردی دیکەش دەدۆزرایەوە.

من کە خوازیاری درێژەدان بە باسەکە بووم، گوتم:

- بێگومان ڕۆژێك دادێ کە زانست دەتوانێ دەرمانی گشت دەردەکان بدۆزێتەوە، بەڵام ئەوە هەم کاتی دەوێ و هەم کەرەستە.

بە دوای قسەکانی من دا، شێرزاد بە جارێك بەسەرمدا ڕووخا و گوتی:

- نامەوێ جارێکی دیکە گوێم لەو جۆرە وشانە بێ، زانست کامەیە، زانستی چی؟ ئیتر بەسە و چی دی بە وشە و دروشمی هیچ و پوچەوە خۆت دەسخەڕۆ مەکە. ئەگەر دەتەوێ ئاسودە بم، داوات لێ دەکەم واز لە زانست و مانست و ئەم جۆرە باسانە بێنە.

من کە دەمزانی ئەو لە درێژەدان بەو باسە بێزارە، پێم گوت:

- برام ئەی ئەوە نییە تۆ بۆ خۆت باسی ئەزموونی پێشینیان دەکەی، ئەی ئەوە زانست نییە کە من بەو زراوە بەرازەی کە تۆ پێت دام، لە مەرگ ڕزگارم بوو؟ ئیتر خۆ زانست شاخ و گوێی نییە، پێم نالێی ئەو هەڵچوونەت لە بەر چییە؟

شێرزاد سەری داخست و هەناسەیەکی بە خەستی هەڵکێشا، کە نیشانەی لە ڕادە بە دەری بێ هیوایی بە ژیان بوو. زانیم کە وێنە هێنانەوەکە بە خەستی کاریگەری تێکردووە، بەڵام درێژەم نەدا و باسەکەم گۆڕی. پرسیم:

ـ تا کەنگێ دەتەوێ لێرە و بەم حاڵەوە بمێنیتەوە؟

ئەو هێندێك ڕاما و گوتی:

ـ ئەوەی ڕاستیبێ نازانم، لەپێشدا پێموابوو کە ئەتۆش بەو دەردی من گیرۆدە بووی و دەمویست هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام ئێستا تێگەیشتووم کە دەردی من گەلێك جیاوازی هەیە لەگەڵ دەردی خەڵکانی دیکە!

بێ هیوایی شێرزادم لێ سەیر نەبوو، هەر بۆیە پێم گوت:

ـ کاکی خۆم، من هام لەو باوەڕەدا کە چۆن ئەتۆ یارمەتیت دام و لە مەرگت ڕزگار کردم، منیش هەر بەو شێوەیە دەتوانم یارمەتیت بدەم. دڵنیاشبە تاکو من زیندووم نهێنییەکانت نادرکێنم و بۆ یارمەتی کردنیشت ئەوەی لە دەستم بێ درێخی ناکەم، بێجگە لەوانەش من بە ئاگاداری دایکم و بێگەردی هاوسەرت ئەم ڕێگایەم وەپێش خۆم داوە، کە وابێ ئەگەر شتێك هەبێ و لێمی بشارییەوە، ئەوە بە زیانی خۆت تەواو دەبێ.

شێرزاد ڕووی تێکردم و گوتی:

ـ بۆ خۆت دەزانی کە من ئەرخەوا شك نابەم و کەسم نییە بێجگە لە بێگەرد. ئەوەی وەك کەس هەمبوو ئێوە بوون. ئەوەتا ئێوەش پاخەوایەك

قوڕتان بۆ گرتوومەتەوە. نکتان ناهۆمێد کردم و هەناسە ساردو ڕەنجبیێوەریش بووم. نە زەوی قوتم دەدا و نە ئاسمان هەڵمدەکێشێ، لە بەیانی تاکو ئێوارە کارم بۆتە ڕۆژ و شەو بژاردن. سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتیانە نازانم چلۆن و بە چ شێوەیەك ئەم دەردەم لە کۆڵ دەبێتەوە!؟

بۆ ئەوەی باسەکە دەست پێبکا گوتی:

- با بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.

- باشە، بەڵام با زۆر دوور و درێژ نەبێ.

دوو ساڵ پێش ئێستا لەگەڵ دوو کەس لە هاوەڵەکانم ڕێگامان کەوتە شاری ئیسفەهان. ئێوارێی ڕۆژی پێنجشەموو بوو ژوورێکمان لە هۆتیل ئیسفەهان بەکرێ گرت، شەو گوێمان لە هاتوهاواری خەڵك بوو، بەڵام نەمانزانی چ باسە. بۆ بەیانی کە ڕۆژی هەینییە و دەبێ بازاڕ و شەقامەکانی شار پڕ بوونایە لە خەڵك، بەڵام ئەوکات بە پێچەوانە بوو. ئێمەش جلی جوانمان لەبەر کردبوو، کە بەڵکو پیاسەیەکی خۆش بکەین و هیندێکیش چاو بگێڕین. دیارە بیستبوومان کە ئیسفەهان شوێنێکی گەشتیاری جوانە و کچی جوانیشیان زۆرە. سەرت نەیەشێنم شوان، لە هۆتێل وەدەرکەوتین و هێشتا سەد گەزێك لەوێ دوور نەکەوتبووینەوە کە گەیشتینە دەرکی نانەواییەك. لە دەرکی نانەواییەکە دووکەس خەریکی قوڕگرتنەوە بوون. من کە هەم باڵام بەرز بوو و هەمیش لە هاوڕێیەکانی دیکەم قۆزتر بووم، لەپێش ئەوانەوە دەڕۆیشتم. هێشتا دوو هەنگاوم مابوو کە بگەمە لای قوڕ شێلەکان، لەپڕ یەك لەم لاو یەك لەولاوە دوو پاخەوا قوڕیان گرتە شانەکانم و چنگە قوڕێکیشیان مالیی بەسەرم دا! بۆ

دەربڕینی ناڕەزایەتیم لەو کارەی ئەوان، ڕووم تێکردن و گوتم: شوورەیی ناکەن ئاوا ڕۆژی هەینیمان لێ تێك دەدەن و بەم شێوەیە قوڕاویمان دەکەن؟ بە گیانی شوان ئەوەندەمان لێ خۆشبوو کە یەکیان هاواری کرد، هەی کافر، هەی کافر. لە چاوترووکاندنێکدا سەدان کەس ڕژانە سەرمان و کۆتەلکۆیان کردین!

- ئاخر لەبەرچی، ئاوا بەبێ سووچ و تاوان خوریشۆر کراین؟

- ڕاستی ئەوەیە ئەو کاتە دەرفەتی ئەوەمان نەبوو کە پرسی هۆکار بکەین. ئەوەی لە بیرم بێ جلی ساغمان لەبەر نەمابوو. سەری شکاو، ددانی شکاو، پەراسووی شکاو، هەر باسی مەکە، بەڵام پاش ئەوەی توانیمان خۆ کۆکەینەوە بە لارە لارە و خوار و خێچی گەڕاینەوە بۆ هۆتێلەکە، کاتێك خاوەنی هۆتێل بەو حاڵەوە چاوی پێمان کەوت، هاتە پێش و پرسی: ئێوە خەڵکی کوێن؟ منیش لە وەڵام دا گوتم، خەڵکی دەوروبەری کرماشانین و کوردین. دیسان پرسی،

کوردن یان موسوڵمان؟

- کوردین، بەڵام یەکمان موسوڵمانی سونەیە و یەکمان یارسانییە و ئەوی دیکەشمان شیعەیە.

ئەی قوڕتان بەسەر، ئێوە چ جۆرە مرۆڤێکن، لە کوێ گەورە بوون کە هێشتا نازانن ئەمڕۆ (موحەڕەمە) و ئێوە ئاوا بە لەبەرکردنی جلوبەرگی جوان سووکایەتی بە موقەدەساتی ئێمە دەکەن، ئەی ئەمرتان درێژ نەبێ، دەبا بە تەواوی لە نێویان بردبان و لە قوڕدا خەفەیان کردبان. وەرن دەی، جلوجەوارتان کۆکەنەوە و لێرە وەدەرکەون. کافرینەی بێ ئەوەڵ و ئاخری بێ

بیروباوڕ و هەرزە. شوانە، بە هەر جۆرێك بوو ماشێنێكی سواریمان بە كرێ گرت و كرماشان بگرە هاتین. چاوت ڕۆژی خەراپ نەبینێ، یەك حەوتووی تەواو نیمەنمەكیان لە لەشی گرتین تاكو هێندێك هاتینەوە سەرەخۆ. بەڵێ، كاكە شوانی دامەزرێنەری یەكسانی و پرۆلێتاریای كرێكاری، ئەوەیە كۆمەڵگایەك كە پرۆلێتاریاكەی قوڕی ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا دەشێلێ!

من كە بە تەواوی چووبوومە ناخی دەردەدڵەكانی شێرزادەوە، گوتم:

- ئەوە ڕاستییەكی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام لەنێو پرۆلێتاریا دا (لۆمپەنیش) هەیە كە جیاوازن لە دەستەی پرۆلێتاریای راستەقینە.

پاشان پرسیم:

- ئەی ئەم دەردەی ئێستا چییە كە دەبێ لە كۆڵت بیێتەوە؟

- برام، من بە كوردی پەتیی لەگەڵت دەدوێم، نەكا لێم تێنەگەی؟ مەگەر ئەتۆ بە چاوی خۆت نابینی كە چەندە زگم بەرز بۆتەوە؟ خۆ من نێرە و بیدۆشەم پێ نەوتووی، بە قەولی كوردی خۆمان دەڵێ: «مانگ بە چاو دیارە و بە قامك ئاماژەی پێ دەكەن»، ڕاست و ڕەوان و بەبێ دوودڵی، دەردی من لە دەرمان نەهاتووە.

لە كاتی لێدوانی شێرزاد دا، من زیاتر بیرم لە ئاوسانی دوو ڕۆژ پێشتری زگی خۆم دەكردەوە كە شێرزاد زۆر سەرنجی دەدایە و واشی بیر دەكردەوە كە دەردی هەردووكمان یەكە.

ئەو بە جۆرێك لە تووڕە بوون، لە پڕێك كراسەكەی هەڵكرد و سەرەڕای ئەوەی كە زگی پێ نیشاندام، گوتی:

ـ ئێستاش باوەڕت نایە کە ئەمە ئاکامی ئەو زانستەیە کە ئەتۆ باسی لێوە دەکەی و بڕواشت پێیەتی؟

زۆر هێمنانە و لەسەرەخۆ پرسیم:

ـ کامە زانست؟ ئەگەر بڕیار وابێ هەرکەس هەرچییەکی بە سەر بێت و گوناهی بخاتە سەر زانست، خۆ ئیتر زانست مانای نامێنێ. پاشانیش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆر کەس پەیدا دەبن کە دەم لە زانست دەدەن، بەبێ ئەوەی بوارەکانی جۆراوجۆری زانست لێك بدەنەوە.

ئەو دوگمەی کراسەکەی داخستنەوە و لێی پرسیم:

ـ بڕوات بە زانستی پزیشکیی هەیە؟

ـ بۆ نە، مەگەر چی ڕووی داوە تاکو لەو پێوەندییەدا بێ بڕوا بم؟

شێرزاد گوتی:

ـ ڕەنگە بۆت بگێڕمەوە بڕوام پێنەکەی، بەڵام بۆت دەگێڕمەوە تاکو جارێکی دیکە تووشی هەڵە نەبی و باس لە زانست و مانست ئەو جۆرە تووڕەهاتە نەکەی!

ـ باشە، برام گوێڕایەڵت دەبم، بەڵام هەر شتێك کە پسپۆڕی بوارێك بڵێ ناکرێ لەسەر زانست ساغ بکرێتەوە، چونکە ڕەنگە ڕاوبۆچوونی دوکتۆرێك سەبارەت بە پێزانین بە نەخۆشییەك یان دەرمان و چارەسەری نەخۆشێك، هیچ پێوەندیی بە زانستەوە نەبێت و تەنیا ڕاوبۆچوونی خۆی بێ.

شێرزاد لەوپەڕی تووڕەییدا بەجۆرە دەستیپێکرد:

ـ کاکە شوان! لەو کاتەوە کە هاوڕییەتی ئێوەم هەڵبژارد، هەر لە سەرەتاوە تووشی زگنێشەیەکی خراپ هاتم. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باری

تەندروستیم بەرەو خراپ و خراپتر دەچوو. ئەگەر لە بیرت مابێ، دوو مانگ لەمەوبەر کە لە سەفەرەکەی کرماشان هاتینەوە، من بە تەواوی ژیانم لێ تاڵ ببوو. لێت ناشارمەوە ئێمە، واتە من و بێگەرد چەن جاران سەردانی دوکتۆرمان لە شارەکانی سەرپیلێ و قەسری شیرین کرد، کە بێ ئاکام بوو. تاکو لە ناوەڕاستی مانگی ڕابردوودا، لەگەڵ بێگەرد سەردانی کرماشانمان کرد. یەکێك لە دۆستە باشەکانم دوکتۆرێکی چاکی پێناساندین. ئێمەش بە تاکسی خۆمان گەیاندە مەتەبی کاکی دوکتۆر کە خەڵکێکی زۆری لێ کۆ ببوونەوە. هەر کەسە و بە جۆرێك بیروڕای خۆیان لەسەر کاکی دوکتۆر دەردەبڕی. یەك دەیگوت لە ئەمریکای خوێندووە و پسپۆڕی دەروونناسیشە. ئەوەی دی دەیگوت خوێندنی باڵای لە فەرانسە تەواو کردووە. یەکی دیکە دەیگوت دەڵێن لە شەڕی جیهانیی دووەمدا لە بەرەکانی شەڕی نۆرماندی دا بەشدار بووە و سەربازی مردووی زیندوو کردۆتەوە! سەرت نەیەشێنم، ئێمە گەلێك لە چاوەڕوانیدا ماینەوە. ئێش و ئازاری زگم بە تەواوی بێتاقەتی کردبووم و لە گیانی خۆم وەڕەز ببووم. نەمدەتوانی ئۆقرە بگرم و بە نێو هۆڵەکەدا هەر لە هاتووچۆدا بووم. ئەو خەڵکە کە لە ژووری چاوەڕوانی دوکتۆر دا دانیشتبوون، کە دەیانبینی زۆر بێتاقەتم، بانگیان کردە پێشخزمەتی کاکی دوکتۆر و منیان پێناساند. کاکی پێشخزمەت چەند پرسیارێکی لێکردم . گورج ڕایگەیاند خەڵکینە ئەم نەخۆشە حاڵی خراپە و ڕیخۆڵە کوێرەی تووشی گرفت هاتووە، هەر بەم بۆنەوە داوا لەو کەسانەتان دەکەم کە لە نۆرەی پێشەوەدان، یارمەتی ئەم لێقەوماوە بکەن.

لەو نێوەدا کلاوشەبقە لەسەرێك هاتە لامەوە و پرسیاری کرد:

ـ ئەریّ کاکە گیان! دەتوانم پرسیارێکت لیّ بکەم؟

سەرەڕای ئەوەی بە دەم ئازارەوە دەتلامەوە، گوتم فەرموو دوو پرسیاریشم لیّبکە.

- بەر لەوەی بچیتە نێو جیّ بنووی چ دەکەی؟».

«بڕوات هەبیّ کە شتێکی تایبەتیم نییە و هەرکە خەوم هات، دەچم دەنووم»، پاشان گوتی: «ئەگەر بتەویّ لە خێری دونیای بەربلاّوی بەهەشت بێبەش نەبی، دەبیّ بەر لە نووستنت دوعای کومەیل بخوێنی»!

بۆ خۆت دەزانی شوان کە خۆهەڵقوتاندن لە ژیانی تایبەتی خەڵك بۆتە ئاکاری ڕۆژانەی کۆمەڵگای ئێمە. بەبیّ ئەوەی دژکردەوەیەك نیشان بدەم یان لێی توورەبم، پێم گوت: «خودای تۆ، جاریّ بەو هەموو دڵفراوانی و لە خۆبووردووییەوە کە هەیەتی، ڕۆژگاری لیّ تاڵ کردووم و ڕەنگە بەمزوانە گیانیشم لیّ بستێنیّ». سەرت نەیەشێنم ئێمە لە قسەکردندا بووین کە دوکتۆر بانگی کردمە ژووری خۆی و بێگەردیش لەگەڵم هاتە ژوورەوە. ئەو کۆمەڵێك پرسیاری لێکردم و منیش وەڵامم دەداوە، پاشان پێیگوتم کە دەبیّ تاقیکردنەوەی گمێزم لیّ بکا. ئاودەستەکەی پێشان دام و قوتولکەیەکی پلاستیکیشی دا بە دەستمەوە و منیش داوام لە بێگەرد کرد کە یارمەتیم بدا.

ئێمە پێکەوە چووینە ئاودەستخانەکە. بێگەرد دەفرەکەی بۆ گرتم و نیوەم کرد لە گمێز بۆ تاقیکاری و لە سوچێکەوە داینا. من بەندوخینەکەم بەست و هاتمە دەرەوە، بەڵام بێگەردیش پێویستی بە دەستبەئاو گەیاندن

بوو، پاش ماوەیەك بێگەرد هاتە دەر و دوکتۆر پێی گوتین کە چاوەڕوان بین تاکو بۆ وەڵامی تاقیکردنەوە بانگمان دەکاتەوە ژووری.

شێرزاد هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. ئینجا درێژەی بە باسەکەی دایەوە:

ـ بەڵێ، کاك شوان! پاش تێپەڕبوونی دەمێکی درێژ، کاکی دوکتۆر بانگی کردمەوە. چاوەکانمی یەك یەك داچەقاند و تێیانی ڕوانی، پاشان گوتی پانتۆڵەکەت داکەنە و لەسەر ئەو قەرەوێڵە پاڵکەوە. ئەو دەستەوانەیەکی پلاستیکی کردنە دەستی و پاشان قامکە ناوەڕاستینەکەی، ئەوەی کە لە هەموویان درێژترە، هەتا بن کردە کۆمەوە و هێندێك هەڵی سوڕاند. شوانە! بەسەرت، ڕێك لەو کاتەدا ئەو نوکتە کوردییەم وەبیر هاتەوە، کە دەڵێ: «سەگ قاچی دەشکێ، بەڵام کلکی دەبەستن». بە گیانی شوان هەر ئەوکات شکم هەڵگرت، واتە بەرلەوەی ئەو هیچ جوابێکم پێبداتەوە، هەستم کرد کە لێمقەوماوە. ئەو دەستەوانەکانی فڕێدان و دەستەکانی بە دەرمانێك شوتن و پاشان لێم نیزیك بووەوە و گوتی:

ـ کاکە گیان! دەزانم هەواڵێکی ناخۆشە، بەڵام وەك ئەرکی سەرشانم دەبێ پێت بڵێم کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە پیشان دەدا بە داخەوە ئەتۆ دووگیانی!

دووگیان، دووگیانی چی! بە بیستنی ئەم هەواڵە ڕەنگێکم هات و ڕەنگێکم چوو. وامدەزانی گورزێك بە قورسایی شاخی بێستون بە سەرمدا درا. تف لە زارمدا وشك بوو و بە جارێك سەدان پرسیار ڕوویان تێکردم.

هەردووك پێم لە زەوی بڕان و نە بەرەو پێش دەمتوانی بڕۆم، نە بەرەو دواوەش. قورساییەکم بە قەد شاخی مانشت بە سەر شان و پیلمەوە هەست پێدەکرد. نەمتوانی تەنانەت پرسیارێکیش ئاراستەی کاکی دوکتۆر بکەم، لە داخاندا نەمدەزانی ڕوو لە چ لایەك کەم. خەریك بوو لە ژووری دوکتۆر وەدەرکەوم، کە بانگی کردمە دواوە و بەڵگەی تاقیکردنەوەکەی دا بەدەستمەوە. ئەوەندە ئاگام لە خۆ بوو کە بە تاکسی گەیشتینە سابونی و لەوێشەوە سەرکەوتینە نێو مینیبوسێك کە بەرەو سەرپێڵی زەهاو دەچوو. بە گیانی ئەم شوانە نازانم بە زەویدا گەیشتبووینە ماڵ یان بە ئاسماندا. من بوورابوومەوە و ئاگام لە هیچ شتێکیش نەبوو. کە گەیشتینە ماڵ، لەشم سارد و جلەکانی بەرم دەتگوت لە ئاویان هەڵکێشابوون. هێز لە ئەژنۆمدا نەبوو و بە تەواوی بە چۆکدا هاتبووم. لە سوچێکی ماڵەوە دانیشتبووم و نەمدەوێرا بچووکترین وشە بە بێگەرد بڵێم. ئەویش لە سووچی ئەو لای ژوورەکە دەستەوئەژنۆ کورژیلەی کردبوو و جاروباریش هەناسەیەکی ئەوتۆ قووڵی هەڵدەکێشا، کە سەرەڕای وەزعی ناڵەباری خۆم زگم بەو دەسووتا. هەر چەند تێکۆشام بەڵکو هۆکارێك بۆ ئەم پێشهاتە بدۆزمەوە، بەڵام بیرم بۆ لای چ ئاڵوگۆڕ یان چارەسەرێکی کوتوپڕ و گونجاو نەدەچوو. هێندە خۆمم بێدەسەڵات دەهاتە بەر چاو، کە بێزم لە ژیان هەستا بوو. چەند جارێك گەیشتمە سەر ئەو بڕوایە کە بە جۆرێك گیان لە خۆم بستێنم، بەڵام پاشان بەزەییم بە منداڵەکەی زگم دا دەهات! بە گیانی ئەو کاك شوانە بۆ چەندین جار لە خۆمم دەپرسی ئەی ئەوە هاتوو من

گوناحبار بم، ئیدی ئەم مندالّە بێ زمانە چ گوناحێکی کردووە، تا بەر لەوەی بێتە دونیا گیانی لێ بسێندرێ؟

ئیتر بەمجۆرە چەند ڕۆژێکم بردە سەر، تاکو ڕۆژێکیان بانگی بێگەردم کرد و دوو بە دوو دانیشتین و پێم گوت:

ـ بێگەرد! بۆ خۆت دەزانی و گوێت لە قسەکانی دوکتۆر بوو کە چی پێگوتین و چاکیش دەزانی کە چیم بە سەر هاتووە، بەلاّم چونکە خۆکوشتنم پێ نەنگە، لە بیری ئەو کارەدا نیم.

ـ منیش خۆکوشتنم پێ کردەوەیەکی دزێوە و نابێ بیریش لەم کارە بکەیەوە.

ئینجا لێی پرسیم:

ـ دەتەوێ چی بکەی و چۆنت لەم دەردە ڕزگار دەبێ؟

بۆ ئەوەی بێ وەلاّمم نەهێشتبێتەوە، گوتم:

ـ بڕیارمداوە بڕۆمە جێگایەك بە دوور لە چاوی خەڵك و تاکو ئەو کاتەی هێزم تێدا مابێ، بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم دیاردە نامۆیە دەکەم.

«شوانە! خۆ هەستم بەوە دەکرد کە ئەو ئەرکە بە قسە هاسانە و بە کردەوە زۆر دژوار، بەلاّم ئەوەی ڕاستی بێ لە مەرگ نەدەترسام. بە پێچەوانەوە لەوە هەراسان بووم کە خەڵك پێم بزانن. بۆ خۆت دەزانی کە لە ولاّتی ئێمە لیتکە و پیتکە بە خەڵکدا لکاندن گەلێك سانایە و گەر بێت و خەڵك بەو بەسەرهاتەی من بزانن، هەتا هەتایە مندالّی مندالّەکانیشمان ڕوویان نایەتەوە لەنێو خەڵکدا سەر هەڵبێنن. کورت و

کرمانجی، خەڵکی بەوە بزانن کە من وام بەسەر هاتووە، وەك پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچاوانمەوە دەمێنێتەوە و وەخت و بێوەخت بە ڕوومدا دەدرێتەوە)).

من کە بەباشی گوێم بۆ لێدوانەکانی شێرزاد شل کردبوو، دەستبەجێ وەبیری پرسیارەکانی ڕۆژەکانی پێشتری شێرزاد کەوتمەوە کە بە دیتنی ئەو ورگە هەڵمساوەی من کە هۆی پێوەدانی دووپشکەکە بوو و لێی دەپرسیم چەندەت ماوە، ئەوە ئێستا تێگەیشتم کە شێرزاد پێی وابووە کە منیش دووگیانم!

بەر لە هەموو شتێك سوپاسم کرد کە ئەم ڕووداوە گرینگەی ئاوا بە تاقەتەوە بۆ گێڕامەوە، پاشان لێمپرسی:

ـ بیرو بۆچۆنت لەسەر ئەم ڕووداوە چییە و هۆکاری ئەوەی کە تووشی دووگیانبوون هاتووی، بۆ چ دەگێڕیتەوە؟

شێرزاد شانێکی هەڵتەکاند و گوتی:

ـ باشتر وایە کە بۆ خۆت بە دوای وەڵامی پرسیارەکەتدا بگەڕێی.

ـ جا ئەم بەسەرهاتە چ پێوەندییەکی بە بیرکردنەوەی منەوە هەیە؟

ـ شوانە! بۆ خۆت چاك دەزانی کە پێوەندیی بە تۆوە هەیە. ئەگەر تۆ نەبووایەی چما سەگی هار گرتبوومی کە بە دوای سۆسیالیزم، کۆمۆنیزم، مارکسیزم، لێنینیزم دا بچم و خۆم لە خوداش دابڕم؟

ـ باشە، باش شێرزاد، مەبەستت لە تێکەڵکردنی ئەم وشانە لەگەڵ ئەم گرفتە چییە؟

بە دەنگێکی تاڕادەیەك تووڕەوە وەڵامی دامەوە:

- با پێت بڵێم شوان، پێوەندی هەیە و ئەولاتریش. ئەگەر من لە ئایین وەرنەگەڕابام و نەکەوتبامە دوای ئێوە، بێ شك ئێستا لە بارودۆخێکی دیکەدا دەژیام.

بە سەرسوڕمانەوە لەو هەڵوێست دەربڕینەی شێرزاد، پرسیم:

- جا ئەگەر وابووایە خۆ ئێستا نیوەی پیاوەکانی دونیا دەبا دووگیان بووایەن، چونکە لانیکەم هەر لەم وڵاتە کە خۆمانی تێدا دەژین، بەلانی کەمەوە دوو سێ ملیۆن کەس باوەڕی بە هیچ ئایینێك نییە.

شێرزاد سەرنجی نەدایە ئەم ڕادەربڕینەی من و ڕووی تێکردم و گوتی:

- ئەرێ هەر بە ڕاستی، ئەو دایکە قوربەسەرانەی ئێمە چۆن بەرگەی ئەم هەموو ئێش و ئازارەی کاتی زگپڕبوونیان گرتووە؟

- جارێ لەوەیان گەڕێ، تاکو ئێستا بیستووتە یان دیتووتە کە کەسێکی دیکە لە جنسی نێرینە، دووگیان بووبێ؟

- نەمدیتووە، بەڵام بیستوومە کە کەسێکی خەڵکی شاری شائاوای ڕۆژئاوا (هارونئاوا) کە گوایە پلەی ئوستواری لە ئەرتەشی شادا هەبووە، دووگیان کەوتووە و هۆیەکەشی ئەوە بووە کە لە شازادە موحەممەد، سوێندی بە درۆی خواردووە!

ئەو دەیەویست درێژە بە لێدوانەکەی بدا، بەڵام لە پڕ لەرزێك بە لەشیدا هات، ڕەنگی بە جۆرێك سپی هەڵگەڕا، دەتگوت بە کفن داپۆشراوە.

شێرزاد بورایەوە. منیش بە بیستنی ئەم بەسەرهاتەی شێرزاد، دووپشك پێوەدانی خۆمم لە بیر چووبۆوە و بارودۆخی لەشساغی خۆیشم وانەبوو

تاكو بتوانم پشتی بشێلم، پاش ماوەیەك وەهۆش هاتەوە و پاش خواردنەوەی جامیلكەیەك ئاو، كە من پێمدا، گوتی:

ـ دیتت شوانە! ئەوە منداڵەكە بوو كە جووڵاوە. بە مەرگت چوومە لێواری گۆڕ و گەڕامەوە!

گێڕانەوەی شێرزاد، لەسەر بەسەرهاتی خۆی درێژەی كێشا و شەوگار درەنگ ببوو، بۆیە پێشنیارم پێكرد كە ئێستا ماندووین و باشترە بەیانی درێژە بە لێدوانەكەمان بدەین.

كۆڵە پشتییەكەم كێشایە ژێر سەرم و دەست بەجێ چوومە خەوێكی قووڵەوە. ئەو شەوە خەونم بە خۆمەوە دەدی. لە خەومدا مردبووم، دایكم لەگەڵ چەند ئافرەتێكی دیكە قژی خۆیانیان دەڕنی و بەر ببوونە ڕوومەتی خۆیان. ئەو بە دەنگێكی نووساوەوە، سەرمۆری دەهێناوە و دەیلاواندمەوە و دەیگوت: "ئەریێ ڕۆڵە كەس لێ نەڕەنجاوەكەم، ڕۆڵە تاقانە یادگارەكەی ناوخاسم، چۆن بە جارێك ساكۆم ڕەش و ڕەنجم بێوەر بوو. كوڕی قەزاق ئەتۆ و هەزارانی دیكەی وەكو تۆی بێ باب كرد، بەڵام ئەم كۆچەی ئەتۆ كردت، گەلێك بەئێش و ئازارترە. ئەو برینەی كە بەم كۆچە ناوەختەت خستتە سەر دڵم، گەلێك ناسۆرتر لە برینەكانی دیكەیە".

من كە لە قووڵایی خەون دیتندا بووم، لە پڕ بە دەنگی وێك كەوتنی پیاڵەیەك لە خەو ڕاچڵەكیم. بینیم شێرزاد خەریكە لەژێر ئاگر و ژیلەمۆدا پەپكە نانێكی ئەستووری دروست كردووە و پیاڵەیەكی پڕ لە چایی كردووە و لەسەر تاتە بەردێكی چووكەی داناوە. هەستام و بەیانی باشم لێكرد. بانگی كردمە پێشەوە و گوتی:

ـ پەپکە بە گەرمی خۆشە و پارووپەکی لێ بخۆ.

ـ دەتوانم کەمێك ئاو بە دەست و چاومدا بکەم؟

ـ قەیدی ناکا، خۆ ئەتۆ هەر ئەمڕۆ لێرە دەبی و دەتوانی بە کەیفی خۆت کەڵك لە ئاوەکە وەرگری.

دەستی ڕاستم هێشتا قورس بوو و بگرە ئازار و ئاوسانیشی هەر مابوو. پاش شوشتنی دەست و چاوم، تەکم دایە پێشەوە و دەستم کرد بە خواردنی پەپکەی گەرم و دوو چاییشم لەگەڵ خواردەوە.

پاشان پێشنیاری کرد کە با درێژە بە لێدوانەکەمان بدەین.

بۆ وەبیرهێنانەوە پێم گوت:

ـ باسی ئەو کابرایەت کرد کە لە شازادە موحەممەد سوێندی بە درۆی خواردووە و دووگیان ببوو، ئەی تۆ چیت کردووە کە وات بەسەرهاتووە؟

ـ ڕاستت دەوێ من سوێندی بە درۆم نەخواردووە، بەڵام پێم وابێ لە دین وەرگەڕان گەلێك گوناحەکەی گەورەترە لە سوێندی بە درۆ خواردن. بۆیە پێموایە خودا تۆڵەی لێم کردۆتەوە.

من ئەو جۆرە بیرکردنەوانەی شێرزادم لێ سەیر نەبوون، چونکە مەلاکان ژێرخانی دەسەڵاتەکەیان لەسەر ئەو جۆرە بیرکردنەوانە دامەزراندبوو. واتە ئەوان دەبا هێندە ترسی سووتان لە ئاگری دۆزەخیان خستبایە دڵی مرۆڤەکانەوە، کە خۆیان تەنیا بە گیانلەبەرێکی بێ ئیرادە زانیبا. لە هەمانکاتیشدا لام ڕوون بوو کە هەڵەیەك لە مەتەبی دوکتۆر لە کرماشان ڕوویداوە و شێرزادیش لە ترسانە تووشی هەڵەیکی گەورەتر هاتووە.

پرسیم:

ـ تا کەنگێ دەتەوێ لێرە بمێنیەوە، یان بە گشتی پلانت بۆ ئەم قۆناغە ناسکەی ژیانت چییە؟

ـ کاکی خۆم! بە کورتی پێت دەڵێم کە هەتاکو منداڵەکە دێنمە دونیا لێرە دەمێنمەوە. ئەو کات ئەگەر بەخت یارمەتیدەرم بێ، دەیدەم بە کەسێك یان بنەماڵەیەك کە نەیان ناسم و بێ منداڵ بن، چونکە لانی کەم ئەوە دەزانم کە خەڵکانێکی زۆر هەن کە منداڵیان نابێ و بە دوای منداڵدا دەگەڕێن.

بە جارێك هەستم کرد کە شێرزاد بڕوای تەواوی بەوە هەیە کە دروگیانە!، بەڵام لە هەمانکاتدا هەستێکی بەرزی مرۆڤ خۆشەویستیی تێدایە. ئەو تا ڕادەیەك هەقی بە دەست بوو، چونکە لە لای دوکتۆرێکی بە ناوبانگ وەڵامی تاقیکردنەوەی وەرگرتبوو. نەمدەویست چی دیکە درێژە بە باسەکەمان بدەین، بۆیە پێمگوت:

ـ کاکە گیان! تاکو دەستەیەکیش نەهاتوونەتە گەڕان بەدوای خۆمدا، دەبێ هەرچی زووترە خۆم بگەیەنمەوە ماڵ.

شێرزاد داوایکرد کە چەکەکەی بۆ بەجێ بێڵم. منیش ئەم کارەم کرد، پاشان بەڵێنم پێدا کە لە داهاتوویەکی نیزیکدا دەگەڕێمەوە لای.

زۆری نەمابوو بۆ نیوەڕۆ، شێرزادم بەجێهێشت و بەرەو ماڵ بوومەوە. زەردەی خۆر لەسەر شاخەکان مابوو کە گەیشتمەوە بەرزایەکانی بەرانبەری دێی خۆمان. لەو ماوەیەدا کە بەڕێوە بووم، بیرم لە چەندین لایەنی ژیانی ئەو چەند ڕۆژانەی دواییم کردبووەوە. لە دووپشك پێوەدان، زراوی بەراز

خواردنەوە بگرە، تاکو تاقیکاری دوکتۆر و مەسەلەی "دووگیان بوونی شێرزاد " و لەسێدارەدرانی ئازادیخوازان و زۆر بابەتی دیکە، ئەوەی بیرم لێ نەکردبۆوە پێوەندی ڕێکخراوەیی و دامەزراندنی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا و یەکسانی لەلایەك و بنج داکوتانی بیرۆکەی میراتگران و ئالاَهەلگرانی کەلتوور و کەلەپوری نیوەدورگەی عەرەبستانی سعودی لە لایەکی دیکەوە بوو.

وردە وردە زەردەی خۆر لەسەر شاخەکان پەڕی، لەبەر ئەوەی خەلك نەمبینن، پالم بە تاشە بەردێکەوەدا و دووربینەکەم دەر هێنا و چاوێکم بە دەوروبەری دێ دا خشاند. لانیکەم ئەوەم دەزانی کە نابێ تەنانەت کەسێکیش بزانێ کە شێرزادم دیتووە، یان ڕووبەڕووی گرفتێکی وا بۆتەوە. پاش دووربین هاویشتنێکی دوورودرێژ و ئەو کاتەی کە ئیتر چاو لە قەراوڵ چوو، بە نێو باخانی خوارووی دێ دا خۆم گەیاندە مالەوە. کە چورمە مالەوە، دایکم لەپاڵ سۆبەکەدا دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو. دەستم کردە ملی و ئەویش سێ خرپ بە دەورمدا خوارد و گوتی:

ـ بە تەما نەبووم جارێکی دی بتبینمەوە و پێم وابوو جەردە و دز تووشت هاتوون و بۆ بەدەستهێنانی چەکەکە کوشتوویانی.

بۆ ئەوەی دایکم خۆشحال بێ، خەبەری زیندوو بوونی شێرزادم پێدا. بە دوای ئەوەدا دەستم پێ نیشاندا و گوتم:

ـ دەبینی هێشتا ئاوساوە، ئەوە دووپشك پێیەوە داوە و شێرزادیش بوو بە فریادڕەسم.

ئنجا بۆم گێڕاوە کە ئەو پێی گوتم زراوی بەراز دژی ژاری مار و دووپشکە و پرێسکەیەك کە زراوی وشککراوی بەرازی تێ دا بووە دەرهێناوە، تێکەڵ بە ئاوی کردووە و منیش خواردمەوە. دایکم دەستی کردە بە لەسەر و پۆپڕ دانی خۆی، دەستیم گرت و هێورم کردەوە، پاشان هەواڵی بێگەردم لێ پرسی. هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی:

ـ لەو کاتەوەی ئەتۆ چووی، تا ئەم ئێوارەیە لە لای بووم. دوێنێ ئێوارێ شامی شێرزادیان کوشت و مردنی شێرزاد ڕاگەیەندرا. مامۆستا جوامێریش هێندێك باسی چاکەی شێرزادی کرد، بێجگە لەوەش، بڕیار وایە کە دوو بەیانیش بزنێك، دوو خرت و شەکەنێریکیش سەر ببڕدرێ و بکرێ بە خێرات. ئەمەش بۆ خۆی بۆتە نەریتێك کە خاوەن مردوو دەبێ خێرات بکا. ئەم نەریتە کۆنە خەرجێکی زۆر گران دەخاتە سەر شانی بنەماڵەی کۆچکردوو، کە لە ڕاستی دا کۆستەکە دەبێتە دوو کۆست، چونکە زۆرکەس هەن کە کەسوکاریان دەمرێت و بە هۆی ئەو دابونەریتە کۆنەوە، هەیبێ و نەیبێ، دەبێ ئەو خێر و خێراتە بکا. هەروەها هێندێك کەس گۆشتی سیاوەن ناخۆن و دەبێ گۆشتی مەڕیان بۆ لێبنەی.

دایکم پێشنیاری کرد کە دەبێ ڕاوێژێك بکەین، بەڵکو پێش بەو خێراتکردنە بگرین. لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە پێکەوە بچین بۆ لای بێگەرد و بەر لە هەموو شتێك مزگێنی زیندوو بوونی شێرزادی پێ بدەین. پاشانیش مامۆستا جوامێر لەم ڕووداوە ئاگادار کەینەوە، ئێمە خۆمان ئامادە کرد و بەرەو ماڵی بێگەرد وەڕێ کەوتین. لە دەرگای ماڵمان دا، گورج هات و دەرگای لێمان کردەوە. لە سەرەتا دا پێی وابوو کە دایکم

به تەنیایە، بەڵام کە دیتی منی لەگەڵم، دەستی لە ئەستۆ کردم، ئێمە چووینە ژوورەوە و خێرا هەواڵی زیندوو بوونی شێرزادمان پێ ڕاگەیاند.

بێگەرد لە خۆشییان شاگەشکە ببوو، پاشان هەواڵی شێرزادی لێپرسیم، منیش دڵنیام کرد کە زۆر باشە و قەولیشم پێ داوە بەم زووانە سەردانی بکەمەوە. پێشمگوت:

- ئەگەر بە خۆتدا دەپەرمی ئەوە پێکەوە دەچین و بە چاوی خۆشت دەیبینی.

دایکم پێیگوت:

- ڕۆڵە! کچە شیرنەکەم، پێشنیار دەکەم تا درەنگ نەبووە، خەڵك ئاگادار بکەینەوە کە شێرزاد هەواڵی ناردۆتەوە و زیندووە. هەواڵەکەش وا بڵاو دەکەینەوە کە لە کورەخانەیەکی شاری سنە کار دەکا و بەم زووانەش دەگەڕێتەوە. شوانەش بچێ مامۆستا جوامێر ئاگادار بکاتەوە تاکو پێشگیری لە خێراتکردن بکرێت و تووشی زیان و زەرەری زیاتر نەبین.

ئێمە لەسەر ئەو پێشنیارەی دایکم ساغ بووینەوە کە من بڕۆم مامۆستا جوامێر ئاگادار بکەمەوە. بۆ ئەو مەبەستەش بەرەو ماڵی ئەوان وەڕێ کەوتم. کە گەیشتمە ئەوێ، لە دەرگایانم دا. پاش ماوەیەکی کورت، چناری کچی مامۆستا هاتە بەر دەرگا و پاش هەواڵپرسی، خولقی کردمە ماڵەوە، سوپاسم کرد و گوتم:

- کارم بە مامۆستایە.

- بابم خەریکی دروستکردنی هێشی جووتکردنە، هەرئێستا بانگی دەکەینەوە و باشتروایە بێی بۆ ژووری و لەوێ قسەی لەگەڵ بکەی.

منیش لەگەڵ چنار چوومە ژوورەوەی حەوشەکە، لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بۆ لای مامۆستا، چنار پێی گوتم:

ـ خۆ ناسلامەتی دوو چاوتان هەیە ئێمەمانان نابینێ، تەنیاش لەبەر ئەوە کە باپمان مەلایە.

ـ بە پێچەوانەوە، نە من و نە هیچکام لە هاوەڵەکانم بۆچوونێکی خراپمان سەبارەت بە بنەماڵەی ئێوە نییە.

کاتێك لە پلیکانەکانی حەوشەکە بۆ باڵەخانە سەردەکەوتین، چنار زیاتر لێم نیزیك بوەوە و لێی پرسیم:

ـ شوانە! دەزانی کەژاڵ زۆرجاران کە دادەنیشین و قسان دەکەین، باست دەکا و واهەست دەکەم کە خۆشیدەوێی!

سوپاسم کرد و گوتم:

ـ ئەگەر واش بێ، بۆ خۆم هێشتا هەستم پێنەکردووە. لانیکەم بۆ خۆم گوێم لە وشەیەکیش لەلایەن ئەوەوە نەبووە.

لە لێکدانەوەی خۆمرا وامدانا کە ڕادەربڕینەکەی چنار ڕەنگە بۆ تاقیکردنەوەم بێ.

بۆیە پێمگوت:

ـ ئەگەر ڕۆژگار دەرفەتمان بداتێ، ئەودەم قسەی زیاتری لەسەر دەکەین.

ئەویش بە لادەمێکەوە، هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستم و دیسان لێی پرسیم:

ـ ئەمن چۆن دەبینی؟

- ئەگەرچی هاتوچۆمان نەبووە و پێکەوە قسەمان نەکردووە، بەوحاڵەش لاموایە کچێکی تێگەیشتووی و بە چاوی ڕێزەوە لێت دەڕوانم.

چنار هێندە ڕادەربڕینەکەی منی پێخۆش بوو کە لە خۆشییان چاوی پڕ بوون لە فرمێسك، سوپاسی کردم و بە نیزیکبوونەوەمان لە ژووری باڵەخانە، دادە جەیران هاتە دەرکی قاپییەکە، سڵاوم لێکرد و پاش ئەوەی سڵاوی لێ سەندمەوە، پرسی ئەوە چی قەوماوە؟ هەر دەڵێی مانگ گیراوە!

پێکەوە چووینە ژوورەوە، بەڵام لە شەرمان نەمدەزانی چۆن وەڵام بدەمەوە، دانیشتم و سوپاسم کردن.

بۆ ئەوەی وەڵامی گلەییەکانی دادە جەیرانم دابێتەوە، خۆمم خستە ئەو پەڕی دنیاوە و گوتم:

- هەواڵ هاتووە کە شێرزاد لە ژیاندا ماوە و ئێستاش هاتووم لەگەڵ مامۆستای باس بکەم.

لەو ماوە کورتەدا چنار چوو جلەکانی گۆڕیی و بە جلێکی جوانترەوە لەو بەری کورەی ئاگرەکەوە دانیشت، خەریك بوون چای دەمکەن، نەمهێشت. هێندەی پێ نەچوو کە مامۆستا هاتە ژوورەوە. لە بەریی هەستام و ئێوارە باشم لێکرد، پرسی:

- ها کوڕی باش، کەم دیاری، خێرە بەم شەوە؟

- بێگومان خێر دەبێت و هاتووم بە بەڕێزتان ڕابگەیەنم کە شێرزاد زیندووە.

مامۆستا ڕووی لە دادە جەیران کرد و گوتی:

ـ کوانێ چایەك، دۆیەك، پێخۆرێك؟ خۆ لە دەشتی بەرەهۆتی سعودی گیرتان نەکردووە.

دەستبەجێ سوپاسم کرد و گوتم من بۆ خۆم نەمهێشت زەحمەت بکێشن.

مامۆستا هێندێك ڕەخنەی لێگرتم، کە بۆچی کەوتوومەتە شوێنی دەستەیەکی وێڵ و بەیتە. ئەو ڕەخنەکانی درێژە دا و پرسی:

ـ پێم نالێین چۆن بە ئیسم و میسم وڵات ڕزگار دەکرێ و خەڵك لە چەوسانەوە و بەش مەینەتیی قوتاریان دەبێ؟

من ڕەخنەکەم لێ قبوڵ نەکرد و گوتم:

ـ ئەو هاوڕێیانەی من نە وێڵن و نە بەیتە، بەڵکو مرۆڤی باشن کە دەیانەوێ کۆمەڵگا لە فەوتان لە دەستی ئیمپریالیـزم ڕزگار بکەن. لەوانەیە ئێوە بە جۆریکی دیکە لێیان تێبگەن، بەڵام ئەوانە کۆمەڵێك گەنجن کە بە دەیان ئاوات و ئارەزووی باشیان هەیە.

دادە جەیران کە گەلێك تووڕە دەهاتە بەر چاو، ڕووی لە مامۆستا جوامێر کرد و پێی گوت:

ـ جوامێر! خەڵك هەقی خۆیانە چۆن بیردەکەنەوە. ئەتۆش بۆت نییە بەو گەنجانە کە نە کارێك، نە کاسبییەك، نە سەرگەرمییەك شك دەبەن و نە دەزانن دوارۆژیان بەرەو کوێ دەچێ، بڵێی وێڵ و بەیتە.

بەو قسانەی دادە جەیران گەز گەز باڵام کرد، بەڵام نەمدەویست باسەکە لەو بوارە دا درێژەی پێبدرێ. مامۆستا جوامێر لە جوابی دادە جەیراندا گوتی:

ـ من مەبەستێکی ئەوتۆم نەبوو کە ئەوانە بەیتەن، بەڵام ئەوەشم پێباش نییە کە گەنجان و لاوان تەنیا بە دوای پڕوپاگەندەی ئەم یان ئەو ئایدۆلۆژیادا سەرلێشێواوانە دروشمی بێ نێوەڕۆك بدەن.

هەستم پێکرد کە خەریکە دەبێە هۆی دروستبوونی گرفتێك لەنێوان مامۆستا و دادە جەیراندا. هەر بۆیە داوام لە دادە جەیران کرد کە ئێستا کاتی ئەم باسانە نییە و لەوانەیە مەبەستی مامۆستاش دڵسۆزیی بێ. مامۆستاش کە زانی بارودۆخەکە خەریکە بە لای ئەودا ناشکێتەوە، گوتی:

ـ شوانە بۆ خۆی تێدەگا کە من مەبەستێکی خراپم نییە.

پاشان لێی پرسیم:

ـ بێجگە لە هەواڵی زیندووبوونی شێرزاد، کاری دیکەت نەبوو؟

بەر لەوەی من بێمە جواب، دادە جەیران پێی گوت:

ـ چۆن کاری نییە، هەر ئێستا کەسێك ڕاسپێرە تاکو بەیانی زوو جاڕی زیندوو بوونی شێرزاد بکێشێ و پێشگیری لە خێراتکردنیش بکرێ.

لەو قسانەدا بووین کە مامۆستا گوتی:

ـ کەوابێ من دەچم بۆ ڕاسپاردنی کەسێك و شوانەش با لێرە بێ تا دەگەڕێمەوە.

مامۆستا جوامێر بە دوای کاری خۆیدا وەڕێ کەوت و من و دادە جەیرانیش دەستمان بە قسان کرد. لە درێژەی پرسیار و وەڵامەکاندا لێم پرسی:

ـ بۆ، مەگەر ئێوە نوێژ ناکەن؟

بەر لەوەی خۆی وەڵامم بداتەوە، چنار گوتی:

ـ دایکم نازانێ قیبلەش لە کوێیە.

ـ ئەی بۆ خۆت چی؟

ـ من خۆم بە شتێکەوە ماندوو ناکەم کە هیچی لێ تێنەگەم، بێجگە لەوەش من گەلێك بێزارم لە لاساییکردنەوەی کەلتووری بێگانان، جا ئەوە ئایین و ئایینزا بێ، یان ئایدۆلۆژیا و پێداهەڵگوتن بەم و بەودا.

بە کەمێك تێڕامان لەو ڕادەربڕینەی چنار، پرسیم:

ـ مامۆستا گوشارتان ناخاتە سەر تاکو وەك خۆی هەڵسوکەوت بکەن؟

دادە جەیران لە وەڵامدا گوتی:

ـ ئێمە بۆ خۆمان لەسەر ئەوە ساقین کە ژییان و دینداری تەنیا ترس و پاڕانەوە نییە، بێجگە لەوەش ئێمە لەو کەسانە نین کە بە هەموو سازێك سەما بکەین.

زۆری پێنەچوو کە مامۆستاش هاتەوە و هێندێکی دیکە بەسەروپۆپنەی(ئیسم و میسم و نیسم)دا هات.

بە دوای ئەوەدا هەستم کرد کە زۆر دانیشتووم، ماڵئاواییم لێیان کرد و بەرەو ماڵی بێگەرد گەڕامەوە.

چنار تاکو دەرکی حەوشە بەرێی کردم. لەو مەودایەدا داوای لێکردم کە لە داهاتوودا پێوەندیی پێوە بگرین. منیش بەڵێنم پێدا کە ئاگاداری دەکەمەوە، بەڵام نەمدەزانی مەبەستی لەوەی کە پێوەندی پێوە بگرین چی بوو.

لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵی بێگەرد، تووشی خاڵە شامار هاتم کە میراوی گوند بوو. لەمێژ بوو باخ و بێستان پێویستی بە ئاوداشتن نەمابوو. خاڵە شامار تەواوی ژیانی بە تەنیا تێپەڕ کردبوو و ئەرخەوای لەسەر گۆی زەوی شك نەدەبرد.

پاش هەواڵپرسی، لەگەڵ خۆم بردم بۆ ماڵی بێگەرد، لەلایەن دایکم و بێگەردەوە بەخێر هاتن کرا، ئێمە دانیشتین و سەروچامان خواردەوە و تا درەنگانێك لەوێ ماینەوە. من دەبا گەڕابامەوە بۆ ماڵەوە تاکو گەلاڵەیەکم بۆ چۆنایەتی و بە دواداچوونی گرفتی شێرزاد داڕشتبا.

بێگەرد زۆری خولق کرد کە شەو لە ماڵیان بمێنینەوە، بەڵام نەمدەتوانی، پاشان دایکم ڕاسپارد کە بەیانی بێگەرد لەگەڵ خۆی بێنێ بۆ ماڵی خۆمان.

ئەو شەوە پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر، خۆم ساغکردەوە کە دەبێ چۆنییەتی ئەو بەسەرهاتەی شێرزاد و چەشنی ڕووداوەکە، بەتاییەت سەردانی لای دوکتۆر لە کرماشان لەگەڵ بێگەرد بێنمە گۆڕێ. بۆ ئەم مەبەستەش وام دانا کە بەبێ پێچ و پەنا بابەتەکە لەگەڵ بێگەرددا بێنمە ئاراوە، چونکە پێم وابوو کە کلیلی ئەم گرێ کوێرەیە لای ئەوە، لەگەڵ گوڵبانگی بەیانیدا بە دەنگی جاڕچی لە خەو هەستام کە دەی گوت:

ـ خەڵکینە! مزگێنی بێ لە هەموو لایەکتان، شێرزاد زیندووە. هەواڵی ناردووە کە لە کورەخانەیەکدا لە شاری سنە کار دەکا و بەم زووانەش بێگەرد دەچێ بۆ سەردانی.

هەوا گەلێك سارد بوو، هەستام ئاگرم کردەوە و تیانچە گەورەکەم پڕکرد لە ئاو و لە سەرم دانا. زۆری پێنەچوو ئاو گەرم بوو و ئاوێکم بە خۆدا کرد و ڕەدێنم تاشی. پاش ئەوەی قاوەڵتیم کرد، کتێبێکم هێنا و هێشتا چەند لاپەڕەیەکم نەخوێندبۆوە،کە دایکم و بێگەرد هاتنە ژوورەوە. لە بەریان هەستام و بەخێر هاتنی بێگەردم کرد. دڵم وا لێی دەدا کە تا ئەوکات شتی وام بە خۆمەوە نەدیتبوو. بە جارێك هەستم پێکرد کە ئەرکێکی قورسم کەوتۆتە سەر شان. گەشبین نەبووم لەوەی کە بتوانم بە ئاکامێك بگەم. لە ڕاستیدا لەسەر ئەم بۆچوونەم زۆریش بە هەڵەدا نەچووبووم، چونکە من هێشتا گەنج بووم و ئەزموونی دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی گونجاوم بۆ گرفتێکی وا تێدا نەبوو. لەلایەکی دیکەشەوە من کەسێکی ناسراو یان باوەڕ پێکراو نەبووم تاکو خۆم لەو جۆرە گرفتانە هەڵقورتێنم. گرفتی دیکەش لەسەر ڕێگام زۆر بوون بۆ ئەوەی نەتوانم سەرکەوتن وەدەست بێنم. ئەو هۆیانەی کە هانی دەدام بۆ بەدواداچوونی گرفتێکی ئاوا، لە پلەی یەکەمدا هاوڕێیەتی نێوان من و شێرزاد بوو. لە پلەی دووەمیشدا دڵسۆزی و بەزەیی هاتنەوەم بە بێگەرد دا بوو کە زیاتر دەگەڕایەوە سەر مرۆڤدۆستی و یارمەتیکردن. واتە بە پێچەوانەی گەوڕ ماڵێن و مەشکەژەندن و... کە زیاتر لە بیری ئایدۆلۆژی، یەکسانی و چینایەتییەوە سەرچاوەیان دەگرت. دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە ئەوە یەکەمین جارم بوو کە لەسەر ڕووداوێکی ئەوتۆ هەست بە بەرپرسایەتیی بکەم. هەر چەند کاتەکان تێپەڕ دەبوون، گوشاری هەست بە

بەرپرسایەتیی کردنم ڕووی لە زیادبوون دەکرد. دایکم کە تەمەنێکی لە ڕەنج و مەینەتیدا بە سەر بردبوو، ڕووی تێکردین و گوتی:

- رۆڵە! ئێوە هەردووکتان وەکو کچ و کوڕی منن. تەنیا جیاوازییەك کە لەنێوانتاندا دەبینم ئەوەیە کە یەکتان کوڕ و ئەوی دی کچە. ئێوە سەختی ڕۆژگارتان نەدیتوە و نازانن ژیان لەم وڵاتانەی کە ئێمەمانانی تێدا دەژین چەندە سەخڵەتە. ئێوە هێشتا دەست و پەنجەتان لەگەڵ کۆسپ و تەنگ و چەڵەمەکانی سەر ڕێی ژیان نەرم نەکردووە. ئێستا بە بەرزە فڕی کردن گرفتەکانی کۆمەڵایەتی چارەسەر ناکرێن. بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك گەڵاڵەی لە بار و پشووی درێژ و پشت ئەستوور بوون بەهێزی خۆی دەوێ. هەر بۆیە بەباشی دەزانم کە پێکەوە هاوبیری یەکتر بن و بیرێك لە چارەنووسی شێرزاد بکەینەوە.

ئەو وتانەی دایکم زۆر گرینگ بوون. هەربۆیە نەمدەویست چ هەڵوێستێك دەربڕم کە ناپوختی پێوە دیار بێ. یەکڕاست ڕووم تێکرد و گوتم:

- ئەوەی ڕاست بێ ئەم گرێ کوێرە کە کەوتۆتە نێو ژیانی ئەم دوو کەسە، تەنیا بە دەستی بێگەرد دەکرێتەوە.

بە بیستنی قسەکانی من، بێگەرد بەبێ پێشەکی و لێکدانەوە، تووڕەیی خۆی دەربڕی:

- جا باش نەبوو کەس لێرە نەبوو کاك شوان! خۆ ئەگەر کەسێکی دیکە گوێی لەم وتەیە بایە، ئەوە پێی وا دەبوو کە من بەڵایەکم بە سەر شێرزاد هێناوە. جا وەرە خۆڵم لە دۆی مەکەن، هەر ئەوەمان مابوو.

دایکم ویستی شتێك بڵێ، کە قسەکەم لە زاری گرت و گوتم:

ـ بێگەرد! ئەگەر وا بیر بکەیتەوە، خەریکی هەڵەیەکی گەورە دەکەی. من چ مەبەستێکی خراپم نەبووە و ناشمبێ. هەر لە دوێنێ شەوێوە بڕیارم داوە بە ڕاشکاوی لەگەڵتا بدوێم. بەبێ پێچ و پەنا، شێرزاد چۆنیەتی گرفتی خۆی بۆ گێڕاومەتەوە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئەتۆ ئەو ڕاستییەت لێمان شاردۆتەوە. هەر بۆیە وای بەباش دەزانم کە یەکڕاست بچینە ناخی بابەتەکەوە.

دەمەویست درێژە بە قسەکانم بدەم، کە دایکم پێی گوتم:

ـ ڕۆڵە! قەزات لە خۆم، ئەمە ئیتر ئیسم و میسم و سیسم گوتیسم نییە. ئەمەش کە ئێمە دانیشتووین، نە کۆبوونەوەی سیاسییە و نە باسی دڵداریش، تاقانەکەم! لە کۆمەڵی ئێمەدا ئەمجۆرە لێدوانانە شوێنی خراپ لەسەر باری دەروونی مرۆڤ دادەنێن، چونکە کۆمەڵی ئێمە نەك هەر بۆ خۆی گەشەی نەکردووە، بەڵکو لە هێندێك بوارەوە بۆ پاشەوەش گەڕاوەتەوە. دەتوانم بڵێم کە زۆر جار ئەمجۆرە ڕادەربڕینانە بوونەتە هۆی لەیەکپچڕانی پێوەندی بنەماڵەیی و کۆمەڵی ئێمەی بەرەو هەڵدێر بردووە. خۆ لە خۆڕا نییە دەڵێن: «نێچیر بە شوێن دەکوژرێ».

بە دوای لێدوانەکەی دایکم دا، هەستم پێکرد کە بە ڕاستی زۆرم ماوە تا قاڵ بم. داوای لێبوردنم لە بێگەرد کرد و پێمگوت، هیوادارم وەدڵی نەگری. بێگەرد کە چاوی بە گریانەوە بوو، سەری هەڵبڕی و دڵێدامەوە و گوتی:

ـ کاك شوان! ئەی ئەگەر شێرزاد ڕاستییەکانی پێت گوتووی، ئیتر من چیم هەیە تاکو پێی زیاد کەم؟ مەگەر من لە یەکەم چاوپێکەوتنماندا پێتم نەگوت کە دەردی شێرزاد دەرمانی نییە. خۆ ئێوە لای خۆتان لایەنگری یەکسانیی و مافی ئافرەتن. ئیدی چۆن بە ڕەوای دەبینی کە حەق بە شێرزاد بدەی و منی لێ بێبەش بکەی؟

ئەمجارەیان دایکم بە جۆریکی دیکە هاتە وەڵام و گوتی:

ـ بێگەرد! نابێ ئەتۆش هەڵەکانی شوان دووپات بکەیتەوە. ئەوەی کە ئەتۆ باسی دەکەی هیچ پێوەندییەکی بە یەکسانی و مافی ئافرەتەوە نییە. لەوانەیە شێرزاد لەسەر گرفت و لەشساغی خۆی بە جۆرێکی دیکە بۆ شوان دووابێ، کە جیاوازی بەرچاوی لەگەڵ زانیارییەکانی تۆ هەبێ. هەر بۆیە داوات لێدەکەم کە هەرچی سەبارەت بەباری لەشساغی هاوسەرەکەت دەزانی باسی بکە.

بێگەرد ڕووی لە دایکم کرد و گوتی:

ـ دادە وەنەوش! بە گیانی ئەو تەنیا کوڕەت کە دونیا و دینتە، هیچ شتێکتان لێ ناشارمەوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەمە ماوەیەکە خراپمان لێ قەوماوە. من لە ئێوە زیاتر کێم هەیە تا سفرەی دڵمی لێ بکەمەوە.

ئەو بەمجۆرە چووە نێو باسی نەخۆشییەی شێرزادەوە:

ـ دادە وەنەوش! ئەتۆش لە جێگای دایکمی. خۆ ناشکوری نەبێ براشم نییە تاکو شوانەی لە جێ دانێم. بۆ خۆت دەزانی کە دایکم بەسەر مناڵەوە چوو. بابیشم لە بێکەسی و بێدەری هەر بە گەنجی تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بە جێهێشتووە. دادە وەنەوش گیان! لە ڕووت بە دوور بێ، ماوەیەك بوو کە

شێرزاد زگی دێشا. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو ئەو لاوە دەچوو. داك و دەرمان نەماوە کە تاقی نەکردبێتەوە. نە شەوی شەو بوو، نە ڕۆژی ڕۆژ. ژیانی بە تەواوی لێ تاڵ ببوو و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باری لەشساغیی بەرەو خراپی دەچوو. هەرچی دەهات زگی قەڵەو و قەڵەوتر دەبوو. سەرتان نەیەشێنم، تاکو مانگێك لەمەوبەر بە هۆی دۆستێکەوە ناو و نیشانی دوکتۆرێکیان لە کرماشان پێدایێن. ڕۆژێکیان دوو کەسی وەڕێ کەوتین بۆ کرماشان. لەوێ بە تاکسی خۆمان گەیاندە مەتەبی کاکی دوکتۆر. پێموابێ ئەوە خراپترین ڕۆژی ژیانی شێرزاد بوو. خەڵکێکی زۆر لە ژووری چاوەڕوانی دا دانیشتبوون. کاریان ڕاست بێ، کە دیتیان شێرزاد حاڵی خراپە و خۆی پێ ڕاناگیرێ، بە پێشخزمەتی دوکتۆریان گوت کە نۆرەکەی وە پێش ئەوانی دی بخرێ. خەڵکەکە لەوە دەترسان کە لەوانەیە ڕیخۆڵە کوێرەی تەقیبێ. بریا وابووایە و ڕیخۆڵە کوێرەی تەقیبا. پاش ماوەیەك بانگیان کردینە ژوور و دوکتۆر پشکنینێکی باشی بۆ کرد، پاشان تاقیکردنەوەی گمێزی بۆ نووسی و دەفرێکی پلاستیکی پێدایێن. شێرزاد هێندە بێتاقەت بوو، کە بە تەنێ نەیتوانی کاری خۆی جێبەجێ بکا. من یارمەتیم کرد و بە هەر جۆرێك بوو گمێزی کردە نێو دەفری تاقیکردنەوەکە، پاشان دەفرەکەم لە پەنا کونەواجەی دەرگاکە دانا و ئیتر ئێمە هاتینەوە ژووری چاوەڕوانی و دانیشتین، پاش وچانێکی درێژ ماوە، کاکی دوکتۆر بانگی کردینەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

دوکتۆر هێندێك چاوی شێرزادی داچەقاند و پاشان ڕایکشاندە سەر قەرەوێڵەیەك. ئینجا لە ڕووی ئێوە دوور بێ، قامکێکی هەتا بن بە کۆمی

شێرزاد دا کرد و بەخەستی هەڵیسووڕاند. ئەم ڕەنجبێوەرە لە تاو ئازار و لە شەرمان وەك مار لولی ئەخوارد. بە دوای ئەوەدا بەڵگەیەکی دا بە دەست شێرزادەوە. بە ڕاستی ئیتر بۆ گێڕانەوە نابێ و لام دژوارە و نازانم چۆن چۆنی لە ژووری دوکتۆر هاتینە دەرەوە. ئاخر لە بەختی منی ئاخرشەڕدا، شێرزاد دەنگی لێ بڕا و تەنیا بە لەش زیندوو بوو.

لەو کاتەی دا کە بێگەرد مقی کرد، هەستم پێدەکرد کە چرکە بە چرکە پشووی سوار دەبێ. ڕاست لەو کاتەی کە من و دایکم چاوەڕوانی درێژەدانی لێدوانەکەی بێگەردمان دەکرد، لە نەکاو بۆنی سوتان ماڵەکەی داگرت.

دایکم گورج هەستا و گوتی هیچ نییە بەردەوام بن. دوایی دەرکەوت کە سەماوەرەکە هێندە کوڵاوە، کە ئاوەکەی هەڵچووە و ڕژاوەتە سەر ڕاخەرەکان و بنی ئاوردانی سەماوەرەکەش سووتابوو.

ئێمە بێدەنگ بووین تاکو دایکم هاتەوە و پێی گوت:

ـ کچی خۆم! ئێمە هەمووومان مرۆڤین و کەموکوڕییەکانی مرۆڤیش زۆرجاران وێکدەچن. هەموو کەسێك دەتوانێ کردەوە یان هەتکێکی لە دەست بکەوێ، بەبێ ئەوەی بۆ خۆی خوازیاری بێ. کچم! ئێمە بە خۆمان دەڵێین مرۆڤ، ئەو ناوەش خۆمان لەسەر خۆمانمان داناوە، کە ئەمە بۆ خۆی پرسیاری لەسەرە، بێشك ئێمەش گیانلەبەرێکین وەك گیانلەبەرەکانی دیکە و هەر وەك کاری چاك دەکەین، کاری خراپیش لە دەستمان دەقەومێ. مرۆڤی تێگەیشتوو دەبێ لە ڕووداوە خراپ و دڵتەزێنەکان ئەزموون وەرگرێ. حەشاردانی ڕاستییەکان نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتییە کە بە

درێژایی مێژوو بارگرانی بە سەرشان و پیلمانەوە کردووە. هەربۆیەشە نەمانتوانیوە بە سەر تەنگ و چەڵەمە کۆمەڵایەتییەکان دا زاڵ بین.

کاتێك ئەم وشانەم لە زاری دایکمەوە گوێ لێدەبوو، وەبیری هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانەی خۆم دەکەوتمەوە. لای خۆم دەمگوت «کاکە شوان! جاریٰ زۆرت ماوە شت فێر بی». دایکم هێندە بێگەردی بۆ باوەڕ بە خۆبوون هان دا، کە بە هاسانی بچێتە ناخی ئەو چرکەساتە تاڵ و بڕست بڕەوە کە ڕۆژانێك بوو ئازاری دەدا. ئەو بە دوای هێندێك مینگە مینگکردن دا، درێژەی بە لێدوانەکەی دا و گوتی:

ـ بەڵێ، دادە وەنەوش،کاکی دوکتۆر بەڵگەیەکی دا بە دەستمانەوە و گوتی: ناتوانم هیچ جۆرە دەرمانێکی بۆ بنووسم، چونکە ئەمە وەك نەخۆشی ناژمێردرێ و دەرمان خواردنیش بۆ ئەم مەبەستە بە قازانج نازانم، شێرزاد بێزار ببوو و منیش لە دوکتۆرم پرسی، بۆ مەگەر چییەتی کە دەرمانی ناوێ؟ دوکتۆر ملێکی خستە لاوە و گوتی دەزانم هەواڵێکی باش نییە، بەڵام دەبێ پێتان ڕابگەیەنم، کە ئەنجامی تاقیکارییەکە دەری دەخا کە شێرزاد دوو گیانە. دادە وەنەوش چاوت ڕۆژی خراپ نەبینێ، تا لە ژووری دوکتۆر هاتینە دەر، شێرزاد هێندێك ئاگای لە خۆی بوو. ئەوەی لەو کاتەدا پێمکرا، گرتنی تاکسییەك بوو بەرەو گەراجی سابوونی. لە سابوونییەوە سواری مینی بووس بووین بەرە و سەرپێڵ و لەوێشەوە هێندێك کەلوپەل و خواردەمەنیمان کڕیی و بە ماشینێکی دەربەست هاتینەوە ماڵ. لەو ماوە کورتەدا لە گوندی خۆمان، چەند جارێك ویستی خۆی هەڵاوەسێ، بەڵام دڵی زۆر نەرم و گەلێکیش بە بەزەیی بوو. ئەو بە

منی دەگوت، کە ئەو بۆ خۆی گوناهبارە، بەڵام ئەی ئەو بەستەزمانە هێشتا نەهاتووەتە دونیا بۆ دەبێ بمرێ. هەر لەبەر ئەوە بوو کە بڕیاریدا تا هێنانە دونیای منداڵەکە بچێتە داڵەهۆ و لە شاخ بمێنێتەوە. ئیتر لەو کاتەوە تا ئێستا نازانم شوێن و هەتەری لە کوێیە.

لە ڕاستیدا ئەوانەی بێگەرد بۆی گێڕاینەوە، شێرزاد هەر هەمووی بۆ گێڕابوومەوە و بۆ من شتێکی نوێی تێدا نەبوو. بە سەرنجدان بەوەی کە دایکم هێندێك زەختی خوێنی لەسەر بوو، هەر وەنەوزی دەدا. بۆیە پێشنیارم پێ کرد تا چاوێك گەرم کات. ئەو گوتی پێوست ناکا، چونکە خەریکە تا ڕادەیەك تێ بگەم کە چی ڕوویداوە، پاشان ڕووی لە بێگەرد کرد و پێی گوت: کچم، دەبێ شتی دیکەش لەم پێوەندییەدا ڕووی دابێ کە هێشتا سەبارەت بەو هیچت نەگوتووە. بۆ ئەوەی بە ئاکامێك بگەین و چارەسەرێکیش بۆ ئەم نەهامەتیە بدۆزینەوە، هەر چی لەو پێوەندییەدا دەزانی بیگێڕەوە.

بێگەرد هەر ئەو جۆرەی کە دانیشتبوو هێندێك سوڕاوە و ڕوو بە لای دایکم گوتی:

- شتی دیکە ڕوویداوە، بەڵام ئەوە چ پێوەندییەکی بە سەر خودی گرفتەکەوە نییە.

من نەمدەویست هیچ بڵێم و پێم وابوو کە ڕەنگە بێگەرد شەرمم لێبکا. پێشنیارم کرد کە با بچمە دەرەوە و بێتاقەتییەك دەربکەم، بەڵام بێگەرد قەبوڵی نەکرد و درێژەی گێڕانەوەکەی دەستپێکردەوە.

ـ تەنیا شتێك كە نەمگێڕاوەتەوە ئەوە بوو كە لە كاتی وەدەركەوتنی شێرزاد لە ئاودەستەكە، پێم لە دەفری گمێزەكەی كەوت و قەڵپم كردەوە. هەر ئەو كات هەستم پێكرد كە هەتكێكم لە دەست كەوتووە. هەربۆیە دەفرەكەم شوشت و بۆ خۆم نیوەی دەفرەكەم لە گمێز كرد و لەوێم داناوە. بە گیانی دادە وەنەوش لەوە دەر بچێ، هیچی دیکە شك نابەم كە لە دەستی من كەوتبێ. ئەوەشم لەبەر ئەوە كرد كە چاكەیەكم دەر حەقی شێرزاد كردبێ. ئێمە ڕێگایەكی دوور و درێژمان بڕیبوو بۆ سەردانی دوكتۆر و تاقیكردنەوەیەك. كوا ڕەوایە بە دەستی خاڵیی و بەبێ هیچ وەڵامێك بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. پاشانیش لام وایە گمێز هەر گمێزە و جیاوازییەكی ئەوتۆیان تێدا نییە.

ئێمە كە گوێمان لە لێدوانەكانی بێگەرد بوو، دەستبەجێ هەستمان پێكرد كە شتێك ڕوویداوە و بێگەردیش هێندە تاوانبار نییە.

دایكم پێی گوت:

ـ دڵت لە خۆت دانەمێنێ و واش مەزانە كە تاوانباری، چونكە ئەوە تاوان نییە و تەنیا هەڵەیەكە و ڕوویداوە كە نە ئەتۆ، نە شێرزاد و نە كاكی دوكتۆریش پێتان نەزانیوە. ئەگەر چی كاكی دوكتۆری بەشداری شەڕی نۆڕماندیی! دەبووا لێكۆڵینەوەی زیاتری لەسەر ئەو تاقیكارییە بەجێ هێنابا.

هەر لەوێ دڵنیامان كردەوە كە شێرزاد دووگیان نییە و هەڵەكەت ئەوەیە كە ئەتۆ نەدەبا گمێزی خۆتت لە دەفرەكە كردبا. ئەو تاقیكارییە لەسەر گمێزی تۆ كراوە كە بۆ خۆت دووگیانی. بێشك تاقیكارییەكی

ڕاسته، بەڵام لەسەر حیسابی شێرزاد تەواو بووە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە هیچ پێوەندییەکی بە شێرزادەوە نییە. پاش ئەوەی زانیمان چ ڕوویداوە، من بەبێ ئەوەی لە چاوەڕوانیدا بمێنمەوە، چوومە دەرکی ماڵی گەنجێکی هاوتەمەنم کە حوسێنی ناو بوو. بۆ خۆی لە ماڵ نەبوو، بەڵام داوای ناسنامەکەیم لە دایکی کرد، کە دەستبەجێ پێیدام، پاشان چوومە لای شۆفێری جیب ویلیزەکەی گوند و بە دەربەست بە کرێم گرت بۆ شاری سەرپێڵی زەهاو. لە ڕێگادا تووشی دوو جێگای پشکنینی پاسدارانی ئیسلامیی هاتین، کە بە نیشاندانی ناسنامەی حوسێن، بەبێ ئارەق لە دەستیان دەرچووم. بارودۆخی ئێمە لەو ناوچەیە وابوو کە لە مێژ بوو خرابووینە نێو لیستی دەستە و تاقمەکانی "دژە شۆڕشەوە" و ناوەکەشم بۆ خۆی بە تەنیا گرفتێکی گەورە بوو. ناوێك کە دەیتوانی سزای مەرگی بە دواوە بێ، چونکە شوان ناوێکی کوردی پاك و پەتیی بوو.

بە گەیشتنم بۆ ناو شار، تووشی هاوڕێیەکی دێرینم هاتم کە گەلێك ساڵ پێکەوە لە قوتابخانە هاوپۆل بووین. پاش چاك و چۆنی کردن، هاوڕێکەم گوتی:

- ئەمڕۆ هەینییە و مامۆستا عەبدولحوسێن پاش نوێژکردن، وتارێکی هەیە لەسەر ئەسحابی کەهەف. پێم باشە پێکەوە بڕۆین گوێی لێبگرین.

- هاوڕێ گیان! من جارێ ئەسحابی کەفی خۆمم هەیە، کە سەد ئەسحاب کەفی لەو چەشنە تۆزی قاچی ناشکێنێ.

هاوڕێکەمم بە جێهێشت و بەرەو لای دوکتۆرێکی ناسراوم وەڕێ کەوتم. کە گەیشتمە لای، لە ئەوەڵین چاوپێکەوتن دا گوتی:

- کاکە گیان، ئەوە بە دوای سەری خۆتدا دەگەڕێی؟

من خۆمم نەشکاند و پێمگوت، ورەت هەبێ برام، مرۆڤ ڕۆژێك دێتە دونیا و ڕۆژێکیش دەبێ بچێ.

ئەو هێندێك لێم تووڕە بوو و گوتی:

ـ جا هەڵەی ئێمە ڕێك لێرەدایە. کاکی برا خۆ ئەتۆ لە دەستەی ئەو کەسانە نیت کە هێشتا نەهاتبێتە دونیا، چارەنووست دیاریی کرابێ. ئێمە نابێ چارەنووسی خۆمان بسپێرینە دەست هات و نەهات. تەلەفونەکەی هەڵگرت تا داوای چایی هێنان لە چایخانە بکا.

بەڵام من پێمگوت:

ـ کاکە نەبەز! من چا ناخۆمەوە و ئەرکێکی بە پەلەم لەبەرە و پێویستم بە یارمەتیتە.

زۆر بە کورتی حاڵ و حەکایەتی شێرزادم بۆ گێڕاوە.

ـ کاك شوان! تا ئەو نەخۆشە نەبینم و عەکسی بە تیشکی لێ نەگیرێ، یان پشکنینێکی وردی بۆ نەکەم، ناتوانم لە دوورەوە ڕای خۆمی لەسەر دەربڕم، یان دەرمانی بۆ بنووسم.

ـ ئەی چار چییە؟

ـ بارودۆخ لێرە گەلێك ئاڵۆزە. هاتنتان بۆ ئێرە بە مانای تێداچوونتانە. من دەتوانم دوکتۆرێکی لێزان و کارامەت پێ بناسێنم، کە هاوڕێی دێرین و جێگای بڕوای خۆمە. ئەو جێگای ژیانی لە شاری ئیلامە و بەیانییان لە نەخۆشخانەی دەوڵەتی کار دەکا و پاشنیوەڕۆیانیش لە مەتەبی تایبەتی خۆی. بە نووسراوە ناتوانم هیچی بۆ بنووسم، بەڵام تەلەفونی بۆ دەکەم و

ناوەکانتانی دەدەمێ. دوکتۆر نەبەز هێندێك دەرمانی هێورکردنەوەی پێدام و گوتی:

- پێشنیارت پێدەکەم کە لە جیاتی ماشێن، بە پێیان و لە ڕێگای شاخەوە بگەڕێوە بۆ ماڵەوە.

دەرمانەکانم لێوەرگرت، دووپێم بوون، دووی دیکەشم قەرز کردن و لە کەڵەگا ڕێگاکەی پشتی شارەوە خۆمم دەربازکرد و بۆ درەنگانێکی شەو گەیشتمەوە ماڵ. نەمدەزانی ماندوویی چییە. پاش حەسانەوەیەکی کورت ، هێندێك کەلوپەلی سەرەتاییم کۆکردنەوە و خۆم تەیار کرد بۆ ڕۆژی دوایی. دایکم لە ماڵ نەبوو و شەوانە لە لای بێگەرد دەنووست. بەیانی زوو بەرەو ماڵی بێگەرد وەڕێ کەوتم و لە دەرگام دا و لە خەوم هەستاندن، پاشان چۆنیەتی گەڕانەوەی خۆمم بۆ گێڕانەوە. بە بێگەردم گوت:

- وام داناوە بڕۆم بە دوای شێرزاد دا و بیهێنمەوە. ئەتۆش خۆت سازکە هەم بۆ پێشوازی و هەمیش بۆ سەفەرێکی تا ڕادەیەك دوور و نادیار، بێ ئەوەی هیچ کەس پێت بزانێ.

پاشان هێندێك پێخۆرم هەڵگرت و ڕێگای زستانەم بەرەو داڵەهۆ گرتە بەر. هێشتا دووسەد گەزێکم مابوو کە لە دێ وەدەرکەوم، تووشی خوشکە سەیران هاتم کە منداڵێکی تەمەن سێ ساڵی بە کۆڵەوە بوو. بەیانی باشم لێکرد و لە وەڵامدا گوتی:

- هەموو کاتێکت باش برا شیرنەکەم. ئەوە ئۆغرە بەم بەیانییە زووە؟

- گەلێك وەڕەزم و دەمەوێ سەرێك لە گوندی یاران هەڵخەم و لەوانەشە سەرێکیش لە گوندی پیران هەڵێنم.

منیش لێمپرسی:

ـ خۆ شوکور منداڵەکەت گەورە بووە، بۆ لێی ناگەڕێی بە پێی خۆی بڕواتە ڕێوە؟

ـ شوانە گیان! بەو قەبرەی کە باوکی بە تاوات نەگەیشتووتی تێدایە، لە من چارەڕەشتر لەو سەربساتە نابینیەوە.

منیش کە ڕێگام لەبەردا بوو، نەمدەویست ڕاوەستم، چونکە دەمزانی کە سەیران دونیایەك دەردە دڵی پێیە. ئەو لێمهاتە پێش و هەردووك دەستیگرتم و جار بە جار گوشاری دەدان و گوتی:

ـ برا نازدارەکەم! ئەم کوڕەم ناتوانێ بۆ تەنیا چرکەیەك لەسەر زەوی دانیشێ. ئەوە نازانم بەرد بە سەر قاچیدا بەربۆتەوە یان شتیکی دیکەی لێقەوماوە. لە پێرێ ئێوارێوە خوراسی لێبڕیوم. نازانم چ قوڕێك بە سەرمدا کەم.

ـ ناوی چییە؟

ـ لای خۆم ناوی شاهۆیە، بەڵام بە ناسنامە ناوی موحەممەدە.

ئینجا پرسیم:

ـ بۆ بە یەکجاری شاهۆ نەبێ؟

ـ ئەوەیان بە دەستی من نییە.

ـ ئەی بە دەستی کێیە؟

ـ نامەوێ وەدرەنگت خەم، چونکە بە سەر ڕێگاوەیت و لەوانەیە ئیشوکارت هەبێ، بەڵام کە لە سەفەرەکەت گەڕایەوە، ئەو کات بۆت دەگێڕمەوە کە ئەم کۆمەڵەی ئێمە بەرەو چ هەڵدێرێکەوە دەچێ.

ئەوم بەجێهێشت و ملی ڕێگام بەرەو بان داڵەهۆ گرتەبەر. هەورازەکانم هەر وەك لێژایی یەك بەدوای یەکدا دەبڕی. بە گەیشتنم بۆ سەر لوتکەی زستانە، بینیم بەفر شاخەکانی داپۆشیوە و هەواش گەلێك ساردە. نەموێرا دانیشم و شەکەتییەك دەرکەم، چونکە لەشم گەرم داهاتبوو و دەمزانی ئەگەر وچانێك بدەم ڕەنگە تووشی نەخۆشی بم. درێژەم بە ڕێگاکەمدا و بۆ تاوێك پاش نیوەرۆ، گەیشتمە نیزیك ئەشکەوتەکە. کاتێك ویستم چاوێك بە دەوروبەری ئەشکەوتدا بخشێنم، ئەو دەم وەبیرم هاتەوە کە دووربینەکەم لەگەڵ خۆم نەهێناوە.

بەبێ دەنگی خۆمم گەیاندە بەر ئەشکەوت. بینیم شێرزاد نووستوە. بەبێ کرچە، کەلوپەلەکەم دانا و جامیلکەیەکم ئاو خواردەوە. شەش تا حەوت تەل چیلکەم بە ئەسپایی لەسەر ئاگرەکە دانا. ئاگر بڵێسەی لێکەوت و گڕ و تینی ئاگرەکە شێرزادی لە خەو کرد. ئەو بە جارێك حەپەسا، بەڵام کە چاوی بە من کەوت، هاتەوە سەرخۆ.

هەواڵ پرسیم لێکرد و گوتم:

ـ کوڕی باش، دەمتوانی چەکەکەت هەڵگرم و بڕۆم.

شێرزاد هەستایە سەر پێ و دەستی لە ئەستۆ کردم، پاشان گوتی:

ـ بەسەری ئەم شوانە باری دەروونیم هێندە خراپە، لەوکاتەوە جێتهێشتووم بێجگە لە مردن، بیرم لە هیچی دیکە نەکردۆتەوە.

چایەکی دەمکرد و پێکەوە خواردمانەوە و چۆنیەتی ئەو سێ ڕۆژەی کە بەجێمهێشتبوو بۆ گێڕامەوە، پاشان منیش چۆنیەتی سەردانی دوکتۆر و وەڵامی تاقیکارییەکەی کرماشانم بۆ گێڕاوە. لە سەرەتاوە بڕوای نەدەکرد

که بێگەرد کارێکی وایکردبێ، بەڵام بە دوای هێندێك بەڵگە هێنانەوەدا، پێم سەلماند کە تاکو ئێستا زانست ڕاست و دروستبوونی ئەمجۆرە دیاردانەی نەسەلماندووە، کە ئەتۆ لەسەر خۆتت کردۆتە ماڵ. بە دوای ئەوەدا چۆنیەتی ڕاوێژکاریی خۆم و بێگەردم بۆ گێڕاوە کە چ گەلاڵەیەکمان بۆی هەیە.

کات لە دوای کات هەستم دەکرد کە وورەی شێرزاد لەو ماوە کورتەدا بە پلەیکی بەرچاو بەرز دەبۆوە، پاشان دەستمانکرد بە خواردنی هێندێك خواردەمەنی کە لەگەڵ خۆم هێنابووم، چەند کاتێکمان بە قسەکردن و پرسیار و وەڵام تێپەڕکرد و بە ئاوابوونی خۆر، بەرەو گوندی خۆمان داجماین. شێرزاد نەیدەتوانی لە بەرەوژێرەکان بەباشی بچێتە ڕێوە. ئەوەندەی ڕێمان دەپێوا، دوو ئەوەندە دادەنیشتین و هێشتا کوڵەبڕکێك لە شەوگار مابوو کە گەیشتینەوە نیزیك ماڵێ.

لە ڕێگادا بە شێرزادم ڕاگەیاند کە نابێ بە هیچ شێوەیەك لە بێگەرد توورە بێ، چونکە ئەو دووگیانە و هاکا منداڵی بوو، بێجگە لەوەش، لەوانەیە شوێنی خراپ لەسەر لەشساغی خۆی و منداڵەکەش دابنێ. شێرزاد ئەو متمانەی پێدام کە نەك هەر ئێستا، بەڵکو هەتا هەتایە ئەوە بە ڕووی بێگەرد دانەداتەوە.

کە گەیشتینە دەرگای ماڵ، لەبەر ئەوەی کەس پێمان نەزانێ لە دەرگای حەوشەمان نەدا. من چوومە سەر شانی شێرزاد و لە دیواری حەوشە وەسەرکەوتم. بە سەر پاسارەکەدا چوومە سەربان و بە پلیکانەکاندا هاتمە خوار، دەرگام لە شێرزاد کردەوە. زۆر لە سەرەخۆ لە دەرگای ژووری نووستنمان دا. دایکم کە بە شەوانە لە لای بێگەرد دەنووست، پرسی:

- کێیە؟

بە ئەسپایی وەڵامم دایەوە:

- خۆمانین.

هەرکە دەنگی ناسیمەوە دەرگای لێمان کردەوە و چووینە ژوورەوە. لە پچە پچی ئێمەڕا بێگەرد لە خەو هەستا. کە چاوی بە ئێمە کەوت، باوەشی بۆ شێرزاد کردەوە و ئەملاو ئەولای ماچ کرد.

پاش هێندێك حەسانەوە، من پێشنیارم کرد کە ماندووین و پێویستمان بە خەو هەیە. گورج جێگامان ڕاخست و لە چاوتروکانێکدا خەومان لێکەوت.

کاتێك لە خەو هەستام، زۆری نەمابوو بۆ نیوەڕۆ. هەر ئەو دەم دوو بابەتم لێ ببوونە ختورە. یەکەمیان، بەڵێنم بە چنار دابوو کە پێوەندیی پێوە بگرم. دووەمیش چاوم بە خوشکە سەیران بکەوێ.

پاش ئەوەی بەرکولێکمان خوارد، لەسەر ئەوە ساخ بووینەوە کە نابێ هیچکەس بە هاتنەوەی شێرزاد بزانێ، چونکە پێشتر ڕامان گەیاندبوو کە لە کورەخانەیەکی شاری سنە کار دەکا.

بە دەرفەتم زانی کە لەپێشدا چاوم بە چنار بکەوێ. ئەم کارە بە چەند هۆیەك هەر وا ئاسان نەبوو، هەر بۆیە دەبووا لەپێشدا لەگەڵ دایکم چووباین بۆ ماڵی دادە جەیران و مامۆستا جوامێر، تاکو بە بۆنەی سەردانەوە چناریش ببینم و بە دوور و درێژی قسەم لەگەڵ کردبا، کە ئەمەش بەو دەم ودەستە نەدەکرا. هەر بۆیە پێشنیاری سەردان بۆ لای خۆشکە سەیرانم خستە بەردەست دایکم. ئەویش پەسەندی کرد و گوتی:

ـ پێشنیارەکەم پێباشە و با شێرزاد و بێگەردیش بە دوو کەسی بن. لەوانەیە ئەوان دەردە دڵ یان شتێکی تایبەتییان هەبێ، چونکە دەمێکە لێکدابڕاون.

من و دایکم دوو بە دوو بەرەو ماڵی سەیران وەڕێ کەوتین، کە گەیشتینە دەرگای ماڵیان، وەکو دەستە گوڵێك هات بە پیرمانەوە، هێندە ڕووخۆش و لەسەر دڵان و خۆنەویست بوو، کە لە گێڕانەوە نایە، بە جارێك هەستم بەوە دەکرد کە لەوانەیە چاوەڕوانییەکی لە ئێمە هەبێ. بە تایبەتی کە هێندە تەنگ دەست بوون، کە تەنیا بەڕەیەکی ڕەقیان وەك ڕاخەر لە ژێردا بوو. دەستبەجێ ئاوی کوڵاند و چایەکی دەم کرد. کاتێك چایەکانی هێنا، چەند دانەیەك هەنجیری ڕەقی لەنێو قەندانێك دا لەبەر دەستمان دانا.

بەر لەوەی چایەکان دابنێ، گوتی:

ـ داوای لێبوردنتان لێدەکەم، باوەڕتان بێ ئەوە زیاتر لە دوو مانگە نە شەکر و نە قەندمان نییە.

من چایەکەم بە هەنجیرە ڕەقەکەوە خواردەوە، بەڵام دایکم پێی نەخورایەوە. بە دوای ئەوەدا منداڵەکەی هێنا و قاچی پێشان داین کە گەلێك ئاوسابوو، پرسیم:

ـ بە دوکتۆرتان پێشانداوە؟

ـ دوکتۆری چی بە سەدەقەت بم. دەستکورتی دەرفەتی سەردانی دوکتۆرمان پێنادات.

دایکم زەختی خوێنی چووبووە سەرێ. داوای ئاوی کرد تاکو دەرمانەکەی بخوا. ئەو لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و تاکو سەیران ئاوی هێنا، پێی گوتم: «قاچی ئەم منداڵە تەشەنەی کردووە و دەبێ سەردانی دوکتۆر بکا».

گوتم «بۆ خۆت دەزانی من خەریکم بە کێشەی نەخۆشیی شێرزادەوە. کەوابێ باشترە بۆ خۆت لەگەڵ سەیران دا شاهۆ ببەن بۆ شار و سەردانی دوکتۆر بکەن.

سەیران ئاوی هێنا و دایکم لەگەڵ خواردنەوەی دەرمانەکانی خەوی لێکەوت.

خاتوو سەیران مەوجێکی کوردی و ڕەنگاوڕەنگی دەستکاری جۆلای خۆماڵی پێدا دا. ئەو کە دەیزانی ئێمە هاتووین تا گوێڕایەڵی دەردە دڵەکانی بین، هاتە تەنیشتمەوە و دانیشت. زۆر لە سەرەخۆ دەستی کرد بە گێڕانەوەی بە سەرهاتی خۆی و ناسنامەی کوڕەکەی کە بۆچی دوو ناوەیە بەمجۆرە دەستی پێکرد:

ـ شوانە گیان! کەس بە حاڵی ئێمە نەبێ.بۆ خۆت دەزانی بارکی شاهۆی بە موحەممەد کراویان ساڵی ڕابردوو لە سێدارە دا. تاوانی ئەو ئەوە بوو کە چووبووە شاری مەهاباد و چەند وێنەیەکی ڕێبەرانی حیزبەکانی کوردی " ئەوانەی بۆ خۆتان پێیان دەڵێن گۆپاڵی ئیمپریالیست"، لەوێ لەگەڵ خۆی هێنابوو. لە کاتی لە سێدارەدرانی دا و ئەو کاتەی کە حوکمەکەیان خوێندەوە، ئەم دوو تاوانەیان دایە پاڵی. یەکەم هەڵگرتنی وێنەی دژی شۆڕش و دووەمیش هەڵگرتنی ناوی دژە شۆڕش، چونکە لەو

هاتوچۆکردنەی بۆ شاری مەهاباد، نازناوی وریای بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. لەوانەشە بۆ خۆت بزانی، کاتێك شاهۆ لە دایك بوو هێشتا کوڕی قەزاق لەسەر دەسەڵات بوو. ئەوەدەم باو بوو کە سجیلبڕەکان هەموو گوندەکان دەگەڕان و ناسنامەیان دەدا بە منداڵان. هەڵبەت ئەوەش لەبەر دڵسۆزیی و مرۆڤ خۆشەویستی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە دوای گەورەبوون بیانباتە ئیجباری و شەڕیان پێ بکەن، بێجگە لەوەش هێندێك پارەش بە بەرتیل وەرگرتن بۆ خۆیان تەڵەکە بکەن. ئەوکات کە سجیلبڕ هاتن بۆ ئێرە، جوانەمەرگی مێردم داوای کرد کە ناوی بنرێ شاهۆ، بەڵام کابراکە ناسنامەی بۆ نەنووسی و گوتی ناوی ئەم منداڵە دەنێین موحەممەد ڕەزا و لە دەفتەری ناونووسیشدا دەینووسین. هەرئەوکاتیش خەڵکی ئێرە بە مەبەستی ناسنامە وەرگرتن بۆ منداڵەکانیان لە ماڵی کوێخا کۆ ببوونەوە و گوێیان لە قسەکانی کابرا بوو. ئێمەش بڕیارمان دابوو بێجگە لە شاهۆ، چ ناوێکی دیکەی لەسەر دانەنرێ. ئێستا بەو بۆنەوە کە کابرای ناسنامەوان گوتوویەتی ناوی دەنێین موحەممەد ڕەزا. خەڵکی بە موحەممەد بانگی دەکەن و بەبێ ئەوەی بۆ خۆمان ڕازی بین، ئەم ناوەی بەسەردا بڕاوە. شوانە گیان! من هەر ئەوکات بە جوانەمەرگی مێردمم گوت کە ئەم ناوە زۆرەملیە ناوی حەمەڕەزاشایە و دونیاش خراپ بێ، لەسەر ئەم کوڕەی دانانێم. ئەوەشم گوت ئەگەر پێویست بێ، ئێرە بەجێ دێڵم و کۆچ دەکەم بۆ جێگەیەکی دیکە" تەنیا لەبەر ئەوەی ئەم ناوە نەبڕێتە سەر منداڵەکەمانەوە. ئیتر ئەوە بوو کە بە خۆشییەوە پاش ساڵێك شا ڕووخا و ئێمەش وەك زۆربەی خەڵك هەناسەیەکی ئاسودەمان هەڵکێشا. پاش

ڕووخانی شا، کاتێك بارودۆخەکە هێندێك هێور بۆوە، دەرفەت نەبوو ناسنامەی بۆ وەربگرین. بە دوای ئەوەشدا سەربازەکانی خودا تەنیا بە فیشەکێك هەزاران ئاواتی مێردەکەمیان لەگەڵ خۆی ناشتە ژێر گڵەوە و شاهۆش بێکەس و هەتیو کەوت. شوانە گیان! بریا هەرئەوەدەم منیشیان کوشتبا و شاهۆ یەسیریش کەوتبا. ئیتر بە دوای ئەو کۆسەڵکۆسەدا، دوو مانگ لەمەو بەر شاهۆم لەگەڵ خۆ برد و چووینە ئیدارەی سجیلحەواڵ لە شاری سەرپێڵ. لەوێ لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتین، تاکو نۆرەمان گەیشت. پاش چاوەڕوانییەکی زۆر بانگیان کردمە ژوورێکەوە کە کابرایەکی ڕیش پانی لێدانیشتبوو. لام وابێ حاجی قورقوشمی ناو بوو. من زمانی فارسیم نەدەزانی و ئێستاش هەر نازانم. کوردێکیان بانگهێشت کرد کە قسەکانمان بۆ وەرگێڕێتەوە، واتە لە کوردییەوە بۆ فارسی و بە پێچەوانەش. حاجی لە ڕێگای وەرگێڕەوە پرسی: "بلێ بزانم کارت چییە؟". منیش گوتم: «هاتووم سجیل بۆ ئەم کوڕەم وەربگرم». پرسی: «کوڕی کێیە؟». گوتم: «هەتیوە و باوکی نەماوە»، پاشان پرسی: «خۆی نەماوە، بەڵام ناوێکی هەبووە؟». گوتم: «بەڵێ، ناوی باوکی وریا بوو، ناسراو بە وریا نانەوا». پرسی: «خۆت چیت ناوە؟». گوتم: «ناوم سەیران باپیرییە». ئەو جار پرسی: «دەتەوێت چ ناوێك لەسەر منداڵەکەت دانێی؟». گوتم: «باوکی وەسیەتی کردووە کە ناوی بنرێ شاهۆ، بۆ خۆشم هەر ئەو ناوەم پێخۆشە و هەر لەبەر ئەوەشە کە تا ئێستا بەبێ ناسنامە ماوەتەوە». پرسی: «لە بەرچی زووتر ناسنامەتان بۆ وەر نەگرتووە؟». لە وەڵامدا گوتم: «سجیل ئەحەواڵی حەمەڕەزاشا بەو ناوەی کە ئێمە هەڵمان بژاردبوو

ناسنامەیان پێنەدا و ئێمەش کە دەمانزانی ئەو، ها لە پەلەقاژەی ڕووخاندا، هێندە گوێمان بۆ شل نەکردن». کابرای ڕیشپان بە وەرگێڕەکەی گوت: "پێی بڵێ کاتی نوێژی نیوەڕۆیە و من دەچم بۆ مزگەوت. تا من لە نوێژی نیوەڕۆ دەگەڕێمەوە، بنەچەکەی ئەم ناو و بنەماڵەیەم بۆ دەربێنن".

ئینجا ئەو چوو بۆ نوێژکردن و ئێمەش لە دیوی چاوەڕوانیدا ماینەوە. هیوادارم سەرم نەئێشاندبی شوانە! جێگای چاوەڕوانیەکە تەنگ و تورش بوو، شاهۆ چلوفلی دەکرد و بەم لاو بەو لادا هەڵ دەهات. لە بەرانبەر هۆڵی چاوەڕوانیدا، ژوورێکیان هەبوو کە شاهۆ خۆی پێدا کرد. هەر ئەوەندەم زانی سی تا چل دانە قوڕی ویشکی پان پانی لە کارتۆنێکی جێگای کولیچەدا هێنا. ئەم قوڕبەسەرە پێی وابوو کە کولیچەی خواردنە. لەپێشدا قەپی لە دوو، سێ دانەیان دابوو و شکاندبوونی، پاشان بۆی دەرکەوتبوو کە خواردەمەنی نییە، ئەو جار بەم لاو بەو لادا هەڵی دەدان و خلخلانێی پێدەکردن. زۆری پێنەچوو کە جل شۆڕ لەبەرێك هاتە پێشم و پێی گوتم: «ناتوانی ئەم چڵەپەڕ بووە بگری؟ نابینی چۆن هەموو بەردە نوێژەکانی شکاندووە و بەملاو بەولادا هەڵیان دەدا. خۆ کوێر نیت، ئەوانە بەردە نوێژن بەردە نوێژ، نەك کەرەستەی کایە پێکردنی منداڵان بۆ بەردەقانی».

منیش هەستام هەموو قوڕە پان کراوەکانم کۆ کردنەوە و لە کارتۆنەکەم هاویشتنەوە. لەو قسانەدا بووین کە حاجی قورقوشم لە نوێژکردن گەڕایەوە. پاش چەند خولەکێك بانگی کردمە ژوورەوە. بۆ خۆی لەگەڵ وەرگێڕەکە لەوێ دانیشتبوون. بەڵگەیەکی لەبەر دەستدا بوو کە

دای بە دەست وەرگێڕەکەوە و پێی گوت: «ئەم نووسراوەیە بخوێنەوە و پاشان وەریگێڕەوە سەر زمانی کوردی بۆ سەیران». وەرگێڕ نووسراوەکەی لێوەرگرت و پاش ئەوەی بۆ خۆی خوێندییەوە، ڕووی لە من کرد و گوتی: «موحەممەد چاوەشی کوڕی موحەممەد خەڵکی درەهەنار و بە ڕەچەڵەك ئێرانی، بەڵام ناموسوڵمان. ناوبراو بە تاوانی دژایەتی لەگەڵ خودا و نێردراوی خودا، لەلایەن دادگای شۆڕشەوە لە سێدارە دراوە. ئەم دژەشۆڕشە ناوی پیرۆزی موحەممەدی لەسەر خۆی لابردووە و بە ئارەزووی خۆی ناوەکەی کردووە بە وریا. واتە ناوێك کە دژەشۆڕش بۆی هەڵبژاردووە. نابێ هیچ یارمەتییەکیان پێ بکرێ و ئەمانە لە تاقمێکن کە خاك و وڵاتی پیرۆزی ئێرانیان گلاو کردووە و دەیانەوێ پارچە پارچەی بکەن!

هێشتا وتەکانی وەرگێڕ کۆتایی نەهاتبوو، ڕووم تێکرد و گوتم: «نووسراوەکە ناتەواوە و فرێشی بە لای ڕاستیدا ناچێ، پێمباشە ئەو بەشەیان کە ئێوە پێی ناوێرن و بە سەریدا تێپەڕیون بۆتان تەواو بکەم».

حاجی لە وەرگێڕەکەی پرسی: «سەیران چ دەڵێ؟». وەرگێڕ پێی گوت: «سەیران دەڵێ کە ئەو نووسراوەیە پڕە لە بوختان و درۆ، بێجگە لەوەش گەلێك ناتەواوە». حاجی بە وەرگێڕی گوت: «با ئەو بەشەی کە ناتەواوە سەیران تەواوی بکا».

منیش گوتم: «ئەوەتان نەنووسیوە کە ئێمە کوردین و خەڵکی کوردستان، نەك ئێرانی، بێجگە لەوەش سەر بە ئایینێکی کۆنی کوردانین، کە گەلێك لە ڕێ و ڕەچەی عەرەبی جیاوازە. هەر لەبەر ئەوەشە کە نە

فارسی دەزانین و نە عەرەبیش. لەوانەش دەرچێ، وریا کورد بووە و ئێوە ویستتان بە زۆر بیکەن بە فارس و هەر بەو بیانویەشەوە لە نێوتان برد».

وەرگێڕ مقێکی کرد و قسەکانی منی گێڕاوە: بۆ حاجی. بەدوای هێندێك مڵ جەڕداندا، بۆڵەیەکی لێهات، کە وابزانم جنێوێکی دا بە خۆی، پاشان لە ڕێگای وەرگێڕەوە ئاگادار کرامەوە کە ناوی شاهۆ بۆ ئەم منداڵە نایاساییە و دەبێ ناوی بنرێ موحەممەد. منیش بە بیستنی ئەو وتەیەی حاجی، بە جارێك مچوڕکێك لەشی داگرتم.

ڕیشپان خەریکی نووسینی ناسنامەکە بوو، کە بە وەرگێڕەکەم گوت: «پێی بڵێ با جارێ نەینووسێ، چونکە دیسان قسەم بۆ گوتن هەیە».

حاجی گوتی: «پێی بڵێ با چی هەیە باسی بکا، بەڵام لەوە زیاتر دەمدرێژی نەکا».

گوتم: «ئەگەر ناوی ئەم منداڵەش بنرێ موحەممەد، ئەوە دەبێتە سێیەمین پشتیان کە ناویان موحەممەدە». حاجی چاوێکی تیق و فاق کرد و پرسی: «لەبەر چی وا بووە؟».

گوتم: «کاتی خۆی باپیرەیان لە شاری کەرکوك بەدونیا هاتووە. ئەوکات ئەو ناوچانە لەبەر دەست عوسمانییەکاندا بووە و هەر وەك ئێستا ناو هەڵبژاردن بە دەستی خۆیان نەبووە و لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەوە، نێوی موحەممەدیان لەسەر داناوە. سەبارەت بە موحەممەدی دووەمیش، لە کاتێکدا کە دایکی بەوەوە دووگیان بووە، بابی لە شەڕی داگیرکاری عەرەباندا هەر لە کەرکوك کوژراوە. بە بۆنەی خۆشەویستی باوکیەوە و نەك هی ناوەکەیەوە، کاتێك ئەم لە دایك بووە ناوی ئەویان

گرتۆتەوە، بەڵام جوانەمەرگی مێردم حەزی لە ناوەکەی نەبوو، نازناوی وریای بۆ خۆی هەڵبژارد، کە بۆ خۆتان کوشتتان. ئێمە پێشتریش لە ڕقی ناوی کوڕی قەزاق دا و عەرەبی بوونی ناوەکە، ئەو ناوەمان تۆڕهەڵداوە و ئێستاش ڕەوا نییە کە ناوی موحەممەدی بەسەر دا داسەپێنن».

کاک شوان گیان! لە درێژەدا پێمگوت: «خۆ ئێستا بە ناشوکری نەبێ نە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانین و نە هی عەرەبانیش. خۆ کوڕی قەزاقیش ڕووخاوە و بۆ خۆتان ببڕ و بکوژن. ئیدی چۆن بە ڕەوای دەزانن ئەم نێوە عەرەبییەی لەسەر دانێن و بۆ سێ پشت ناوی موحەممەد هەڵگرین؟». حاجی کە زۆر تووڕە دەهاتە بەر چاو گوتی: «چارەنووسی ئەم منداڵە نابێ وەك هی ئێوە بێ. ئێستا کە وایە، بۆتان هەیە لەم چوار ناوە، یەکیان هەڵبژێرن. یەکەم موحەممەد و نەك موحەممەد ڕەزا، مێهدی، حوسێن یا عەلی».

شوانە گیان، هەر کە زانیم بارودۆخەکە بەرەو خراپی دەچێ، گوتم، کەوابێ جارێ ڕادەوەستم و ناسنامەی بۆ وەرناگرم، بەڵکو ڕاسپاردەیەکتان سەردانی گوندەکەمان بکا، هەر بەو جۆرەی کە لە دەورانی شادا باو بوو.

بەڵێ، شوانە گیان! بە چارشێوەکەم شاهۆم بەستە کۆڵ و لە ژووری حاجی وەدەرکەوتین و قاوەخانەیەك لەو نیزیکە بوو خۆمان پێداکرد. نان و پەنیر و چای شیرینمان خوارد و یەك پاکەت کولیچەم بۆ شاهۆ کڕی و گەڕاینەوە بەرەو ماڵەوە. شوانە گیان! ڕاستە من خوێندەواریم نییە، بەڵام دەزانم سەر و بنی ئەم دونیا خوار و خلە چۆن دامەزراوە.

هێشتا گێڕانەوەی سەیران لەسەر چارەڕەشی و بەسەرهاتی خۆی، خۆشەویستە لە سێدارە دراوەکەی و منداڵە بەزۆر بە موحەممەد کراوەکەی تەواو نەبیوون، کە دایکم لە خەو هەستا. پاش ئەوەی ئاوێکی بە دەم و چاویدا کرد، بەبێ ڕاوەستان گوتی:

ـ سەیران هەستە خۆت وەڕێخە. دەبێ هەر چی زووترە ئەم منداڵە بگەیەنینە دوکتۆر.

سەیران خەریك بوو شتێك بڵێ، کە دایکم قسەکەی پێبڕیی و پێی گوت:

ـ پێویست ناکا نیگەرانی خەرج و شتی وا بی.

منیش کە لە دونیای خۆمدا دەژیام، لە دڵی خۆمدا دەمگوت، بە ڕاستی هێشتا زانیارییەکانم لەسەر گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگایەدا، هێندە لاوازن کە زیاتر وەك بێگانە دەچم، چونکە من لەم نابەرابەرییانە هیچم نەدەزانی. نەمدەزانی کە ئێمە مافی ئەوەشمان نییە کە ناوی دڵخوازی خۆمان هەڵبژێرین، کە سەرەتاییترین مافی هەر مرۆڤێکە." تا لێرە وەبیرم هاتەوە کە بۆچی ناوی منداڵەکانی لای ئێمە، لە ناوەکانی منداڵانی جێگاکانی دیکە ناچن".

وایلێهات کە دایکم لەگەڵ سەیران و منداڵەکەی بەرەو کرماشان وەڕێکەون. منیش دەبا ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەگەڵ بێگەرد و شێرزاد بەرەو شاری ئیلام وەڕێ کەوتبایەن. بەرلەوەی وەڕێکەوین، دەبا سەرێکی ماڵی خۆمانم دابا، تاکو جلەکانم گۆڕیبیان.

لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ ماڵ، تووشی مامۆستا جوامێر هاتم کە ئەویش بەرەو ماڵ دەچۆوە. پاش هەواڵپرسیی، خوڵقی کردم بۆ ماڵەوە. داوای لێبوردنم کرد و گوتم:

ـ ئێستا کارم لە پێشە و ناتوانم، بەڵام بەڵێن بێ لە گەڕانەوەدا سەردانت بکەم.

ماڵئاواییم لە مامۆستا کرد و چوومە ماڵ و جلوبەرگم گۆڕین. لە گەڕانەوەم بۆ لای ماڵی بێگەرد، چوومە دەرکی ماڵی شۆفێری ماشێنی گوندەکەمان. وامان دانا کە بە تاریك داهاتنی هەوا، لەو بەری گۆڕەپانی دێ چاوەڕوانی دەبین، پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵی بێگەرد و سەرو بابۆڵەیەکمان نان و سەوزی خوارد و جامێك دۆی ترشی کاسە هاوسێمان بەسەری دا کرد. تاکو شێرزاد و بێگەرد خۆیان ساز کرد تاریك داهات و منیش چوومە دەرگای ماڵی حوسێن و دیسان ناسنامەکەیم بە ئەمانەت لێوەرگرت. بە گەڕانەوەم بۆ لای ماڵی شێرزاد و بێگەرد دەفرێکی چوار لیتریمان پڕ لە ئاو کرد و لەگەڵ هێندێك پێخۆر بەرەولای ماشێن وەڕێ کەوتین. بە گەیشتنمان بۆ لای ماشێنەکە، شۆفێرەکە پرسیی:

ـ بەرەو کوێ لێخوڕم؟

ـ بێگەرد پاوە ڕۆژە و ژان دەیگرێ و ڕەنگە منداڵی ببێ. ئەگەر بۆت دەکرێ بمانگەیەنە شاری کرند "کرندی خۆرئاوا".

سەروملی شێرزادمان وەك هی ئافرەتان داپێچابوو بۆ ئەوە شۆفێرەکە نەیناسێتەوە. ئێمە سوار بووین و بۆ کاتژمێر حەوت و سی خولەکی ئێواری گەیشتینە شاری کرندی ڕۆژئاوا. کرێی کاکی شۆفێرمان دا و

سوپاسمان کرد. لە مەیدانچەی شار ماشێنێکی دەربەستمان بۆ شاری ئیلام بە کرێ گرت. درەنگانێکی شەو بەو ڕێگاوبانە پڕ پێچ و پلوچەدا گەیشتینە شاری ئیلام و چووینە هوتێلێك کە لە ناوەڕاستی شار هەلکەوتبوو. ئەو شەوە بە تەمای بەیانی نووستین. بەیانی کە هەستاین خۆمان کۆکردەوە و تا کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ هەر بیرمان لە چۆنیەتی سەردانی دوکتۆر کردەوە. کاتژمێر چارەك لە دووی پاش نیوەڕۆ لایدا بوو، بەو ژمارە تەلەفۆنەی کە دوکتۆر نەبەز لە سەرپێڵ پێی دابووم، تەلەفونم بۆ دوکتۆر زەردەشت کرد. سەرپەرشتیاری کلینیکەکەی دوکتۆر، خۆی ناساند و منیش پێمگوت هاوڕێی دوکتۆرم و دەمهەوێ لەگەڵ خۆی قسان بکەم.

زۆری پێنەچوو کە تەلەفۆنی دا بە دوکتۆر ومنیش وێرای هەواڵپرسی، ناو و نیشانی دوکتۆر نەبەزم لە سەرپێڵی زەهاو پێدا.

دوکتۆر زەردەشت بە بیستنی ناونیشانی دوکتۆر نەبەز، خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و پێی گوتم کاتژمێر پێنج وەرن بۆ لام.

لەو دوو ڕۆژەی دواییدا، شێرزاد گەشابۆوە و باری دەروونی بە پێچەوانەی باری لەشساغیی، بەرەو باشی چووبوو. وام هەست پێدەکرد کە بێگەرد بە وردیی چۆنیەتی تاقیکردنەوەکەی کرماشانی بۆ گێڕابۆوە و خەمی دووگیان بوونی بە یەکجاری لەسەر شێرزاد ڕەواندبۆوە. بە جۆرێك کە ئیتر کاریگەریی ئەو گوشارە دەروونییەی جارانی لەسەر نەمابوو.

ئێمە بە تێکڕا و لە کاتی دیاری کراودا گەیشتینە لای دوکتۆر زەردەشت. ئەو زۆر بە گەرمی بە خێر هاتنی کردین، هەواڵی دوکتۆر

نەبەزی پرسی و گەلێك لە ڕابردووی خۆیانی بۆ گێڕاینەوە. باسی ئەوەی کرد کە پێکەوە لە زانستگە بوون، پاشان بە شێرزادی گوت: «خۆت ڕووت کەوە و لەسەر ئەو قەرەوێڵە ڕاکشێ».

ئەو پشکنینێکی باشی بۆ ئەنجام دا و هێندێك پرسیاری چۆنیەتی ئێش و ئازاری لێکرد. ئەوجار دوو تاقیکاریی و وێنەگرتنی تیشکی بۆ نووسی. تاکو وڵامی تاقیکاری و وێنەی تیشکی هاتەوە، من هەر لە لای دوکتۆر دانیشتبووم. لەو ماوەیەدا دوکتۆر پێی گوتم کە هەستی بە شتێکی نائاسایی لە زگی شێرزاد دا کردووە، بەڵام جارێ چاوەڕوانی وڵامی تاقیکارییەکان و وێنە تیشکییەکە دەبێ.

پاش کاتژمێرێك وڵامەکان ئامادە بوون. چاوێکی لێکردن و گوتی:

ـ وێنە تیشکییەکە لکێك لە زگیدا نیشان دەدا کە ١٣سانتیم درێژایی و١١ سانتیم پانایی و٧ سانتیم ئەستوورایيەتی، بەڵام جێگای مەترسی نییە و لە شوێنێك هەڵکەوتووە کە نەشتەرگەری کردن لە سەری سانایە.

پاشان بێگەردی بانگ کردە ژوور و پێی گوتن:

ـ شێرزاد دەبێ لە نەخۆشخانە بخەوێ.

گورج نامەیەکی بۆ نووسی و بە تاکسی بە ڕێی کرد بۆ نەخۆشخانە، بە من و بێگەردیشی گوت کە بۆ ئێوارە میوانی خۆمانن.

ئێمەش پێمان گوت کە ژوورێکمان لە هوتێل بە کرێ گرتووە و نامانەوێ ببینە هۆی گیروگرفت بۆ ئێوە، بەڵام ئەو قبوڵی نەکرد و بۆ ئێوارێ لەگەڵ خۆی بردینییەوە بۆ ماڵ. ئەو شەوە ڕێزی باشی لێگرتین و کۆمەڵێك باسی لێرە و لەوێشمان کرد.

بەیانی زوو هەستاین و پاش خواردنی بەرچایی، لەگەڵ دوکتۆر بەرەو نەخۆشخانە وەڕێ کەوتین. لە ڕێگادا بۆی باس کردین کە ئەو لەگەڵ دوو دوکتۆری دیکە، نەشتەرگەریی بۆ شێرزاد دەکەن. ئێمە گەیشتینە نەخۆشخانە و بەر لەوەی شێرزاد ببەنە ژووری نەشتەرگەری، چاومان پێی کەوت و ورەمان خستە بەری. پاش ئەوەی ئەویان بردە ژووری نەشتەرگەریی، ئێمەش پیاسەیەکمان بە نێو شاری ئیلام دا کرد و پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ، بەر لەوەی بگەڕێینەوە بۆ نەخۆشخانە، سەردانی هۆتیلەکەمان کرد. بێگەرد زۆر هیلاك بوو، ئەو ناحەقی نەبوو، چونکە لە لایەکەوە بۆخۆی دووگیان و لە لایەکی دیکەشەوە بە تەنگی لەشساغی هاوسەرەکەیەوە بوو. تاکو ئەو چارێکی گەرمکرد و هێندێك حەسایەوە، تەلەفونم بۆ نەخۆشخانە کرد و پرسیاری چۆنیەتی حاڵی شێرزادم لێکردن. هەواڵێکی خۆشم گوێ لێبوو، نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو ببوو. کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ چووم بێگەردم ئاگادار کردەوە کە شێرزاد نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتووی بۆ کراوە.

ـ بە گیانی ئەم شوانەیە! تا بە چاوی خۆم نەیبینم، بڕوام نییە، چونکە تا ئێستا گوێم لێ نەبووە کە شێرپەنجە هەروا بە ئاسانی دەرمان کرابێ.

ـ جۆری شێرپەنجە لەگەڵ یەکتر جیاوازییان زۆرە بێگەرد. پاشانیش ئەو نەشتەرگەرییەی کە بۆی کراوە، ناکرێ بڵێین هەر وا بە ئاسانی بووە. ئێستاش خۆت ساز کە با سەردانێکی بکەین و لە نیزیکەوە چاومان پێی بکەوێ.

بێگەرد قەناعەتی هێنا و بەرە و نەخۆشخانە وەڕێ کەوتین. لە پرسگەی نەخۆشخانە خۆمان ناساند و پاشان کیژۆڵەیەکی لەسەردڵان وەپێشمان کەوت و جێگای حەوانەوەی شێرزادی پیشان داین. سوپاسی کیژۆڵەمان کرد و چووینە ژوور و لە پاڵ قەرەوێڵەکە دانیشتین. ئافرەتێکی گەلێك ڕێزدار هاتە تەنیشتمان و پێی گوتین: «باشتر وایە لەگەڵی نەدوێن، چونکە تازە وەهۆش هاتووەتەوە و لەوانەیە زۆر ماندوو بێ». ئێمە وچانێکی باش لای دانیشتین، بەڵام ئەو تەنیا لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد و جاروباریش تەکانێکی بە خۆی دەدا.

لەو دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و زەنگم بۆ دوکتۆر لێدا. سوپاسی زەحمەت و یارمەتییەکانیم کرد. دوکتۆر پێی گوتم کە شایانی نییە و ئەو دەبێ خزمەتی لەوە گەورەتر ئەنجام بدا. ئەو دیسان لێی گێڕاینەوە کە پێی خۆشە ئەمشەو پێکەوە بین و بۆ خۆی دێت و دەمباتەوە بۆ ماڵەوە.

بەدوای ئەوەدا من و بێگەرد گەڕاینەوە بۆ هوتێل. بەرلەوەی هەوا تاریك دابێ، دوکتۆر هاتە دەرکی هوتێل و هەواڵی تێپەڕبوونی مەترسییەکانی سەر ژیانی شێرزادی بۆ گێڕاینەوە.

من بێگەردم لە چوونم بۆ لای دوکتۆر ئاگادار کردەوە، بەڵام پێمگوت شەو دەگەڕێمەوە.

ئەوشەوە تا درەنگانێك لەگەڵ دوکتۆر، باسی کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانمان کرد. دوکتۆر نەیدەویست باسی چەپ و ڕاست بکەین. ئەو پێی وابوو کە ئێمە دەبێ لەپێشدا خۆمان پێناسە بکەین، تاکو بتوانین گەلانی دیکە بناسین. ئەو بەبێ پەردە دەدوا و دەیگوت:

"داتاشینی تیۆری گەلێك هاسانە، بەڵام چەسپاندن و دابەزاندنی ئەو تیۆرییە پێویستی بە لێزانی و گەشەی کۆمەڵ هەیە". من گەلێك"تۆخس" بووم و وێنەیەکم لە خۆڕاگریی توودەییەکان!؟ هێنایەوە کە لە کاتی دادگاییکردنیاندا لە بەندیخانەکانی حەمەڕەزا شا دا لە خۆیان نیشانیان دابوو، ئینجا گوتم:

ـ کاك دوکتۆر! لە بیرت نەچێ چۆن لە بەرانبەر کاربەدەستانی ساواك و بێدادگاکانی ئەواندا خۆڕاگرییان کردبوو و دادگایان بە چۆك داهێنابوو.

هێشتا لێدوانەکەم تەواو نەکردبوو کە دوکتۆر لە کوورە دەرچوو و گوتی:

ـ ئەوەی ئەتۆ باسی دەکەی نووسراوەیە و لەگەڵ ڕاستییەکاندا جیاوازییان زۆرە. مێژوو ئەوەیە کە ڕوویداوە، نەك ئەوەی کە نووسراوە. بە بێشك ئەوەش دەزانی کە هیچ کەس لەو دونیایە نادۆزیتەوە کە بە دژی خۆی شت بنووسێ.

ئەو هێندێك زیاتر چووە نێو قووڵایی باسەکە و گوتی:

ـ دەزانی دەسەڵاتدارانی تازەپێگەیشتوو چ لەسەر ئێمە دەنووسن؟ ئەوە نییە هەموو ڕۆژێك بە دەیان تاوانمان دەدەنە پاڵ و هەر بۆخۆشیان مێژوومان بۆ دەنووسن. گەلێك ئاساییە کە هیچ کەس نە بە دژی خۆی و نە بە دژی دەسەڵاتەکەشی شتی خراپ نانووسێ!

تا درەنگانێکی شەو درێژەمان بە ئاڵوگۆڕی بیروڕاکانمان دا. من دەبا هاتبامەوە بۆ هوتێل، چونکە بێگەرد لەوێ بە تەنێ مابۆوە و لەوانە بوو کە دڵی بێشێ کە بە جێم هێشتبوو، بێجگە لەوەش باسەکانی دوکتۆرم بە

دڵ نەبوون، چونکە بۆم دەرکەوت کە ئەو لایەنگری مەسەلەی نەتەوەییە و دژی ئەوەیە کە من بڕوام پێی بوو. ئەو نەیدەشاردەوە و دەیگوت: «بۆ من ئایدیۆلۆژی مانایەکی دیکەی هەیە، جا ئەو ئایدولۆژییە چەپی بێ، یان ڕاستی و ئایینی».

درەنگانێکی شەو دوکتۆر منی گەیاندەوە هوتێل و لە ڕێگادا پێی گوتم کە بەیانی زوو سەردانی شێرزاد دەکا و ئەگەر ئاڵوگۆڕی باشی بە سەردا هاتبێ، بۆمان دەنووسێ کە بیبەینەوە. ئەو پێی وابوو کە شێرزاد دەکرێ لە شارێکی نیزیکی خۆمان لە پارێزگای کرماشان لەژێر چاوەدێریدا بێ، چونکە نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتووی بۆ ئەنجام درابوو. ئێمە شەو خۆشیمان لە یەکتر کرد و من بۆ ژووری نووستن لە هوتێل وەسەرکەوتم.

دەرگای ژوورەکەم کردەوە و چوومە ژوورەوە. هێشتا جلەکانم لەبەر دەرنەهێنابوو، کە لە دەرگای ژوورەکەم درا. دەرگام لێکردەوە، دەبینم بێگەردە. لێمپرسی:

- لەبەرچی نەنووستووی؟

- لە لایەکەوە نیگەرانی درەنگ هاتنەوەی تۆ بووم و لە لایەکی دیکەشەوە پێم وابوو کە دەبێ شتێك بەسەر شێرزاد هاتبێ بۆیە وا درەنگ گەڕاویتەوە.

من بۆم گێڕاوە کە دوکتۆر گوتویەتی نەشتەرگەریی لەسەر شێرزاد سەرکەوتووانە ئەنجام دراوە و ڕەنگە بەیانی پاش چاوپێکەوتنی دوکتۆرەکان، بەڕێمانکەنەوە بۆ کرماشان. بێگەرد هیوای خواست وابێ،

بەڵام بە گومان بوو کە ڕاستم لەگەڵ کردبێ، چونکە درۆکردن لەو جۆرە پێشهاتانەدا و لە کولتوری ئێمەدا تا ڕادەیەکی زۆر باو بوو. بەتایبەت سەبارەت بە کارەساتی مەرگ و تێداچوون.

ئەو گەڕایەوە ژووری خۆی و منیش بە دەیان پرسیاری بێ وەڵامەوە، چوومە نێو جێگا. گەلێك تێکۆشام بنووم، بەڵام بێکەڵك بوو. یەکێك لەو پرسیارانەی کە مێشکمی بە خۆیەوە خەریك کردبوو، ئەوە بوو کە دوکتۆر چۆن لە ئێمە تێگەیشتبوو. من لام وابوو کە ئەویش لە خۆمانە. واتە لەگەڵ هێزی چەپە و دژی ئیمپریالیستە و بەو جۆرە دەیەوێ خزمەت بە ڕێکخراوی خۆمان بکا، بەڵام دەسبەجێ دەکەوتمەوە بیری قسەکانی. ئەو دەیگوت: «ئێمە دەبێ لەپێشدا خۆمان پێناسە بکەین تاکو بتوانین ئەوانی دی بناسین، داتاشینی تیۆری گەلێك ئاسانە، بەڵام چەسپاندن و گونجاندنی لەم کۆمەڵە دواکەوتووەی ئێمەدا گەلێك حاستەمە». ئەوانەم گەلێك لێ گرینگ بوون، کە دەیگوت: «دەسەڵاتدار قەد بە دژی خۆی شت نانووسێ». بەر لەوەی چاوم بچێتە خەو، بڕیارمدا بە هەر چەشنێك بێ لە دوکتۆر تێبگەم.

بەیانی هەستام و ئاوێکم بە خۆمدا کرد، پاشان بێگەردم بانگ کرد و پێکەوە چووینە خوارەوە و قاوەڵتیمان کرد و بەدوای ئەوەدا بەرەو نەخۆشخانە وەڕێ کەوتین. کاتژمێر دە و چارەکی سەرلەبەیانی بوو. بە گەیشتنمان بۆ بەر دەرکی نەخۆشخانە، خاتوونێك ڕێنوێنی کردین تا دەرکی ژووری حەوانەوەی شێرزاد. کە چووینە ژوورەوە، دەبینین ڕدێنی تاشراوە، جلی خاوێن و جوانی لەبەرکراوە، جامێك شۆرباوی لەبەر

دەستدایە و پەیتا پەیتا بە کەوچکێکەوە لێی ڕانیشتووە و یەك بە دوای یەکدا هەڵیدەلوشێ. کە چاوی بە ئێمە کەوت، دەستی ڕاگرت و بەیانی باشی لێکردین.

بەرلەوەی بێگەرد بێتە زمان، من پێمگوت: «وا دیارە خۆشت ڕابواردووە، هەربۆیەشە نیوەڕۆت لێ بووەتە بەیانی». پێکەنی و گوتی:

ـ بە گیانی شوان هێشتا باوەڕم نایە کە لەو مەینەتە ڕزگارم بووبێ و لام وایە خەون دەبینم. بەبێ حورمەتی نەبێ، دوێنێ ئێوارێ دەعبایەکیان پێشان دام کە بە قەد گیسکێك دەبوو. دوکتۆری کێشکی شەوانە لەگەڵ چەند ئافرەتێکی سەرپەرشتیار پێیان گوتم کە ئەوە لە زگمدا بووە و ئەگەر تا دوو مانگی دیکە مابا، چارەسەر نەدەکرا. شوان خۆت و ویجدانت ڕاست بڵێ، حەقم بەدەست نەبوو کە وا هەست بکەم کە دووگیان بوومە؟

ئێمە لەو قسانەدا بووین کە دەستەیەك دوکتۆر و سەرپەرشتیار هاتنە ژووری جێگای حەسانەوەی شێرزاد و دوکتۆر زەردەشتیشیان لەگەڵ بوو. پاش هەواڵپرسی، پشکنینێکی باشیان بۆ شێرزاد کرد، پاشان دوکتۆر زەردەشت بە فارسی پێی گوتین، لای شێرزاد بمێننەوە تاکو بۆ خۆم دەگەڕێمەوە بۆ لاتان. لام سەیربوو کە دوکتۆر بە فارسی لەگەڵمان دووا، بەڵام دەستبەجێ وەبیرم هاتەوە کە زمانی ڕەسمی لە وڵات و لە دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا بە فارسییە. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە نەیتوانیوە بە کوردی لەگەڵماندا بدوێ. پاش پشکنینی شێرزاد، دەستەی دوکتۆرەکان وەدەرکەوتن و ئێمەش درێژەمان بە باسەکانمان دا، بەڵام گەلێك لام نامۆ بوو کە بێگەرد هێشتا زمانی نەبزواندبوو. پرسیم:

- بۆ وا بێدەنگی؟
ئەو کە دەستەوەستان مابوو، گوتی:
- نازانم بلێم چی، ئاخر ئێمە دار و نەدارمان دوو بەڕە و سێ لێفە و چوار باڵشت و مەوجێکە. لێم ناپرسی کێ دەبێ پارەی ئەم هەموو هاتووچۆیە و ئەو هەموو دەرمانە و ئەو لە هوتێل خەوتن و نانخواردنانە و زۆر شتی دیکە بدات؟ ئێمە کە لە تەواوی ژیانمان خاوەنی هیچ نین، بە چ هیوایەکەوە دەبێ بچینەوە بۆ شاریکی نیزیکی خۆمان. تازە لە هەمووی گرینگتر ئێوە لەو دەستە مرۆڤانەن کە بە دژی شۆڕش ناسراون. بۆ من جێگای گومان نییە کە دەتان گرن و هەروەك دەیان و سەدان لاوی بێتاوانی دیکە پشتوێنەکانتان دەکەنە پەتی خنکاندنتان.
بێگەرد ناحەقی نەبوو، چونکە بە دەیان جار ئەو جۆرە ڕووداوانە ڕوویاندابوو. ئێمە سەرگەرمی قسەکردن بووین، کە دوکتۆر زەردەشت گەڕایەوە لامان. ئەو کارتۆنێکی چووکەی پڕ لە دەرمانی پێداین. ڕێنوێنی کردین کە چۆن لەگەڵ شێرزاد دا هەڵسوکەوت بکەین. پێی گوتین کە هیوادارە ڕۆژێك بێت خۆی لەگەڵ ئێمە و لە تەنیشتمان ببینێتەوە.
"من کە خۆم بە سوپێر شۆڕشگێڕ دەزانی، هێشتا لە خەوی غەفڵەت هەڵنەستابووم و نەمدەزانی کە مەبەستی دوکتۆر لەو قسانە چییە" بەڵام بە ڕوونی بۆم دەرکەوتبوو کە کاکی دوکتۆر بە هەڵە لە ئێمە تێگەیشتووە. بە تێکڕا سوپاسمان کرد و هیوای سەربەرزیی و سەرفەرازیمان بۆ خواست.
لە کاتی بەجێ هیشتنماندا پێی ڕاگەیاندین کە هەموو خەرجی دوکتۆر و دەرمان و نەخۆشخانە لەسەر خۆیەتی و بۆ خۆی هەمووی

جێبەجێ کردوون. ماڵئاوایی لێکردین و ئێمەی بە جێهێشت. کاتی نانی نیوەڕۆ هاتبوو. چێشتێکی شلەیان بۆ شێرزاد هێنا و تا بڵێی یەك و دوو، چێشتەکەی خوارد. ئێمە خەریکی خۆئامادەکردن بۆ وەدەرکەوتن لە نەخۆشخانە بووین، کە کوڕێکی جوانکارە هاتە لامان و پاکت نامەیەکی دەمبەستراوی پێ داین. نامەکەمان کردەوە و دیتمان کە دوو پارچە قاقەزی تێدایە. لە نووسراوەی یەکەمدا هاتبوو کە ئێمە نەخۆشمان پێیە و لە ڕێگادا دەست نەهێننە بەرمان. نووسراوەی دووەم چەکێکی بانکی پەنجا هەزار تمەنی بوو. ئێمە بە هەر سێکمان نەماندەزانی بە چ زمانێك دەبێ سوپاسی دوکتۆر زەردەشت و دوکتۆرەکانی دیکە و سەرپەرشتیارەکانی نەخۆشخانە بکەین. بێگەرد بە جارێك گەشایەوە و دەیان ئافەرینی بۆ کاك دوکتۆر نارد. لەگەڵ بێگەرد دا خولێکمان بەو بەشەی نەخۆشخانەکەدا لێدا و سوپاسی هەموولایەکیانمان کرد کە زەحمەتیان بە ئێمەوە کێشابوو.

لە نیزیکی ئەو جێگایەی نەخۆشخانەکەی لێهەڵکەوتبوو، بانکێکیش هەبوو. پێکەوە چووینە ژوورەوەی بانك و چەکەکەمان کردە پارە.

پاشان سێ بە سێ، بە تاکسی هاتینە گاراجی ئوتوبوس و لەوێوە بەرەو کرماشان سوار بووین. بۆ درەنگانێکی ئێوارێ کە هەوا تاریك ببوو، گەیشتینە کرماشان و بۆ شەو چووینە ماڵی عەلی ڕەزا، یەکێك لە هاوالآنی ڕێکخراوەیی من و شێرزاد. باری لەشساغی شێرزاد لە ڕادەبەدەر باش ببوو. ئەو پێی وابوو کە پێویست ناکا سەردانی نەخۆشخانە بکا و پێی خۆشە بۆ بەیانی یەکڕاست بچینەوە بۆ ماڵی خۆیان.

لەبەر پێداگرتنی من، ئێمە دوو شەو لە کرماشان ماینەوە. لەو ماوە کورتەدا دیداری چەند هاوەڵێکی خۆمم کرد و باسی سازمان و ئاڵوگۆڕەکانی تەشکیلاتیان بۆ دەکردم، کە چۆن کەوتبووە ژێر ڕکێفی حیزبی توودەوە. سەرلەبەیانی ڕۆژی سێیەم کەلوپەل و خواردەمەنییەکی زۆرمان کڕیی و بە تاکسییەکی بێنزی مۆدیل شێستوچوار بەرەو لادێ وەڕێ کەوتین. لە ڕێگادا، لە دوو جێگا پشکێنەرانی سوپای مێهدی پێشیان پێگرتین، کە بە پیشاندانی نوسراوەی دوکتۆر، ناسنامەی حوسێن و دیتنی شێرزادی نەخۆش، لە کۆڵمان دەبوونەوە. لە یەکێك لە وێستگەکانی پشکنین مەلایەك کە پەڕۆکەی سەری سپی بوو، هەرکەسە و پاکتێکی دەمبەسراوی دایە دەستمانەوە. لەنێو پاکێتەکە دا نووسراوەیەك هەبوو کە چۆنیەتی لاڵانەوە و پاڕانەوەی دوعای کۆمەیلی تێدا شیکرابۆوە. لەو شیکردنەوەیەدا هاتبوو کە بەر لەوەی بنووی، ئەم دوعایە بخوێنەوە تاکو لە شەڕی شەیتان بەدوور بی و لە کاتی حەستەمدا لەبەرچاوی نەیاران ون بی. من کە زووتر نامەکەم هەڵپچڕیبوو، بۆم گێڕانەوە کە نووسراوەکە لەسەر شتێکی وایە. بێگەرد ئەوەی بیست، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پاکێتەکەی دەستی شێرزادی هەڵپڕوسکاند و لەت لەتی کرد و فڕێی دایە ژێر پێی. ئەو هێندە تووڕە بوو کە نەدەکرا پرسیاری لێبکەی. پاش خولەکێك بۆ خۆی لە پڕێك لە شێرزاد هاتە جواب و گوتی:

ـ جارێکی دیکە تاقەت و توانای ئەملا و ئەولا کردن و دووگیان بوون و نەشتەرگەریی دیکەتم نەماوە. ئەوە پێت دەڵێم، نە ئیسمو میسم، نە

کومەیل و خومەیل و نە ئایە و مایە، - مەبەستی لە خومەیل خومەینی بوو.-

ئێمە بە هەر جۆر بوو گەیشتینەوە ئاوایی خۆمان. بە بیستنی هەواڵی گەڕانەوەی شێرزاد، پۆل پۆل خەڵك دەهاتنە سەردانی و بەخێر هاتنەوەیان کرد و پاش وچانێك بەجێیان دەهێشتین. تا درەنگانیکی شەو، زۆربەی خەڵکی دێ سەردانیان کردین. شێرزاد لەو حاڵەدا نەبوو تا بە دەم خەڵکەوە هەستابایە سەرپێ. هەربۆیە بە خەڵکەکەمان دەگوت کە لە کاتی کارکردن لە کورەخانەیەکی شاری سنە دا، خشتی سوور کراوە بە سەریدا ڕووخاوە و پشتی زەختی وێکەوتووە و زگیشی تووشی گرفت هاتووە، کە لە نەخۆشخانەی شاری سنە نەشتەرگەریی بۆ کراوە.

ئەودەم لە شاری سنە کە لەلایان ڕژێمی شا وە و بە "سنندج" ناودێرکرابوو، شەڕ و پێکدادان لەو ناوچە و شارەکانی دیکەی دەوروبەری بەردەوام بوو. شێرزاد باسی بۆ دەکردن و دەیگوت، بریا بە چاوی خۆتان دیتباتان کە چۆن کوردەکان بە تەنیا چەکێکەوە تانکەکانی سوپای نوێی ئێرانیان دەشکاند. خەڵکیش ئافەرینیان بۆ دەناردن و دەست خۆشییان لە خەڵکی ئەو دەڤەرە دەکرد، بەڵام ئەو ڕادەربڕینەی خەڵك بۆ من ئاسایی نەبوون، چونکە من خۆم بە نوێنەری کرێکاران و زەحمەتکێشان دەزانی و ئەوانی دیکەش بە داردەستی ئیمپریالیست (ستون پنجم). هەتا درەنگانێکی شەو دەستە دەستە خەڵك سەردانی شێرزادیان دەکرد و دەچوونەوە.

کاتی نووستن هاتبوو. منیش شێرزاد و بێگەردم بە جێهێشت و گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، بەڵام، بەر لەوەی بە جێیان بێڵم، پێمگوتن، ئەگەر هات و پێویستتان بە یارمەتی من هەبوو، ئاگادارم کەنەوە.

لە گەڕانەوەمدا بۆ لای ماڵ، ئەوەم بۆ ببووە پرسیار کە خەڵکی دێ بە ورد و درشتەوە هاتنە سەردانی شێرزاد، بەڵام دایکم نەهاتبوو. لای خۆم بیرم دەکردەوە کە لەوانەیە هێشتا لە شار نەگەڕابێتەوە، چونکە هەر هەمان ڕۆژ کە ئێمە بەرەو شاری ئیلام وەڕێ کەوتین، ئەویش لەگەڵ سەیران شاهۆیان برد بۆ شار بە مەبەستی سەردانی دوکتۆر و چارەسەری قاچی شاهۆ.

گەیشتمە دەرکی حەوشە و چەند جارێك دام لە دەرگا، بەڵام کەس دەرگای بۆ نەکردمەوە. بە ناچار لە پاساری ماڵەوە وەسەربان کەوتم. دیسان کلیلم پێنەبوو تاکو قاپی ماڵەوە بکەمەوە. ئەو جار دڵنیام بووم کە دایکم نەگەڕاوەتەوە. نوێڵێك کە لە حەوشە کەتبوو هێنام و گیراندمە لاشیپانی دەرگاکە. لە کەمتر لە خولەکێکدا دەرگام لە ڕەسمەبرد و چوومە ژوورەوە. ڕایەخم ڕاخست و تاکو بەیانی کە خۆر کەوانێك ڕاست ببۆوە نووستم.

بەیانی کە هەستام وەبیرم هاتەوە کە قەولم بە چنار داوە پێوەندی لەگەڵ بگرم. لە چاوخشاندنێك بە نێو ماڵدا بۆم دەرکەوت کە شتومەکی خواردەمەنیمان نەماوە. بۆ کڕینی هێندێك خواردەمەنی و کەلوپەلی دیکە، بەرەو دوکانی دێ وەڕێ کەوتم. لە ڕێگادا تووشی بەهار، کیژە چووکەکەی مامۆستا جوامێر هاتم. لێمپرسی:

ـ بابت لە ماڵەوەیە؟

ئەو ڕۆژ باشی لێکردم و لە وەڵامدا گوتی:

ـ بەڵێ، کارتان پێیبوو؟

ـ دەمەوێ ئەم ئێوارەیە سەردانتان بکەم.

بەهار کچێکی ژیر و وریا بوو و تەمەنی دە تا دوازدە ساڵ بوو.

لە ڕاستیدا دەبا من بەر لە پرسیارکردن ڕۆژباشم لەو کردبا، بەڵام ئەوە ئەو بوو کە وەپێش کەوت و من لەو کیژۆڵەوە شت فێر بووم.

ئەو گوتی:

ـ هەر ئێستا دەچمەوە و دایکم ئاگادار دەکەمەوە.

گەیشتمە دوکان و کەلوپەلەکانم کڕیی و بۆ ماڵێم بردنەوە. هەرکامە لە شتومەکەکانم لە شوێنی خۆیان دامەزراند. نازانم تا چ ڕادەیەك شپرزە بوون، چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو کە بەبێ ئەوەی کەس پێم بڵێ، کارێکی لەو چەشنە بۆ ماڵەوە ئەنجام بدەم، برسیم بوو، قەیسی و ڕۆنێکی باشم بە ڕۆنی خۆماڵی دروست کرد. سفرەکەم بە چوار قەد ڕاخست و قەیسی و ڕۆنەکەم لەگەڵ جامێك ئاو لەسەری دانا. کاتێك سەری خوانچەی نانەکەم لادا، بینیم نانی تێدا نییە. ڕێگاچارەم تەنیا ئەوە بوو لە ماڵە جیرانێکمان داوای نان بکەم. بۆ ئەم مەبەستە لە دەرگای ماڵی دادە خاسپەریم دا کە دراوسێی نیزیکمان بوون. کوڕی چووکەیان کە کاروانی ناو بوو، دەرگای لێکردمەوە. لێمپرسی:

ـ کەستان لە ماڵەوەیە؟

ـ بەڵێ، دایکم و کەژاڵ.

من هێشتا لەگەڵ کاروان دا قسەم دەکرد، کە دادە خاسپەری هاتە دەرەوەی حەوشە. ڕۆژ باشم لێکرد و لە وەڵامدا گوتی:

ـ ڕۆژ باش باوانەکەم، ئەوە خێرە؟

ـ بەڵێ، خێرە، دایکم لە ماڵەوە نییە و هاتووم نانتان لێ قەرز بکەم.

ـ ڕۆڵە گیان نانیش بۆ بە قەرزدان دەبێ؟ بۆ مەگەر سەروبنی دونیا وێکهاتووە؟

پاشان کەژاڵی بانگ کرد و گوتی:

ـ وەرە ڕۆڵە وەرە، ئەی چۆن خۆڵ لە دۆی خۆم نەکەم، شوانە هاتووە و نانی بە قەرز دەوێ. ئا دەی خێراکە کچە شیرینەکەم، لەوانەیە زۆری برسی بێ.

دادە خاسپەری هێندێك ڕاوەستا و پاشان گوتی:

ـ دەك ڕاستی کارت بێ ڕۆڵە گیان، خۆ لە بیرت بردم خولقت کەمە ماڵەوە.

کەژاڵ هاتە سووچی بانەکەوە و گوتی:

ـ بە شوان بڵێ کە نانی کۆنمان هەیە، بەڵام هەویرەکە هەڵهاتووە و خۆڵی ساجەکەشم داوە و تا چارەکە ساعەتێکی دی نانی گەرم پێدەگا.

دادە خاسپەری سوێندی لێ خواردم، بە گیانی کەژاڵ و کاروانم، ناهێڵم بچیتەوە، تاکو نانی گەرم پێنەگا، بێجگە لەوەش دەبێ بۆ ئێوارەش لە ماڵی خۆمان بی. من هیچم پێ نەدەکرا، چونکە ئەو تازە بە گیانی منداڵەکانی سوێندی خواردبوو. پێمگوت:

ـ با بچم دەرگای ماڵەکە قایم بکەم، پاشان دەگەڕێمەوە.

من هاتمەوە ماڵ و بۆ ئەوەی سەگ یان پشیلە نەچنە ژوورەوە، دەرگای لە گێجەنگە دەرهاتووم هەڵپەساردە قاپی ماڵەکەدا. تاکو من گەڕامەوە کەژاڵ ئاگری کردبۆوە و لە چاوەڕوانی تینگرتنی ساجەکەدا بوو. دانیشتن لەبەر ئاگر گەلێك خۆش بوو، چونکە سەری شاخەکان بەفر داپۆشیبوو و لە بنارەکانیش کرێوەیەکی سارد هەڵیکردبوو.

لەگەڵ دادە خاسپەری تەکمان دابووە نیزیك ئاگرەکەوە. جاروبار دەستمان ڕادەداشتە تینی ئاگر و دەکشاینەوە بۆ دواوە. دادە خاسپەری گەلێك ڕووداو و بەسەرهاتی بۆ گێڕامەوە، بەڵام کەژاڵ بە تەواوی بێدەنگ بوو. ئەو تەنیا جاروبار چاوە پڕ لە کلەکانی هەڵدێنا و سەرنجێکی کورتی دەدایە نێوچاوانم و پاشان خۆی خەریك دەکردەوە بە نانکردنەوە. دادە خاسپەریش کەشکی کردبوونە ئاوەوە و خووساندبوونی. نیسك و نۆکی کوڵاندبوو، باینجانی ڕەشی وشککراوی لە ئاو کردبوو. ئەو پێی گوتم کە بۆ ئێوارێ چێشتی کەشك- باینجان لێدەنێ. هەروەها داوای لێبووردنی لێکردم کە بۆ چەند خولەکێك بەجێم دێڵێ و دەگەڕێتەوە بۆ لام.

کاروان لە لای ئێمە دانیشتبوو تەڵە دارێکی باریکی بە دەستەوە بوو کە جاروبار لە ئاورەکەی وەردەدا و دەیکردە دوکەڵان. کەژاڵ پێی گوت:

ـ کاروان گیان! دەتوانی بچی برێك لە دارە هەنجیە کراوەکان بهاوێژیتە نێو کورەکە و ئاگرەکە هەڵکەی، با ماڵەکە گەرم دابێ؟

کاروانی مێرمنداڵ گورج ڕاپەڕی و چووە سەرەوە بۆ هەڵکردنی کورەی ئاگرەکە. منیش کە لە لێدوان لەگەڵ کچان گەلێك کەم ڕوو و شەرمن

بووم، هەروا بەبێ دەنگی لەتەنیشت کەژاڵ دانیشتبووم. کەژاڵ نانێکی گەرمی کە بە جوانی برژاندبووی، لەسەر چیخولکەکە دانا و گوتی:

- وا بزانم لە ڕووت هەڵنایە هیچ بڵێی، بەڵام خۆ دەتوانی پاروویەك لەو نانە گەرمە بخۆی.

سوپاسم کرد و گوتم:

- با دەتوانم نانیش بخۆم و قسەش بکەم، بەڵام نازانم لەسەر چی قسە بکەم.

ئەو ڕووی تێکردم و گوتی:

- لام سەیرە کە نازانی لەسەر چی قسە بکەی. بە لانی کەمەوە دەتوانی لەسەر گەوڕمالێن، مەشکەژەندن، تەشی ڕستن، هەویر و نانکردن. بە قوربان! گەلێك لەوانە هەن باسیان بکەی، بەڵام لەوانەیە پێدانەشکێیتەوە.

کەژاڵ درێژەی داو لێی پرسیم:

- کاتی ئەوە نەهاتووە خۆت فێری هەویر و نانکردنیش بکەی؟ هەر هیچ نەبێ بەشی خواردنی خۆت.

بە سەرنجدان بەوەی کە من تیکەڵاوییەکی ئەوتۆم لەگەڵ کەژاڵ نەبوو، ئەو پرسیارەی ئەوم وەك تانە و تەشەر هەست پێکرد کە دەیدا بە ڕوومەوە.

دادە خاسپەری کە بەرەو لای ئێمە دەهات، گوێی لەو پرسیار و تەشەرانەی کەژاڵ بوو کە بەرەوڕووی منی کردەوە. ئەو هاتە پێشەوە و گوتی:

- کەژاڵ! چۆن دڵت دێ ئاوا بە ڕووی شواندا بچیەوە، ڕۆڵە گیان.

کەژاڵ هاتە جواب و گوتی:

ـ دایە گیان! ئەوە بەڕووداچوونەوە نییە. ئەی ئەوە نییە بۆ خۆیان پۆل پۆل و دەستە دەستە دەچوون ماڵ بە ماڵ دەگەڕان و گەوریان دەماڵی و مەشکەیان دەژەند. ئەگەر شوانە نانکردنیش فێربێ، زیاتریش سەربەخۆ دەبێ و دەریش دەکەوێ کە ئەو هەڵسوکەوتانە تەنیا ڕواڵەتی نین و هێندێك ڕاستییان تێدایە. خۆ هەر هیچ نەبێ با خۆی فێری نانکردنیش بکا.

منیش لەو پەری بێ دەسەڵاتیدا گوتم:

ـ کەژاڵ ڕاست دەکا و هێشتا زۆر شت ماون کە من دەبێ فێریان بم و ئەو پرسیارەی کەژاڵێش بۆ من گەلێك ئاساییە.

بەڵام ئەمە خۆمانین، من دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە، ئەگینا ڕادەربرینەکەی کەژاڵم لێ گەلێك پێ قورس و گران بوون.

ئێمە پێکەوە چووینە ژوورەوە و لە دەوری کورەکە خڕ ببووینەوە. ئەگەرچی نانی نیوەڕۆیەشم نەخواردبوو، بەڵام ئەوەی ناوی برسییەتی بێ، لە بیرم نەمابوو. ڕاستی ئەوەبوو کە لێدوان و پرسیارەکانی کەژاڵم وەك تیر و تانە دەهاتە بەرچاو. وابزانم لەم پێوەندییەدا بە هەڵەش تێ نەگەیشتبووم، چونکە ڕاستە ئێمە جیران بووین، بەڵام تاکو ئەو ئێوارانە لە سڵاو و هەواڵپرسی نەبێ، پێوەندییەکی ئەوتۆمان لەگەڵ کەژاڵ پێکەوە نەبوو. تەنیا چنار لە ماڵی خۆیان پێی گوتم: «کە کەژاڵ خۆشی دەوێ». کە دیارە ئەویش یەکلایەنە بوو، بێجگە لەوەش من بۆ درێژەی خوێندن لە ماڵ ڕابووم و لەگەڵ کەژاڵێش تەنیا هاوینان و ئەویش بۆ ماوەیەکی

کورت یەکترمان دەبینی، کە ئەویش لە چوارچێوەی هەواڵپرسییەکی کورت تێنەدەپەڕی.

سفرە داخرا و پێکەوە شامان خوارد. دەست خۆشیمان لە دادە خاسپەری کرد بۆ لێنانی ئەو چێشتە خۆشەی. پاش تاوێك لە پڕ وەبیرم هاتەوە کە دەبێ سەردانی ماڵی مامۆستا جوامێر و دادە جەیران بکەم. گەلێك سوپاسی دادە خاسپەری و کەژاڵ و کاروانم کرد.

لە کاتی ماڵئاواییکردندا، دادە خاسپەری پێی گوتم:

ـ ڕۆڵە گیان! هەموو کاتێك ماڵی ئێمە لە ڕووت ئاواڵەیە و نابێ نامۆیی بکەی. کوڕی خۆم! من قەد بە هەتیوی گەورە بوونی تۆم لە بیر ناچێ. بۆخۆت نازانی کە ئەو دایکە ڕەنجبێوەرەت بە چ قوڕبەسەرییەك ئەتۆی پێگەیاندووە. کوڕەکەم! هیوادارم ڕێ و ڕەچەی بابت لە بیر نەکەی.

لە کاتی وەدەرکەوتنم لە ماڵیان، کەژاڵ گوتی:

ـ هیوادارم قسەکانی منت لێ گران نەبووبێ، چونکە من مەبەستێکی تایبەتیم هەبوو لەو قسانەم و پێمخۆشە لە داهاتوودا و لەم پێوەندییەدا لێدوانێکمان هەبێ. بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانین لە ماڵی خۆمان دانیشین و هەر لە ئێستاوە ئاگادار بە کە ئەودەم تەنیا من نیم و کەسی دیکەشم لەگەڵ دەبێ.

من سوپاسی دووبارەم لێکردن و بەرەو ماڵی مامۆستا وەڕێ کەوتم، ئەگەرچی دەمزانی ئەو سەردانەم بەبێ هاوڕێیەتی دایکم، لەوانە بوو گرفت خوڵقێن بێ، بە گەیشتنم بەوێ لە دەرگای حەوشەکەیانم دا. دادە

جەیران دەرگای لێکردمەوە و بە چاو پێکەوتنم گەلێك گەشایەوە. منیش ئێوارە باشم لێکرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و گوتی:

ـ ڕۆڵە گیان درەنگ هاتی. ئێمە چاوەڕوانت بووین و پێمان وا بوو کە لە بیرت چووە. جوامێر، شاماری نارد بە دواتدا، بەڵام پاش ماوەیەك هاتەوە و گوتی کە چرا لە ماڵەکەتان نەگڕاوە و دەرگای ماڵەکەشتان لە یەك ترازاوە.

منیش داوای لێبوردنم لێکردن و گوتم:

ـ هەڵە لە من بووە کە بە بەهارم نەگوتبوو کە پاش خوانی ئێوارێ سەردانتان دەکەم. لە پێوەندیی لەگەڵ دەرگای ماڵەکەش، بەڵێ، ڕاستە و دایکم لە ماڵ نییە و منیش کلیلم پێ نەبوو. هەر بۆیە دەرگای ماڵەکەم لە گێجەنگە دەرهێناوە.

کە چووینە ژوورەوە، مامۆستا هەستا سەر پێ و بە خێرهاتنی کردم، پاشان گلەیی لێکردم کە ئەوانم بە برسی ڕاگرتووە و درەنگ هاتووم.

داوای لێبووردنم لێیان کرد لەبەر ئەوەی لە چاوەڕوانیدا هێشتبوومنەوە. دەستبەجێ سفرە ڕاخرا و چێشتەکەی لەسەر دانرا، پاشان هەر کەسە و بۆ خۆی چێشتی لە قاپی خۆی کرد. ئەمن تاوێك لەمەوبەر چێشتی کەشك باینجانم لە ماڵی دادە خاسپەری خواردبوو، جێگای خواردنی دیم نەمابوو، بەڵام دەورییەکم لەپێش خۆم دانا و وردە وردە لەگەڵیان دەمخوارد، پاش خواردنی شام و خواردنەوەی چا، مامۆستا دەستی بە گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان کرد. لە سەفەویەکانەوە لە ئێران دەستی پێکرد و داگیرکاری عەرەبەکان و ئیمپراتۆریی عوسمانییەکانی

سەروژێر کرد، پاشان چووە سەر دەسەڵاتدارییەتی دەوڵەتەکانی ئینگلیس و فەرانسە و کۆلۆنییەکانیان و سیاسەتی داگیرکاریی ئەوانی لەم پێوەندییەدا دایە بەر هێرش. بە دوای ئەوانەدا چووە سەر شۆڕشی فەرانسە و ئاوڕێکیشی لە شۆڕشی ئۆکتۆبری ۱۹۱۷ی یەکیەتی سۆڤیەت دایەوە. هێندێك چووە سەر و پۆپری شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیی دا و ئەوجار هاتە سەر ڕەزاشا و کوڕەکەی و یەك دەوڵەت یەك نەتەوەی ئێرانی دایە بەر هێرشێکی توند و ئەوجار گەنجان و لاوانی دایە بەر ڕەخنەی توند و بە شوێنکەوتووی ئەم دەسەڵات و ئەو ئایدیۆلۆژییای لە قەڵەمدان.

من کە لەگەڵ بەشی ئاخری لێدوانەکانی مامۆستادا کە سەبارەت بە گەنجان و لاواندا بوو، نەبووم و گوتم:

ـ گەنجان و لاوان لەگەڵ ڕووناکبیران ئەرکێکی گەورەیان لەسەر شانە. ئەویش ئەوەیە کە دەبێ دەوڵەتێکی سۆسیالیستی دامەزرێنن و یەکسانیش بۆ سەرجەم دانیشتووانی وڵات دابین بکەن. بە جۆرێك کە هەموو پێکەوە کار بکەن و هەمووش پێکەوە بیخۆن.

مامۆستا سەرێکی لەقاند و گوتی:

ـ کوڕی خۆم! ئەوەی ئەتۆ باسی دەکەی کاتێك دێتە دی کە خەڵك لەوە تێبگەن و ئەو کاتیش وڵات دەبێ هێندە لە باری ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتوری و ڕامیارییەوە گەشەی کردبێ، کە کۆمەڵ بۆ خۆیان خوازیاری ئەو سیستمە بن و لەگەڵ هەلومەرجی ژیانیاندا بگونجێ، بێجگە لەوانەش، ئێمە هەر ئێستا ئەو جۆرە سیستمانەمان لە زۆر لە وڵاتان هەیە، بەڵام دانیشتووانی ئەو وڵاتانە دەناڵێنن بەدەست گەلێك

گیروگرفتەوە کە ئەو جۆرە گیروگرفتانە لەمێژە لە وڵاتانی سەرمایەداری تارادەیەکی بەرچاو چارەسەر کراون.

من لێدوانەکەم لە مامۆستا بڕی و لێمپرسی:

ـ جا ئەگەر وایە کە ئێوە دەفەرموون و بەتایبەتی باسی گەشەی کۆمەڵایەتیت هاوردە ئاراوە، ئیتر بۆچی خۆتان وەك مامۆستای ئایینی بەردەوامن و کارێکی وا ناکەن تاکو خەڵك ببنە خاوەن کەسایەتی خۆیان؟

مامۆستا لە جوابدا گوتی:

ـ کاکی خۆم ڕاستە مەلایەتی بۆتە پیشە، بەڵام هیچ داهاتێکی بۆ من تێدا نییە و هەرگیزیش خەڵکم بە لاڕێدا نەبردووە. قەتیش خەڵکم بۆ توندوتیژی هان نەداوە و لە بیری ئەوەش نیم خەڵك فریو بدەم، پێم باشە ئەوەش بزانی کە من هەڵگری بیروباوەڕێکم کە ئەمڕۆ یان بەیانی بۆت ڕوون دەبێتەوە. کاکە شوان! دەزانم ئەتۆ ئێستاش لەگەڵ دەستەیەك لە گەنجەکانی هاوڕێتدا، هەڵگری بیروباوەڕێکن کە زۆر دژایەتی لەگەڵ بیر و بۆچوونی ئێمەمانان دا هەیە. هەڵبەت لێرە مەبەستم نە مەلایەتییە و نە دین و ئایین، بەڵکو بابەتی کێشەی نەتەوەیەکە کە ئێوە نەگ هەر ناوێکی لێ نابەن، بەڵکو دژایەتیشی دەکەن.

من قسەکەم لە زاری مامۆستا گرت و گوتم:

ـ ئەوەیان گومانی تێدا نییە کە ئێمە دژایەتی بیر و بۆچوونی کۆن و دواکەوتوو و ناسیونالیسمی بەرچاوتەنگ دەکەین، بەڵام نەك بەو مانایە کە ئێمە دژی کەسایەتی ئێوە بین.

وا دەرکەوت کە مامۆستا لە ڕادەربڕینەکانی من دڵگیر نەببوو. ئەو گوتی:

ـ کوڕم! پێمخۆشە کە ئێوە لاسای ئەم یان ئەو ئایدیولۆژییە نەکەنەوە و فریوی پڕوپاگەندەی بێ نێوەرۆك و دوور لە چاوەڕوانی بێگانە نەخۆن. ئەگەر بۆ جارێکیش بووە پێشنیارتان پێدەکەم کە هێندێك بە خۆتاندا بچنەوە و بیر لەوە بکەنەوە کە ئێوە کێن، خەڵکی کوێن و سەر بە چ نەتەوەیەکن و نیشتمانتان کوێیە. مامۆستا خەریك بوو لە کوورە دەربچێ و گوتی، پێم ناڵێی بۆ لەم دێیە وێرانەیەی خۆمان گوێت لە چوار نێوی وەك عەلی و عومەر و حوسێن و مێهدی و ئەبوبەکر نابێ؟ برای بابم، قەد ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرت لەوە کردوەتەوە بۆ ناوت شوانە یە و هۆی هەتیو بوونت هەر لە منداڵییەوە چی بووە؟ بڕۆ تەواوی شارەکانی تاران، ئیسفەهان، کاشان، قوم بگەڕێ و بزانە بۆ جارێکیش بووە و دەتوانی گوێت لە ناوەکانی وەك: شێرزاد، وریا، کاروان، جوامێر، سەیران، جەیران، بێگەرد، ساماڵ، کەژاڵ و بەختیار بێ.

ئەم پرسیارانەی مامۆستا وە بیری لێدوانەکانی چەند ڕۆژی ڕابردووی خوشکە سەیران و دوکتۆر زەردەشت لە ئیلامی دەخستمەوە، بەڵام هەرکامە و بە جۆرێك. مامۆستا کە هێندێك بێتاقەت دەهاتە بەرچاو، ڕووی لە خێزانەکەی کرد و گوتی:

ـ ئەوە من و ئەوەش ئێوە. بەو کاکە شوانە بڵێن کە هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێ، تەنیا بۆ جارێکیش هەستتان بەوە کردووە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان زەختم خستبێتە سەرتان کە هەڵسوکەوتی وەکو من بکەن.

چنار کە تا ئەودەم بە تەواوی بێدەنگ مابور گوتی:

ـ پێموابێ شوان بۆ خۆی هەست بەوە دەکا کە ئەتۆ لەو جۆرە مرۆڤانە نیت.

دادە جەیران لەوەش زیاتر چووە پێش و گوتی:

ـ ئەمە بیست و شەش ساڵە کە ئێمە ژیانی هاوبەشمان پێك هێناوە، هەتا ئێستاش جوامێر بۆ جارێکیش بێ، دڵی نەڕەنجاندووم، کچەکانمان بۆ خۆیان سەربەستن لە هەڵبژاردندا. جوامێر سووتاوی دەردێکی دیکەیە کە ئێوە گەنجان خۆتانی لە قەرە نادەن و بگرە بە گومانیشەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن. هیوادارم ڕۆژێك بێت کە هەر هەموومان بە زمانێك بدوێین و بۆ یەك مەبەستیش بێ.

بەدوای لێدوانەکەی دادە جەیران دا، مامۆستا بۆ خۆی وەپێشم کەوت و لە دەروانجەی ماڵەوە چووینە خوار بۆ گەوری ئاژەڵەکان. ئەوجار دەرگای کادێنەکەی کردەوە و لە قەراخ ڕاستی کادێنەوە جلەشرەیەکی هەڵدایەوە کە بە بزمار کوترابوو بە دیوارەکەدا. لە ژێری ئەو جلەشرە و لە ناوەڕاستی دیوارەکەدا دەرگایەکی کردەوە و ئێمەی بردە ژوورێکەوە کە پڕ بوو لە کتێب. بە چاوخشاندنێك بە نێو کتێبەکاندا بۆم دەرکەوت کە زیاتر لە پەنجا دانەیان کتێبی کوردی بوون. "بۆ منی سۆپر شۆڕشگێڕ و لە چەپ چەپتر، کە تەنیا وشەی دژی ئیمپریالیست فێر ببووم و لە ماناکەشی تێنەدەگەیشتم، ئەم هەڵوێست و ئاکارانەی مامۆستا چاوەڕواننەکراو بوو".

پاش ئەوەی چاوێکمان بە نێو کتێبەکاندا خشاند، هاتینەوە سەرێ بۆ

ژووری دانیشتن و سەر و چایەکی تازەدەمکراومان خواردەوە، مامۆستا بە دەم پێکەنینەوە پێی گوتم:

ـ کوڕی باوکم! ئێستا دەتوانی تێم گەیەنی کێ نۆکەری بێگانەیە؟

چنار گوتی:

ـ بابە ئیتر واش نا، شوانە هێشتا گەنجە و هەڵگری گەلێك هیوا و ئاواتە، بتەوێ دڵی مرۆڤێك بەدەست بێنی و ڕێگای ڕاستی پێشان بدەی، نابێ بەو شێوەیە لەگەڵی بدوێی.

من لەو هەڵویستەی چنار سەرم سوڕما. هێندێك وەخۆ کەوتم و گوتم:

ـ بە پێچەوانەوە، ئامۆژگاری و لێدوانەکانی مامۆستا کۆمەڵێك ڕاستییان تێدایە و بێجگە لەوانەش، مامۆستا وەك باوکی منە و من نەك هەر دلگیر نابم، بەڵکو گەلێکیش دڵشادم بەو جۆرە پێوەندییە کۆمەلایەتییەوە کە لە بنەماڵەی بەڕێزتاندا ڕەچاو دەکرێ.

وادیار بوو تێبینییەکەی چنار کاریگەری لەسەر مامۆستا جوامێر هەبوو، هەر بۆیە بەم جۆرە دڵی دامەوە:

ـ ڕۆڵە چنار، کچی خۆم! شوانە کوڕێکی خوێندەوارە و دەبێ لە قازانج و زیانی خۆی و نەتەوەکەی تێدەگا، بێجگە لەوەش کەسێك دەم لە سیاسەت بدا و بیەوێ ئاڵوگۆڕ لە کۆمەڵدا پێکبێنێ، دەبێ پشوو درێژ و لەسەرەخۆ بێت و بەر لە هەموو شتێك ئەو ئاڵوگۆڕە لە خۆیدا پێکبێنێ.

شەوگار بە خێرایی تێدەپەڕی، بەڵام لای من هەر وەك ئێوارێ بوو. هۆی یەکەم و بەر لە هەموو شتێك، فێربوونی ئەو شتە نوێیانە بوو کە من چ ئاگادارییەکم لە سەریان نەبوو. هۆی دووەمیش، چنار پێی گوتبووم کە

پێوەندی پێوە بگرم، بەڵام تا ئەوکات هیچی دەرنەبڕیبوو. لە لێکدانەوەی خۆمدا وام دانابوو کە چنار دەیەوێ ببێتە ئەندام لە ڕێکخراوی خۆماندا، کە لە بەرەی دژە ئیمپریالیستیدا بووین، بەڵام بیروڕا دەربڕینەکانی بنەماڵەی مامۆستا هەڵگری بیروباوەڕێك بوون، کە لای من بێگانە بوو، بۆ ئەوەی خۆمم نەشکاندنێ و تێگەیشتوویی خۆشم نیشان دابن، پرسیم:

- ئێوە چۆن فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی بوون؟

بەهار کچی چووکەی مامۆستا و دادە جەیران، بەر لە هەموویان وەڵامی دامەوە و گوتی:

- کاك شوان! فێربوونی خوێندن و نووسینی کوردی گەلێك ساکارە. بە پێچەوانەی زمانەکانی فارسی و عەرەبی و تورکی، لە کوردی دا هەرچی بە زمانت دابێ دەنووسرێ. ئەو هەموو وشە بێکەڵك و خوار و ژوور کردنەی پێ ناوێ. ئێمە دەتوانین فێرت بکەین. ئەو بەشەش بە ئێمە نەکرێ، بابم یارمەتیمان دەکا.

مامۆستا گەز گەز باڵای دەکرد کە بەهار کیژۆڵەیەکی دە تا دوازدە ساڵانە ئاوا وەڵامی پرسیارەکەی منی دایەوە. دادە جەیران کە لەولای کوورەی ئاگرەکەوە دانیشتبوو گوتی:

- ڕاست و ڕەوان وایە. جوامێر بۆ خۆی چنار و بەهاری فێری خوێندن و نووسینی کوردی کردووە. ئەگەر کاکە شوانیش بیەوێ فێر بێ، ئەوە جوامێر دەتوانێ یارمەتیتان بدا.

دوو دانگ لە شەوگار تێ پەڕیبوو. کاتی ئەوە هاتبوو ماڵئاواییان لێبکەم، سوپاسیانم کرد و گوتم:

ـ کاتی نووستن هاتووە و من بەجێتان دێلم.

کاتێك خەریکی خۆکۆکردنەوە بۆ بەرە و ماڵ چوونەوە بووم، مامۆستا پێی گوتم:

ـ با پێکەوە پلانێك دانێین تاکو بتوانی دوو ڕۆژ لە حەوتودا سەردانی ئێرە بکەی بە مەبەستی فێربوونی نووسین و خوێندنی کوردی.

منیش سەرەڕای ئەوەی سوپاسم لێکرد، بەڵێنم پێدا پێوەندیی پێوە بگرمەوە، بەڵام لە بیرم چووبوو هۆی حەشاردانی کتێبەکانی خۆی لێبپرسم.

هەر ئەو شەوەش هەستم پێدەکرد کە تراویلکەیەکی نوێ بە ڕوومدا کراوەتەوە، بەڵام لەبەر " تۆخسی" و دەمار گرژیی و چۆنیەتی بیرکردنەوەکانم ئامادە نەبووم بە خاڵێکی وەرچەرخان لە ژیانمی دانێم. "هەروەك چۆن گەڵەیەك بەر چاوت بگرێ و دارستانێکی بەربڵاو نەبینیت".

بەیانی کە لە خەو هەستام، تازە وەبیرم هاتەوە کە قەیسی و ڕۆنەکەی دوێنێ ئێوارێ لەسەر سفرەکە ماوەتەوە. ئەوجار وە خۆ هاتمەوە کە دیسان نانیشم بۆ قاوەڵتی نییە.

ئەمجارەیان کراوەتر لە دەرگای ماڵی دادە خاسپەریم داوە. کاروان گورج هات و دەرگای حەوشەی لێکردمەوە. بەبێ ئەوەی وشەیەك بە زارمدا بێ، گوتی:

ـ دەزانم کارت چییە. دوێنێ ئێوارێ لە بیرت چووبوو نان لەگەڵ خۆت هەڵگری.

داده خاسپەری خەریك بوو جلی مانگای دەکرد، ڕووی تێکردم و گوتی:

ـ وەرە ژوورەوە و لە کاتێکی باش دا هاتووی.

من پێموابوو کە ئەو پێویستی بە یارمەتییە، بەڵام لە هەڵەدا بووم، پاشان بانگی کردە کەژاڵ کە قابلەمە فافۆنەکەی بۆ بێنێ. تا کەژاڵ چوو قابلەمەی بۆ بینێ بۆی گێڕامەوە کە:

ـ ئەم مانگایە ئەمشەو زاوە و ژەکی زۆری لەگواندایە، تاکو من مانگاکە دەدۆشم، لەگەڵ کاروان و کەژاڵ بچنە ژوورەوە.

من نەمدەزانی چۆنی پێبڵێم کە نامەوێ چیدیکە زەحمەتیان بدەم. لە پڕ کەژاڵ هاتە جواب و گوتی:

ـ دایکە! شوان بۆ مانگا دۆشین ئازایە. ئەی بۆ ڕێگای پێنادەی ئەو کارە بکا؟

داده خاسپەری ئەو جۆرە ڕا دەربڕینەی کەژاڵی پێ نائاسایی بوو و بێشك حەقیشی بوو، چونکە ئەو تەمەنێکی لەگەڵ چەوسانەوە و نایەکسانیدا تێپەڕکردبوو. هەر بۆیە ڕووی لە کەژاڵ کرد و پێی گوت:

ـ کچم، ئێوە گەنجن و دەتوانن هەرچۆنێکتان پێ خۆشبێ پێکەوە بدوێن و گاڵتە بە یەکتر بکەن، بەڵام من پێم خۆش نییە لەماڵی خۆمان گوێم لەو جۆرە تانە و تەشەرانە بێ.

وا هەستم دەکرد کە کەژاڵ بەو جۆرە هەڵوێستانە دوو مەبەستی هەبێ، چونکە ئێوارەی شەوی ڕابردوو و لە کاتی نانکردندا ئەم بابەتەی بە جۆرێکی دیکە دەربڕیبوو. مەبەستی یەکەمی تاقیکرنەوەی من بوو تاکو بۆی دەرکەوێ تا چ ڕادەیەك بڕوام بەو بیروباوەڕە هەبوو کە سەبارەت بە

یەکسانی و مافی ئافرەتان پڕوپاگەندەم بۆ دەکردن. دووەمیش، هەستم پێدەکرد کە کەژاڵ چاوەڕوانییەکی لێم هەبێ و تاقیم بکاتەوە تاکو بزانێ تا چ ڕادەیەك دڵفراوان، هێمن و لەسەرەخۆم. هەڵبەت بە چاولێکردنەکانی ڕا دیار بوو کە دڵداریش تێکەڵە لەگەڵ هەڵسوکەوتەکانی، بۆ مەبەستی یەکەمی تا ڕادەیەکی زۆر چاکی بۆ چووبوو، چونکە ئەگەر من بڕوام بە پروپاگەندەکانی خۆم هەبایە، ئەوە لە ماڵەوە ئارد و خوێ و هەویرترش و هەموو شتێك هەبوون و دەمتوانی بۆ خۆم لە ماڵەوە نانم دروستکردبا و نەچووبامە نان قەرزکردن. کە وابێ ئەو لە من ژیرتر بوو و بەوەی زانیبوو کە ئەو هەڵسوکەوتەی ئێمە سەبارەت بە نایەکسانیی نێوان پیاو و ئافرەت، بێجگە لە پروپاگەندە و خۆنیشاندان هیچی دیکەی بەدواوە نەبوو، ئەویش لە ڕادەی خۆهەڵکێشان و دروشم دا. بۆ مەبەستی هێمنایەتی و لەسەرەخۆ بوون، نەمدەویست خۆ تووڕە نیشان بدەم و بۆ دڵداریش نەمدەتوانیی خۆمی لێبدەم، چونکە نەمدەزانی چ دوارۆژ و داهاتوویەك چاوەڕوانمە.

تاکو ئێمە چووینە ژوورەوە و دانیشتین، کەژاڵ کوورەی ئاگرەکەی خۆشکرد، هێندەی پێنەچوو کە دادە خاسپەری قابڵەمەیەکی پڕ لە ژەکی هێنا، پاشان لەسەر کوورەکەی دانا و لە ماوەیەکی کورتدا بوو بە فرۆ. ئێمە بە تێکڕا دەستمان کرد بە خواردن و قاوەڵتیمان کرد.

من دەبا هاتبامەوە ماڵی خۆمان، بەڵام بەرلەوەی کە بگەڕێمەوە، کەژاڵ بانگی کردمە سوچێکەوە و پێی گوتم:

ـ ئەم بەیانییە لە سەرکانی، چنارم دی و پێی گوتم کە ئەوشەو تاکو کەڵەشێر هاتۆتە باڵ، لەماڵیان بووی. جا درێنێ ئێوارێ بۆ لە ماڵی ئێمە دانەنیشتی؟ ئەوان بنەماڵەیەکی ناسراون و ئێمە وانین؟ یان چنار لە من جوانترە و کەین و بەینێکتان پێکەوە هەیە؟

هەستم پێدەکرد کە کەژاڵ خراپ لەمە تێگەیشتووە، پێشنیارم پێکرد کە لەم پێوەندییەدا پێکەوە دەدوێین و پێویست ناکا بەخیلیی بکەی، کەژاڵ قبوولی کرد و منیش بەرەو ماڵ گەڕامەوە. من بەسەر بارودۆخێکدا کەوتبووم کە نەمدەزانی بیر لە چی بکەمەوە. لە نەهاتنەوەی دایکم، لە شێرزاد و بێگەرد، لە کوشت و بڕی گەنجان و لاوان بە دەستی نوێنەرانی خودا لەسەر گۆی زەوی. ئەوەی بەبیرمدا نەدەهات، بیرکردنەوە لە دایکی سۆسیالیسم و ئەو یەکسانییە بوو کە خولقاندبووی!

بە گەیشتنەوەم بۆ ماڵەوە، لەنێو کتێبەکاندا، یەکێك لە کورتە چیرۆکەکانی مامۆستای چیرۆکنووس و بەناوبانگی کورد، عەلی ئەشرەفی دەرویێشیانم هەڵبژارد، تاکو بیخوێنمەوە و بەو هۆیەوە بۆ ساتێکیش بێ خۆم لە خەم دوور خەمەوە. چەند لاپەڕەی سەرەتا باش چوومە پێش، بەڵام بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆ بێ کە نیوەڕۆ داهاتووە، ئەوەندەی دیکەش بە خەمەکانم زیاد ببوون. هاتمە دەرەوە تا هەوایەکی تازە هەڵمژم" بینیم ماشێنێك لە بەرانبەری ئاوایی بەرەو خوار دێ. یەکسەر وەبیری دایکم کەوتمەوە. هێندەی پێنەچوو، کە دایکم بە کۆڵێك کەلوپەلەوە بەرەو ماڵ دەهات. گورج چووم بەرەو پیریەوە و بە خێرهاتنەوەم کرد. کەلوپەلەکانم لێوەرگرت و وەپێشی کەوتم. ئەو بۆی گێڕامەوە کە قاچی شاهۆ، بێجگە

لەوەی کە تەشەنەی کردبوو، لە دوو جێگاشەوە درزی دابوو و دەبا لە نەخۆشخانە خەوتبا.

منیش بۆم گێڕاوە کە شێرزاد تووشی چ بەڵایەك ببوو و چۆنی ئەو بەڵایە لە کۆڵ بۆتەوە. باسی سەردانی خۆمم سەبارەت بەماڵی دادە خاسپەری و مامۆستا جوامێر و دادە جەیران بۆ کرد. لە کۆتاییشدا باسی لە گێجەنگ دەرهێنانی دەرگای ماڵی خۆمانم بۆ کرد، پاشان گوتم:

ـ لەو کاتەوەی لە ئیلام گەڕاوینەتەوە ئاگام لە شێرزاد و بێگەرد نییە. ئەگەر زۆر ماندوو نیت، ئەم ئێوارەیە سەردانێکیان دەکەین.

هێندەی پێنەچوو کە تەقە لە دەرگای حەوشەکەمان هات. چوومە دەر. دیتم دادە خاسپەرییە و جامێکی پڕ لە فرۆی بە دەستەوەیە. ڕۆژباشم لێکرد و سەرەڕای ئەوەی خولقم کرد، هەواڵی هاتنەوەی دایکم پێدا. دایکم کە گوێی لە دەنگمان بوو، گورج هاتە دەرو بە خێرهاتنی دادە خاسپەری کرد.

ئەوان دانیشتن و دەستیان کرد بە گلەیی و گازندە لە نەهامەتیەکانی ڕۆژگار و دەیانگوت: «چەرخی گەردوون بە چەواشە دەگەڕێ و گەلێك بێ بەزەییە». دایکم باسی گەڕانەوەی شێرزادی کرد و گوتی:

ـ دەمانەوێ ئەم ئێوارەیە سەردانی شێرزاد و بێگەرد بکەین. دادە خاسپەریش پێشنیاری کرد کە ئەو پێی خۆشە پێکەوە بچینە سەردانیان.

پاش دوو کاتژمێر ئەو گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و دایکیشم کارتۆنێك کولیچە برنجی پێدا، کە لە کرماشان هێنابووی. بە دوای ئەوەدا هێندەی پێ نەچوو کە کەژاڵ بە دەستەوارەیەك نانی گەرمەوە هاتە بەر دەرکە. من

خەریکی دروستکردنەوەی دەرگای ماڵەوە بووم کە بۆ خۆم لە گێجەنگم دەرهێنابوو. ئەو لێی پرسیم:

ـ ئەوە دەستی دارتاشیشت هەیە؟

ـ نە، بە پێچەوانەوە، بەڵام ئەوە شوێنەدەستی خۆمە کە خرام کردووە و دەبێ چاکیشی کەمەوە!

دایکم نانەکەی لێوەرگرت و سوپاسی کردن، دەمزانی کە کەژاڵ پرسیاری دیکەم لێ دەکا. هەر بەو بۆنەوە دەستم لە تەق و تۆقی دەرگا چاککردن هەڵگرت، بێجگە لەوەش کەژاڵ دڵی ناسك بوو و لەوانەبوو ئەگەر ئاوڕم لێنەدابایە، بە جۆرێکی دیکە لێم تێگەیشتبا. ئەو لێم هاتە پێش و پرسی:

ـ ئەتۆش دەچیت بۆ ماڵی شێرزاد و بێگەرد؟

ـ بەڵێ، وامان داناوە کە منیش لەگەڵ بم. ئەگەر پێت خۆشبێ دەتوانی تۆش لەگەڵمان بێی.

بێگومان هەستم پێدەکرد کە کەژاڵ مەبەستی دیکەی هەبوو، بەڵام من نەمدەوێرا خۆمی لێبدەم. لە لایەکەوە کەوتبوومە نێو قەیرانێکی فکری و لە لایەکی دیکەشەوە تێکۆشانی سیاسی پێی نابووە قۆناغێکەوە، کە بە هۆی سەرەڕۆیی مەلاکان، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرتەسکتر و دژوارتر دەبوو، بێجگە لەوانەش سەبارەت بە من، چناریش هەر مەبەستێکی وەك کەژاڵی هەبوو. تێگەیشتنی کۆمەڵایەتیم ئیزنی نەدەدام دڵی هیچکامیان بشکێنم و نەشم دەویست دۆستایەتیمان بەو قۆناغەدا تێپەڕێ کە تەمەنی گەنجیم و دڵم دەیویست، بێجگە لەوەش پێویستم بە بیر کردنەوە و

لێکدانەوەی قووڵ هەبوو، تاکو بڕیارێکی ئەوتۆ لەسەر ژیانی دوارۆژم بدەم. دەمزانی لەو هەلومەرجەدا پێکهێنانی ژیانی هاوبەش دەیتوانی ببێتە هۆی دابڕانم لە زۆر شت کە تازە خەریك بوو دەچوومە ناخیانەوە. هەرچەند چاولێکردن و هەڵسوکەوتەکانی کەژاڵ ئاماژەیان بە ئەوین و خۆشەویستی ئەو بەرانبەر بە من دەکرد، بەڵام من تەنیا بۆ جارێکیش وام نیشان نەدا کە خوازیاری ویستەکانی دەروونی پڕکوڵی ئەوم. ئەوەشم دەزانیی کە دڵشکاندن دەیتوانی کارەساتی نالەباری لێبکەوێتەوە و ببێتە هۆی دڵڕەقی لایەك بە دژی لایەکەی دیکە و ئاسەواری خراپی دەروونیش لەسەر هەردووك لێ دابنێ. بۆ خۆم بڕیارم دابوو کە هەڵسوکەوت و پێوەندیم لەگەڵ کەژاڵ و چنار هاوڕێیانە بێ و کارێکی وا نەکەم کە جیاوازییان لەنێوان دانێم. هەرچەند کەژاڵ هەوڵیدا چاو لە نێوچاوانی بکەم، بەڵام توانیم خۆم بپارێزم و نەکەومە داوی ئەو چاوتێبڕینانەی کە بەردیشی دەتواندەوە، چ بگاتە دڵی گەنجێك.

کەژاڵ ئێمەی بەجێهێشت و من و دایکم تێر و پڕمان لە فرۆیەکە خوارد و تاکو دەرگاکەم چاك کردەوە، خۆر ئاوا بوو. ئێمە خۆمان گورج کردەوە و چووینە دەرگای ماڵی دادە خاسپەری تاکو پێکەوە بچین بۆ ماڵی شێرزاد و بێگەرد. ئەوانیش هەر سێکیان واتە دادە خاسپەری. کەژاڵ و کاروان ئامادە بوون و پێکەوە وەڕێ کەوتین. کۆڵانەکان گەلێك بەرتەسك بوون و هەواش سارد و کڕێوەی دەکرد. هەورەکان لووتیان نابووە زەوی و گژەی بای سەر بەندەنەکان مزگێنی بەفربارین و ڕۆژانی سەختی زستانی دەدا. ئێمە کە بە ڕێگادا دەچووین و کۆڵانەکانیش تەنگ بوون و هەواش

تاریك بوو. به بیانووی ئەوەی كە نەكەوێ، كەژاڵ دوو جاران چمكی پاڵتۆكەمی گرت و بەرەو لای خۆی ڕای كێشام، بەڵام چونكە لە نییەتی تێگەیشتبووم، هێندە سەرنجم نەدایە و خۆم لێ گێل كرد.

ئێمە گەیشتینە ماڵی بێگەرد و شێرزاد. بەخێرهاتن و هەواڵپرسیی دەستپێكرد. باری لەشساغی شێرزاد گەلێك باشتر ببوو. هەڵدەستا و دەگەڕا و بگرە پیاڵەی چایەكانیشی لەبەر دەست میوانەكانی دادەنا. تا درەنگانێكی شەو گەپمان لێدا و شێرزاد كوورەی گەپەكەمانی ئەوەندەی دیكە گەرم كردبوو. بێگەرد گلەییەكی ئاراستەی من كرد كە لەو كاتەوە هاتووینەتەوە، ئەوە یەكەمین جارە سەردانم كردوون. منیش داوای لێبووردنم لێكردن و گوتم:

ـ ئێوە حەقی خۆتانە گلەییم لێبكەن، بەڵام منیش هێندێك ئیش و كارم بووە كە دەبا جێبەجێم كردبان.

باسی زۆر شتمان كرد و هاتینە سەر ژنهێنان و مێردكردن. دادە خاسپەری گوتی:

ـ كاتێك منیان دا بە مێرد، تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو. جوانم لە بیرە كچێكی دراوسێمان هەبوو كە ناوی بەیان بوو. كاتێك دایان بە مێرد، دوو بزن و مەڕێك و مانگایەك شیربابییەكەی بوو. پاڕێنەیەك و ماینێكیش كرا بە پشت ئەختی. من و هەیاسی بابی، كەژاڵ و كاروان، زیاتر لە چاردەساڵ پێكەوە نەژیاین. كەژاڵ سێزدە ساڵان بوو و كاروانیش تازە لە دایك ببوو، كە هەیاسیان بردە ئیجباریی و ئیتر نەگەڕایەوە. ئەوە نۆ ساڵی ڕەبەقە ئێمە

لە چاوەڕوانی وەڵامێکین سەبارەت بە چارەنووسی هەیاس!؟ بەڵام مەخابن تا ئێستاش چ ئاگادارییەکمان لە چارەنووسی ئەو نییە.

دایکم بە لێزانیی خۆی گورج بابەتەکەی گۆڕی و گوتی:

- لە وڵاتێك کە نابەرابەری و ملهوڕی بۆتە کولتور و داب و نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵایەتیش پێوەری هەموو هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانەن، چۆن دەکرێ چاوەڕوانی یەکسانیی و ئاکاری باش بیت؟

منیش وەجواب هاتم و گوتم:

- لەم قۆناغەدا کە گۆڕەپان بۆ بەربەرەکانی بە دژی ئەو چەوسانەوە و نابەرانبەریانەدا لە بارە، دەستەوئەژنۆ دانیشتن و چاوەڕێی هات و نەهات بوون هەڵەیەکی گەورەیە.

دادە خاسپەری لێمهاتە جواب:

- ڕۆڵە گیان! پێشینیان گوتویانە:"بەردێك نەتوانی تلی دەی، دەبێ پاڵی پێوەدەی"!

دایکم لە وەڵامی دادە خاسپەری دا و زۆر بە خێرایی گوتی:

- ئەمجۆرە بابەتانە کۆن بوونە و بایەخیان نەماوە. زۆر لە گەلانی ڕووی ئەم گەردوونە هەن کە بە سەدان ساڵە خۆیان لە دەست چەوسانەوەی نەتەوەیی و ژێردەستی ڕزگار کردووە. ئێستا دونیا لە زۆر بواردا، چ لە باری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بێ یان ئابووری و ڕامیارییەوە گەشەی کردووە. ئێستا سەردەمێکە کە ئەگەر بەردێك نەتوانی تلی دەی، دەتوانی بە کەرەستەی پێشکەوتوو بیتەقێنیتەوە و لەسەر ڕێگای خۆتی لابەریی.

به بیستنی ئەم قسانەی دایکم ئارەقەیەك هەموو لەشی داگرتم، پێم سەیر بوو کە ئەو ئاخافتن لەسەر بابەتێك دەکا کە کاری مرۆڤێکی ساکار و ڕەنج بەخەسارچووی وەك دایکم نەبوو. شەوگارمان شەق کردبوو و کاتی نووستن هاتبوو. ماڵئاواییمان لێکردن و بەرە و ماڵی خۆمان گەڕاینەوە. دایکم لە دادە خاسپەری گێڕابۆوە کە سبەی شەو میوانی ئێمە بن. ئەویش قبوڵی کردبوو. ئەو شەوەشمان ڕۆژ کردەوە و سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە هێندێك کەل و کونی پاسار و سەربانەکانیشم چاککردن، چونکە لەسەر شاخەکان بەفر کەپەلورانی دەکرد و بەرە بەرە دەرماڵی لێدەگرتین. تاکو من ئەو کارانەم ئەنجام دان، دایکیشم نێوماڵی خاوێن کردەوە و پۆشەنەکانی تەکاندن.

پاش ئەوەی ئاوێکم بە خۆدا کرد، چوومە لای مام لەتیف کە هەم دوکانی هەبوو هەم قەسابی دەکرد. دوو کیلۆ گۆشتم لێکڕی و هێنامەوە. ئێمە وامان دانا کە بۆ ئێوارێ پلاو و گۆشت بخۆین. بوومەلێڵەی ئێوارێ پاش تاقەتکردنی ئاژەڵەکانیان، دادە خاسپەری و منداڵەکانی هاتن بۆ ماڵمان، پاش بەخێرهاتنکردنیان لە دەوری یەك کۆبووینەوە، بە دوای چەند خولەکێکدا کەژاڵ لێی پرسیم:

ـ دەتوانم چاوێك لە کتێبەکانت بکەم؟

ـ فەرموو، کتێب بۆ چاولێکردن و خوێندنەوەیە، نەك بۆ هەڵگرتن لە ویترێندا.

ئەو دەستی پێکرد و زیاتر لە نیوە کاتژمێرێك ئەو کتێبی هەڵگرت و ئەوی دیکەی دادەنا. من کە زۆربەی ئەو ڕۆژە خەریك ببووم بە پینە و پەڕۆکردنی پاسار و بانی ماڵەوە، هێندێك ماندوو بووم و پێمگوت:

ـ هەرچەندە پێتخۆشە چاویان لێبکە و بە دڵی خۆت چەند دانەیەکیان بۆ خوێندنەوە هەڵبژێرە.

ئەو لە کۆتاییدا تەنیا کتێبێکی هەڵگرت کە ساڵی ڕابردوو لە شارۆچکەی ڕێژاو دەستم کەوتبوو. ئەو کتێبە کوردی بوو و لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردستانیانی دانیشتووی شارۆچکەی ڕێژاو کە خەڵکی باشوری کوردستان و ئەندامی پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوون، لەو شارۆچکەیە دەژیان. کەژاڵ چاوێکی بە کتێبەکەدا خشاند و پرسی:

ـ ئەم کتێبەت خوێندووەتەوە؟

ـ نەخێر، چونکە من ناتوانم کوردی بخوێنمەوە.

ـ ئەگەر توانیبات ئەم کتێبەت خوێندبایەوە بەبێ گومان ئێستا بە جۆرێکی دیکە لەسەر کۆمەڵگای خۆمان بیرت دەکردەوە.

پاشان پێمگوت:

ـ ئێستا کاتی باسکردن لەسەر ئەم یان ئەو کتێب نییە و ئەگەر دەرفەتمان بۆ ڕەخسا، ئەوکات ئاخافتنی لەسەر دەکەین.

ئێمە هێشتا قسەکانمان تەواو نەببوو، دایکم لەپڕ بانگی کردین کە شێو ئامادەیە. لە دەوری سفرە کۆبووینەوە و دەستمان بە خواردن کرد. لە کاتی نانخواردندا پێشنیارەکەی مامۆستا جوامێرم وەبیرهاتەوە کە دەبا پلانێك بۆ خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی دانێین.

بە دەرفەتم زانی ئەو پرسیارە بخەمە بەر دەست کەژاڵ و ڕای ئەوی لەسەر وەرگرم. لێمپرسی:

- لە کوێ و چۆن کوردی فێر بووی؟

- باشتر وایە دایکم وەڵامی ئەو پرسیارەت بداتەوە، چونکە بۆ خۆم باشم وەبیرنایەتەوە.

دادە خاسپەری کە گوێی لێمان بوو، ڕووی تێکردم و بەمجۆرە وەڵامی دامەوە:

- ڕۆڵە، کوڕە شیرینەکەم! بابی هەیاس مام حەمدۆ، کە دەبێتە باپیرەی کەژاڵ و کاروان، مرۆڤێکی ئازا و بلیمەت بوو، بێجگە لە کوردی، تورکی و عەرەبیی و فارسیشی زانیوە. ئەو قوڕبەسەریی و دەربەدەریی زۆری بە سەر هاتبوو و لە ئەسڵ دا خەڵکی شاری ماردین، لە باکووری کوردستان بوو، پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لەلایەن کەمال ئەتا تورکەوە هەموو بنەماڵەکەیان قڕکراون و تەفروتونا بوونە. ئەودەم حەمدۆ بۆ خۆی بە تەنێ دەرچووە و پەڕیوەی باشووری کوردستان بووە و هەرلەوێش ژیانی هاوبەش پێك دێنێ کە هەیاس دەبێتە یەکەم و دوایین منداڵیان. لەگەڵ سەرهەڵدانی شەڕی جیهانیی دووەم و لە کۆتاییەکانی ئەو شەڕە دا و دامەزرانی کۆماری کوردستان، خۆی گەیاندۆتە شاری مەهاباد. بە ڕووخانی کۆماری کوردستان، خاڵە حەمدۆ ل لایەن قوڵەچۆماخەکانی حەمەڕەزاشاوە دەگیرێت و بێ سەروشوێن دەکرێ، دیسان هەیاس لەگەڵ دایکی پەڕیوەی باشووری کوردستان دەبنەوە و لە شاری سولەیمانی دەگیرسێنەوە. ئەو هەر لەوێ دەچێتە قوتابخانە و

فێری خوێندن و نووسینی کوردی دەبێ، پاشان کە گەورە دەبێ بۆ بژێوی ژیانی خۆی و دایکی دەچێتە شاری خانەقین و لەوێ دەبێتە کۆڵکێش.

کاتێك دادە خاسپەری بەسەرهاتی بنەماڵەی هەیاس و حەمدۆی دەگێڕایەوە، چاوم لە دایکم بوو کە چۆن فرمێسك وەك دانەی مرواریی بە گۆنایدا دەتکێتە سەر داوێنەکەی.

دادە خاسپەری درێژەی دا:

ـ هەیاس بە شەوانە لە سنووری شاری خانەقینەوە بە کۆڵ پارچەی دەهێنایە شاری قەسری شیرین و لەو هاتووچۆ و ئەمدیو ئەودیوکردنەدا، لەگەڵ کاکەم واتە برای گەورەم کە ئەویش کۆڵکێش بوو، دەبنە دەستە برا. ئەوان هێندە برایەتییان خۆش بوو کە وایلێهات زۆرجاران لە ماڵی ئێمە دەمایەوە. ئەو لە حەوت ئاسمانان ئەستێرەیەکی- وەك کەسوکار- شك نەدەبرد و دایکیشی لە خانەقین کۆچی دوایی کرد. هەر کات بارودۆخی سنوور گرژ دەبوو، ئەوان لە ماڵی خۆمان دەمانەوە. هەیاس وەکو کوڕی ماڵی خۆمانی لێهاتبوو. تاکو ڕۆژێکیان کاکم پێشنیاری ژیانی هاوبەشی لەگەڵ ئەو خێر لەخۆنەدیوە پێکردم، منیش کە خاوەن بڕیار نەبووم، بێدڵی کاکم نەکرد و مێردم پێکرد. پاش ساڵێك کەژاڵ بوو بە یەکەمین بەری ئێمە. هەر کە کەژاڵ هاتە گڕوگاڵ کردن، لە بەیانی تا ئێوارێ لە قەلاندۆشی دەکرد و بەیت و بالۆرەی بۆ دەگوت. ئەوکات لای زۆر کەس شوورەیی بوو کە کچ بچێتە قوتابخانە و خوێندەواری فێر بێ. هەیاس زۆر دژی ئەو داب و نەریتە کۆنانە ڕادەوەستا و هەر لە شەش ساڵانییەوە کەژاڵی بردە قوتابخانە، بە داخەوە لە بەر دەستکورتی و زۆر هۆی دیکە کەژاڵ

نەیتوانی درێژە بە خوێندنی باڵا بدا. سەبارەت بە زمانی کوردیش، هەیاس بە دزییەوە و هەر لە ماڵەوە بۆ خۆی کەژاڵی فێری خوێندن و نووسینی کوردی کرد. ئێستاش لە سایەی سەری ئەم مێژەر بەسەر و تازە بە دەسەڵات گەیشتووانەدا، ئافرەت وەك مرۆڤی پلە نزم دەژمێردرێ و ئەوەی نرخ بێ، بۆی دانانرێ. هەیاس بەردەوام بوو لە فێرکردنی کەژاڵ بۆ خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی تاکو بوو بە ١٣ ساڵان، کە ئەو ساڵە ساڵی لەدایکبوونی کاروانیشە. ساڵێك پاشتر بە ڕەشبگیر هەیاسیان بردە سەربازی کە هەتاکو ئێستا چ شوێن و هەتەرێکمان لێی نییە.

گێڕانەوەی بەسەرهاتی هەیاس مێردی بێسەروشوێن کراوی دادە خاسپەری بۆ منی دژە ئیمپریالیست کە هەموو تەنگ و چەڵەمەکانی کۆمەڵایەتی، ڕامیاری و ئابووریم لە بازنەی نا یەکسانی چینایەتییەوە دەدی، بە سانایی تاوتوێ نەدەکران. لای من گەلێك گرینگ بوو کە لە کونەواجەی بەرتەسکی ئیدیولۆژی ڕێکخراوەیی خۆمەوە بڕوانمە کەند و کۆسپەکانی بەردەم کۆمەڵگادا، هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە دامەزراندنی دیکتاتۆری پرۆلتاریم بە تەنیا ڕێگای ڕزگاریی گەلانی بن دەست دەزانی و دۆزی نەتەوەییم بە تەواوی لە بیر کردبوو. هەڵبەت تا ڕادەیەکیش حەقم بە دەست بوو، بەڵام نە لەبەر ئەوەی کە بە سەرهاتی هەیاس و دەیان هەیاسی بێ سەر و شوێنکراوەی دیم قبوڵ نەبێ، بەڵکو لەبەر دوو هۆکار، کە لای من وەك نوێخوازیی ناسرابوون. یەکەم پڕوپاگەندەی بەهێزی ڕێکخراوەکانی چەپ بە پشتیوانیی دایکی شۆسیالیست، کە دەزگای هەواڵگریی(ك. گ. ب.) هەڵیدەسووڕاندن. دووەم زاڵبوونی هەژمونی چینایەتی بەسەر هەستی

نەتەوایەتیدا. ئەم تەوژمە هێندە بە هێز بوو کە جیابیرانی دیکە بە چووکەترین هەڵوێست گرتن لەسەر بابەتی نەتەوەیی، بە بەکرێگیراو (ستون پنجم) دەژمێردران. بە تایبەتی بۆ گەنجان کە ئاگاداربییەکی ئەوتۆیان لەسەر چەمکەکانی نەتەوەیی و نیشتمانیی نەبوو، من بە تەواوی چووبوومە ناخی نەهامەتییەکانی دادە خاسپەری و چۆنیەتی ژیانیانەوە، بێخەبەر لەوەی کە بنەماڵەکەی خۆشم یەکێك لەو قوربانیانە بوو.

بەو شەوەوە دەبووە جاری چوارەم کە ناڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی پرسیارێك دەبوومەوە کە پێوەندی بە کێشەی نەتەوەییەوە هەبوو، بەڵام بەو حاڵەش بڕیاردان کارێکی ئاسان نەبوو، بەتایبەت ئەو هەموو پروپاگەندەی هێزە چەپەکان کە بەدژی ڕێکخراوەکانی کوردی دەکران. کاروان کە لە لای منەوە دانیشتبوو خەونووچکە دەیبردەوە.

کەژاڵ جێگای بۆ ڕاخست و ئەو نووست. دایکم و دادە خاسپەری کە چارەنووسێکی وەك یەکیان هەبوو، بنەمای باسی چارەڕەشی و چەرمەسەری خۆیانیان دامەزراند. بە دەرفەتم زانی باسی پێشنیارەکەی مامۆستا جوامێر لەمەڕ خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی، لەگەڵ کەژاڵ بێنمە گۆڕێ. هەرکە دەستم پێکرد، کەژاڵ لێدوانەکەی پساندم و گوتی:

ـ چنار هەمووی بۆ گێڕاومەتەوە و پێویست ناکا باسیان بکەی، ئەوەی لای من گرینگ بێ ئەوەیە کە ئەتۆ چ پلانێکت بۆ دوارۆژ و فێربوونت هەیە؟

لە ڕاستیدا بۆم نەدەکرا وەڵامێکی باشی پێنەدەمەوە، چونکە بۆم دەرکەوت کە پێوەندییەکی گەرم و گوڕ لە نێوان کەژاڵ و چناردا هەیە. وا هەستم دەکرد کە ئەم پرسیارەی کەژاڵ گەلێك پرسیاری دیکەی بە دوادا بێ. پێمگوت:

ـ بۆ ئەوەی خۆ فێری خوێندن و نووسینی کوردی بکەم، بڕیارم داوە وەدوای کەوم، بەڵام سەبارەت بە پلانی دوارۆژم چ گەڵاڵەیەکی دیاریکراوم نییە. ئەمەش بەو مانایە نییە کە خۆم بسپێرمە دەست قەزا و قەدەر. هۆیەکەشی ئەوەیە کە نازانم دوارۆژی ئەم کۆمەڵگایە بەرە و چ هەنێ دەچێ.

ئەو هێندێك بێدەنگ ڕاوەستا و پرسیارەکەی بەجۆرە دووپات کردەوە:

ـ کە واتە ئەتۆ لە بیری ژیانی تایبەتی خۆتدا نیت؟

ـ نامەوێ تەرکی دونیا بکەم، بەڵام تا نەگەمە سەر ئەو بڕوایەی کە بزانم چ دوارۆژێکم لە پێشە، ئەوەی بیری لێ نەکەمەوە ژیانی تایبەتی خۆمە.

لای خۆم وام دانا کە بەو وەڵامە بە پرسیارەکەی کەژاڵ، ئەوم دڵنیا کردبێ کە من بە تەمای چنار نیم و هیچ شتێکی تایبەتیشمان لەنێواندا نییە. سەرەڕای ئەوەش پێشموابوو کە دەبێ ئەوە وەڵامێك بووبێ بۆ کەژاڵ، کە چیدیکە ئەو جۆرە پرسیارانەم لێنەکاتەوە. هەربۆیە ئیتر هیچ پرسیارێکی لەو پێوەندییەدا لێنەکردمەوە. ئەو پێشنیاری پێکردم ئەگەر هات و خوێندنم لای مامۆستا جوامێر دەست پێکرد، ئاگاداری کەمەوە. پرسیم:

- کارێکی تایبەتیت هەیە لەو پێوەندییەدا؟

- منیش دەمەوێ ڕێزمانی کوردی فێربم، چونکە گەلێك جیاوازی هەیە لە نێوان قسەکردن، تاکو خوێندن و نووسین و زانینی ڕێزمان دا.

شەوگار نیوە ببوو، دادە خاسپەری کاروانی لە خەو کرد و ئەوان هەرسێکیان چوونەوە بوو ماڵی خۆیان. ئێمەش تاکو بەیانی لێی خەوتین. بۆ بەیانی بڕیارمدا بە گوێرەی دەرەفەت و توانا بۆ خوێندنی زمانی کوردی، ئێواران بچمە لای مامۆستا جوامێر.

بۆ ئەم مەبەستە سەری ماڵیانم دا، بەڵام کەسیان لە ماڵ نەبوو. نووسراوەیەکم نووسی و بە کلیلی دەرگاکەیاندا هەڵمواسی. لەو نووسراوەیەدا بۆم نووسیبوو کە پێمخۆشە خوێندن بە کوردی دەست پێبکەم و ساغ بوومەتەوە کە ئێواران بە خزمەتتان بگەم و زەحمەتتان دەم. لە کۆتاییدا نووسیبووم کە لەسەر کات و وردەکارییەکانی دیکەیش دەتوانین پیکەوە قسەی لەسەر بکەین.

لە گەڕانەوەدا لە لای ماڵی خۆمان تووشی کاروان هاتم. پێم گوت:

- بە کەژاڵ بڵێ دەمەوێ چاوم پێی بکەوێ.

کاروان وەك تەشیلە بۆی دەرچوو. هێندەی پێنەچوو کە کەژاڵ هاتە دەرکی حەوشە. پاش هەواڵپرسی پێمگوت:

- دەمەوێ هەر چی خێراتر دەست بە خوێندن بکەم و بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوەیەکم بۆ مامۆستا جوامێر داناوە کە ڕەنگە بەم زووانە ئاگادارم بکاتەوە.

کەژاڵ لە وەڵامدا گوتی:

ـ من لەسەر ئەوە ساغم کە کوردی پتر بخوێنم، بەڵام پرسیارێك دێتە گۆڕەوە.

ـ چ پرسیارێك؟

ـ لەوانەیە کە مامۆستا لە بەرابەر ئەو ئەرکەدا چاوەڕوانییەکی هەبێ و ئێمەش باری ئابووریمان زۆر شپرزەیە.

ـ لەو پێوەندییەدا بۆ خۆم باسی لەگەڵ دەکەم.

بەفربارین دەستی پێکردبوو و دەشت ودەر بەفر داپیۆشیبوو. گەڕامەوە ماڵ و کوورەی ئاگرەکەم هەڵکرد. هێندەی پێنەچوو کە خاڵە شامار کە ئاودێری ئاواییەکەمان بوو، هاتە ماڵەوە. دانیشت و پاڵی دا بە پشتییەکەوە. سیغارێکی هەڵپێچاو دوو سێ بینگ پەیتا پەیتای هەڵمژی. وچانێکی دا و ئەمجارەیان بە بێپسانەوە چەندین بینگی دیکەی لێدا کە سیغارەکەی لە نیوە تێپەڕاند. دوکەڵ لەنێو ماڵەکەدا پەنگی خواردەوە. پرسیم:

ـ خاڵە شامار سیغارەکە لە دەستت دەرناچێ، بۆ ئاوا بە پەلەی؟

ـ ئینجا مەگەر من ژیانم هەیە تا لە مردن بترسم، شەست ساڵە وەك شامار دەژیم. شامارێك کە هەست و نیستی ناوەکەی و پێمەڕەکەیەتی. ئەوەتا ئەمڕۆ پاش ساڵێك ڕێگام کەوتە شار، کە چی دەبێ ناوەکەشم بگۆڕم.

ـ بۆچی و لە بەرچی دەبێ ناوت بگۆڕی؟

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

ـ به گیانی ئەم کاکە شوانە، ئەوەی تۆسقالێك پیتی "ش" بە ناوەکەیەوە بێ، دەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ، هەر ئەمرۆ عەلی پاشا، شاوەلی، شاوەیس و شاکەرەمیان گرتن. ئەوان لە سەریان کراوە لە ماوەی دوو حەوتودا ناوەکانیان بگۆڕن. جا مەگەر منیش شامارم ناو نییە؟

ـ هۆکاری چییە؟

ـ دەڵێن ئەمجۆرە ناوانە لە خۆشەویستی شای ڕووخاودا هەڵبژێردراون و دەبێ نەمێنن.

ـ دەی چارە چییە مام شامار؟

ـ من هاتووم ڕای تۆ وەرگرم و بزانم چ ناوێك هەڵبژێرم.

ـ ئەگەر لە من دەپرسی، پێم باشە کە ناوەکەت وەك خۆی بمێنێتەوە.

ـ ئاخر دەترسم ناوی من ببێتە هۆی گیروگرفت بۆ خەڵکی دیکە.

ـ ئەوە ناوی تۆیە و چ پێوەندیەکی بە خەڵکی دیکەوە نییە.

خاڵە شامار خۆی لێ تووڕە کردم و گوتی:

ـ ئەتۆ لە لای خۆتەوە خوێندەواری، دەك هەورەتریشقە لەو قوتابخانەیە کەوتبا کە ئێوە تێیدا فێری خوێندن کراون. ئاخر ئێوە فێری چ جۆرە خوێندنێك کراون کە هێشتا نازانن لە وڵاتی پاڵ دەستی ئێمە (تورکیا) خەڵك بە کوردی بدوێن سزا دەدرێن و بێجگە لە سزای زیندان دەبێ پارەش وەك جەریمە بدەن. باشە، ئەگەر ئەوە هات و خەڵك لە نێو کوچە و کۆڵانان بانگی منیان کرد، یان ناویان بردم و گوتیان چۆنی شامار و لەسەر ئەوە گیران، یان سزا دران، ئەودەم کێ لێی بەرپرسە؟

من هیچ وەڵامێکم بۆی نەبوو و نەمدەتوانی لەوەش تێبگەم کە لە تورکیا ئەو کردەوانە باون، چونکە تورکیا بە وڵاتێکی پێشکەوتوو دادەنرا. هیچ نەبێ لای وڵاتانی ئەوروپایی و ئەمریکییەکان وا دەهاتە پێناسەکردن کە وڵاتێکی لائیکە و دیموکراسیشی تێدا جێگیر بووە!؟

لەوکاتەدا کە من و خاڵە شامار پێکەوە قسەمان دەکرد، دایکم بە تەڕ و تلیسی وەژوور کەوت. وا دیار بوو کە بەفربارینەکە قورسە و ئەویش کە لەسەرەخۆ دەچێتە ڕێوە، ئاوا بەخەستی تەڕ بووە. تاکو دایکم سیپاڵەکانی بەری گۆڕی، ئاوم کوڵاند و چایەکم دەم کرد. سەر و پیاڵەم بۆ تێکردن و خواردیانەوە. دایکم خولقی خاڵە شاماری کرد کە لامان بمێنێتەوە، بەڵام ئەو گوتی:

ـ بەر لە بەفربارین بانگلانی بانەکەی باش نەداوە و دڵنیایە کە ئێستا ماڵەکەی دڵۆپە دەکا.

هەر چەند کاتەکان تێدەپەڕین، بەو ڕادەیەش خەمێك بە خەمەکانی من زیاد دەبوون. ئەو شەوەشمان بە کوڵێك لە پەژارەوە تێپەڕ کرد و بۆ بەیانیش هەروەك زۆربەی بەیانییەکانی دیکە ملمان وەبەر نان و چای شیرینەوە نا. پاش بەرچایی، بەرەو گۆڕەپانی دێ وەڕێ کەوتم. خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆ ببوونەوە. یەك دەیگوت زستانێکی باشە و ئەم بەفرەش نیشانەی ساڵێکی خۆشە. ئەویدی دەیگوت زستانی سەخت، بەهاری پڕ ئاو و خۆشی بەدواوەیە. ڕای گشتی ئەوە بوو کە ئەمساڵ نابێتە وشکەساڵی، پاشان بوو بە باسی دەوڵەتی تازە وەسەرکارهاتوو. یەك دەیگوت لیلەقمان دەردێنن. یەك دەیگوت وامان لێدەکەن با بە دەواری شڕی نەکردبێ. لەولاوە چەند

مێرمنداڵێك شەڕەبەفریان دەکرد و گلۆڵە بەفریان فڕی دەدا بۆ یەکتر. لەنێو گەرمەی قسەکردنی ئێمەدا، مام نەسۆر زۆر بە تووڕەییەوە گالۆکەکەی کوتا بە دووقەدی سپی چنارێکدا کە پاڵی پێوە دابوو. هەمووان بە جارێك بێدەنگ بوون و ئەویش کە نەیدەتوانی لەنێو بەفرەکە دا بچێتە ڕێوە، گوتی:

ـ ئیتر بەسە فڕوفیشاڵ، گەلێك شوورەییە بۆ ئێوە کە لە تواناتاندا هەیە و هێزی بەرخودانتان تێدایە، بەڵام بەشتان هەر بۆتە نەقاڵی و فڕوفیشاڵ و جەفەنگی سەر کۆڵانان.

زۆری پێنەچوو کە خەڵك بڵاوەیان لێکرد. کاتی شێوی نیوەڕۆ هاتبوو. چوومە تەنیشت مام نەسۆرەوە و لێم گێڕاوە کە بچین بۆ ماڵی خۆمان. ئەو بە چاکی منی نەدەناسی، هەر بۆیە لێی پرسیم:

ـ کوڕی کێیت؟

ـ کوڕی وەنەوش.

ـ وەنەوشی ناوخاس یان وەنەوشی بەختیار؟

ـ وەنەوشی ناوخاس.

ـ ئای، کوێرایی چاوەکانمە بۆ ناوخاس. دەك دونیا سەر و بنت ببێتە یەك وا ئەوەندە بێبەزەییت.

ـ ئەی وەنەوش چۆنە؟

ـ باشە و دەتوانی بیبینی.

خۆڵکم کرد و لەگەڵ مام نەسۆر پێکەوە هاتینەوە بۆ ماڵی خۆمان. دایکم زۆری پێخۆش بوو کە خاڵە نەسۆرم هێنابوو بۆ ماڵ و بە گەرمی چاکو چۆنی لەگەڵ کرد. بۆ خوانی نیوەرۆ، شەلەمەوامان هەبوو.

دووجاران قاپەکەم بۆ پڕ لە شەلەمەوا کرد و خواردی، پاشان گوتی:

- لە مێژە شەلەمەوام نەخوارد بوو و تامەزرۆی شێوێکی وا بووم.

مام نەسۆر تاکو دەرەنگانێکی ئێوارێ لامان دانیشت و شێوی ئێوارەشمان پێکەوە خوارد، پاشان بە چرایەکەوە کەوتمە پێشی هەتاکو گەیاندمەوە ماڵەکەی خۆی. چرا فانۆسەکەیم هەڵکرد و کوورەی ئاگرەکەم پڕ لە دار کرد و بۆم وەگرمە خست. دەست و پلم هەموو ڕەش ببوون، ماڵێکی دورنجی و شپرزە، کە دەستت بۆ هەرچی دەبرد، خێرا ڕەش دەبوو. لێمپرسی:

- چۆن دەتوانی بەمجۆرە گوزەران بکەی؟

- کوڕی خۆم پێموابوو مرۆڤێکی تێگەیشتووی. ئەتۆ بەم حاڵە دەڵێی گوزەران، یان دەتهەوێ ناوی ژیانی لەسەر دابنێی؟

درێژەی داو گوتی:

- جارێ وەڵامێکم بۆ پرسیارەکەت نییە، چونکە وەڵامی پرسیارەکەت بەسەرهاتێکی دوورودرێژە. ئەگەر دەرفەتت بۆ ڕەخسا، لە کۆتایی ئەم مانگەدا سەردانم بکە، تاکو وەڵامی پرسیارەکەت دەستدەکەوێ.

مام نەسۆرم بە جێهێشت و گەڕامەوە ماڵ. پاش چەند چرکەیەك دایکم هات و ڕێك لەپاڵ دەستم دانیشت. لێی پرسیم:

- ژیان و گوزەرانی مام نەسۆر چۆن بوو؟

ـ پرسیارم لێکردووە، بەڵام وەڵامێکی وای نەداوەمەتەوە. وابزانم بەو ماڵە شەق و شڕەوە کە دووڕنج کون و قوژبنی داپۆشێوە، ناکرێ ناوی گوزەرانی لەسەر دابنێین. وام داناوە لە کۆتایی ئەم مانگەدا سەردانی بکەم، بەڵکو لەسەر ژیانی خۆی بۆم بدوێ.

ئێمە لە باسکردنی چەند و چۆنی ژیانی مام نەسۆردا بووین، کە لە دەرگای حەوشەکەمان درا. چوومە دەر، دەبینم مامۆستا جوامێرە. ئێوارە باشم لێکرد و خۆڵقم کردە ماڵەوە. ئەویش هەواڵی دایکمی پرسی و گوتی:

ـ ئێستا کاتی ئەوەم نییە. نووسراوەکەتم خوێندەوە و پێی خۆشحاڵم کە ئاوا شێلگیر بی لەسەر ڕاپەڕاندنی ئەرکی ڕۆژانەش.

بەدوای ئەوەدا پێی ڕاگەیاندم کە ئامادەیە هەموو ئێوارەیەك، لەنێوان کاتژمێر شەش تاکو هەشت، بۆ فێربوونی خوێندن و نووسین بە کوردی یارمەتیم بکا.

بۆ ئەوەی بە یەکجاری دڵنیا بم، پرسیم:

ـ کەسی دیکەش هەیە کە دەیهەوێ کوردییەکەی باشتر بکا، ڕات سەبارەت بەوە چییە؟

ـ من چ گرفتێك لەو پێوەندییەدا نابینم و شانازیشی پێوە دەکەم کە بتوانم خزمەتی گەنجان و لاوانی وڵاتەکەم بکەم.

مامۆستا گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و منیش یەکڕاست کەژاڵم ئاگادار کردەوە. هەردووکمان بڕیارماندا کە لە سبەی ئێوارەوە دەست بە خوێندنی زمانی کوردی بکەین.

بۆ بەیانی چوومە دوکان و ئەو کەلوپەلانەی کە بۆ خوێندن و نووسین پێویست بوون کڕیمن و ئێوارەی هەمان ڕۆژ کاتژمێر چارەك بۆ شەش، بەرەو ماڵی مامۆستا وەڕێ کەوتین. بە کۆڵانەکاندا کە دەچووین، لەگەڵ جۆرە چاولێکردنێکی خەڵکی دێ بەرەوڕوو دەبووین. پێموابوو کە خەڵك وا هەستیان دەکرد کە پێوەندییەکی شاراوەمان لەنێوان دا بێ.

گەیشتینە ماڵی مامۆستا و لەگەڵ پێشوازی گەرمی ئەندامانی بنەماڵەیان بەرەوڕوو بووینەوە. ماڵی دادە جەیران و مامۆستا جوامێر گەلێك کراوە و لەسەر دڵان بوون. ئێمە لەگەڵ مامۆستا چووینە ئەو ژوورەی کە چنار و بەهاری لێ دەنووستن. مامۆستا پێی گوتین کە لە ماوەی دوومانگدا فێری کوردی دەبین. ئەو گوتی:

ـ ڕاستە، ئێمە کوردین و کەسیش بە دۆی خۆی نالێ ترشە، بەڵام پاراوترین و دەوڵەمەندترین زمانمان هەیە کە مرۆڤ دەتوانێ بەبێ گرفت فێری بێ. هەڵبەت لە بیرتان نەچێ کە کاتێك دەڵێم دەوڵەمەندترین، بەو مانایە نییە کە وشەی زۆرمان هەبێ، یان بە هاوتای زمانی ئینگلیسی دانێین. دەوڵەمەندیی زمانی کوردی هی بوونی چوار زاراوەی گەورەی کوردییە، کە زمانی کوردی کردۆتە دونیای شێعر و هەڵبەست، لاوك و حەیران، هۆرە و هۆزان و وەك گوڵ و گوڵزارێکی بێ هاوتا خۆی دەنوێنێ.

ئەو درێژەی داو گوتی:

ـ ئەوەی لە کاتی لێدوان دا بەزارت دا دێ، دەنووسرێ و وشەی بێکەڵك لە کوردی دا زۆر کەم دەبینی، بۆ وێنە لە کوردیدا پێویست بە بوونی چەند وشەی "ز" ناکا کە لە فارسیدا دەبنە هۆی گرفت. وەك: (ز،

چ، ژ، ڤ) یان ( ت، گ ) یان (س، پ، ص) و هیتر، که پێویست ناکا هەر ئەمڕۆ لەسەر هەموویان بدوێین.

ئەو دەستی کرد بە شیکردنەوەی پیتەکان و دابەشکردنیان بە پیتی دەنگدار و بێدەنگدا ( بزوێن و نەبزوێن).

لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی زمانی کوردی چ لە کاتی نووسین و چ لە خوێندنەوەدا، بۆی شیکردینەوە کە هەر وشەیەك کە بە زاردا دێت دەنووسرێ و دەنگەکەشی هەروەك خۆیەتی، بەبێ ئەوەی ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆیان بەسەردا بێ.

بەدوای ئەو ئێوارانە دا، ئێمە بەبێ پسانەوە تاکو چوار حەوتوو بەردەوام بووین لە خوێندن. بەفربارین هەرای دەکرد و کۆڵانەکانیش پڕ بوون لە بەفر و خەڵکیش پێ خۆشحاڵ بوون دەیانگوت ئەمساڵ ئاو زۆر دەبێ. حەوتووی پێنجەم دەستمان کرد بە نووسینی هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانەمان. لە حەوتووی شەشەم دا هەرکەسە و کتێبێکی پێدراین، کە دەبووا بمانخوێندبایەوە و لێکدانەوەی خۆمان لەسەر نووسیبا. بۆ ئەم مەبەستەش حەوتوویەك مۆڵەتمان هەبوو. کتێبێك کە بەر من کەوتبوو لەسەر ڕووداوەکانی ئاخروئۆخری شەڕی یەکەمی جیهانیی و دەسەڵاتی عوسمانیەکان و هاتنە سەرکاری کەمالیستەکان، پەیمانەکانی سێوڕ و لۆزان لەساڵەکانی ۱۹۲۰ و ۱۹۲۳ بوو.

پاش خوێندنەوەی کتێبەکە، بەو ئاکامە گەیشتم کە پەیمانی سێڤەر تەنیا لەسەر کاغەز ماوەتەوە. لە پەیمانی لۆزانیش خەتێکی ڕەش بە سەر پەیمانی سێڤەر دا دێ و بەڵێنەکانی زلهێزەکانیش لەسەر دروستبوونی

وڵاتی کوردان دەبنە بلّقی سەرئاو. بەجۆرە لە ڕێکەوتی ٥ ی ژوئەنی ساڵی ١٩٢٦ی زایینی دا (١٦ی جۆزەردانی ساڵی ١٣٠٥ی هەتاوی)، کوردستان کە تاکو پێش شەڕ تەنیا لەنێوان دوو وڵاتدا دابەش ببوو، بەبێ ویستی خەڵکەکەی و بە پیلانی وڵاتانی زلهێز، کراوە بە چوار بەش.

لە حەوتووی حەوتەم دا لێکدانەوەی خۆمان لەسەر کتێبەکان نووسی و دامانەوە بە مامۆستا و بەردەوامیش بووین لە خوێندن دا. لەو ماوەیەدا کە من و کەژاڵ دەمانخوێند، لەنێو گوندەکەماندا ببوو بە چلوچاو کە شوان و کەژاڵ وەك لفانەیان لێ هاتووە. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە ئێمە بێجگە لە هاوڕێیەتی چ پێوەندییەکی دیکەمان نەبوو. کەژاڵ و چناریش دەستە خوشکی یەکتر بوون و هێندە دۆستایەتییان گەرم بوو، کە هیچ شتێکیان لە یەکتر نەدەشاردەوە و منیش هیچ جیاوازییەکم لەنێوانیان دا دانەدەنا. بە واتایەکی دیکە من لەگەڵ هەردووکیان هاوڕێ بووم.

لەو ماوەیەدا حەوتووی جارێك سەردانی شێرزاد و بێگەردم دەکرد. بێگەرد منداڵێکی ببوو کە ناویان نابوو هەژین. شێرزادیش باری لەش ساغی بە تەواوی چاك ببوو. زستانێکی سەخت بوو، بەفرباری و کرێوەی سارد بەردەوام بوو. من مام نەسۆرم لە بیرچوو بوو کە دەبا سەردانم کردبا. ڕۆژێکیان کە لە ماڵی مامۆستا خەریکی خوێندن بووین، پێشنیارم بە چنار و کەژاڵ کرد تا پێکەوە سەردانی مام نەسۆر بکەین. ئەوان قبوڵیان کرد و وامان دانا کە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە هێندێك کەلوپەل و خوارەدمەنی بۆ ببەین و بچین بۆ لای. لەو لاشەوە لە حەوتووی کۆتایی خوێندن دا بووین. ئێمە(من و کەژاڵ و چنار) دەمانتوانی بە کوردی

بنووسین و بخوێنینەوە. تەنیا چاوەڕوانی مامۆستا بووین تاکو دوایین بڕیار بدات. لە ئێوارەی ڕۆژی سێشەممەدا کە مامۆستا لەگەڵمان دانیشت، بەمجۆرە رای خۆی لە سەرمان دەربڕی:

ـ پڕ بەدڵ پیرۆزباییتان لێدەکەم. دەتوانم بە دڵنیاییەوە پێتان بڵێم کە ئێوە قوتابیانی زۆر سەرکەوتوون. چاوم لە نووسراوەکانتان کردووە و شانازیتان پێوە دەکەم. هیوادارم کە لە بردنەسەری زانیاری کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریتان شێلگیرتر بن و هزر و بیری نەتەوریی بکەنە بنەمای تێکۆشان و چالاکییەکانی دوارۆژتان. ئەوەی ئەرکی من بێ سەبارەت بە ئێوە و لە بۆ فێربوونتان بۆ خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکی، بە جێم گەیاندووە. ماوەتەوە پێتان بڵێم سەرکەوتنتان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ئاواتمە. ئێمەش بە تێکڕا سوپاسی زەحمەت و ماندووبوونی مامۆستا و دادە جەیرانمان کرد.

من و کەژاڵ دەستمان کرد بە چپە چپ و خەریك بووین سەبارەت بە حەق و زەحمەتی مامۆستا ڕاوێژمان دەکرد، کە لە پڕ مامۆستا ڕووی تێکردین و گوتی:

ـ نامەوێ سەبارەت بەوەی کە باسی دەکەن گوێم لە تەنیا یەك وشەش بێ. ئێوەش وەك چنار و بەهارن بۆ من و چاوەڕوانی هیچ پاداشێکیش نە لە ئێوە و نە لە کەسێکی دیکە نیم.

لە کۆتاییدا هەرکەسە و کتێبێکی بە دیاری پێدایین. ئێمە نەماندەزانی چۆن و بە چ شێوەیەك وەڵامی ئەو هەموو چاکەی ئەو بنەماڵەیە بدەینەوە. لەو ماوەیەدا، بەهار، کچی چووکەی مامۆستا

هەستێکی تایبەتی سەبارەت بە من هەبوو. هەموو ئێوارەیەك وشەیەکی بە کوردی دەنووسی و دەیدامێ. ئەو دەیگوت:

- بیخوێنەوە و مانا فارسیەکەیم پێ بڵێ. منیش زۆر جاران نەمدەزانی و، ئەویش پێم پێدەکەنی، کە لەگەڵ ڕەخنەی چنار بەرەوڕوو دەبۆوە.

بۆ دوایین ڕۆژ، بە بەهارم گوت:

ـ ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تۆڵەت لێبکەمەوە.

ـ ئا دەی.

ـ دەتوانی هاوتای وشەی لێرەوار کە کوردییە، مانا فارسییەکەیم پێ بڵێی؟

ئەو هێندێك خۆی بەملاو بەو لا دا سووڕاند و گوتی:

ـ بە فارسی دەبێتە جەنگەڵ، بەڵام لە بیرت نەچێ کە وشەی دارستانیش کوردییە و دەتوانی کەڵکی لێوەرگری.

پاشان ئێمە ماڵئاواییمان لێکردن و هەر کەسە و بەرەو ماڵی خۆمان گەڕاینەوە.

دەنگۆی پێوەندی نێوان من و کەژاڵ و چنار بە ڕادەیەك لەنێو ئاوایی دا دەنگی دابۆوە تا وای لێهات کە لە هەر کوێ تووشی خەڵك دەهاتم پیرۆزباییان لێدەکردم و دەیانگوت:

ـ هیوادارین بە یەکێکیان تێر بخۆی، کاکی مافخواز.

گەلێك تێکۆشام بیسەلمێنم کە خەڵك بە هەڵە تێگەیشتوون و لەو پێوەندییەدا هیچ کەینوبەینێکی نهێنی و شاراوە لە گۆڕێدا نییە، بەڵام کێ بڕوای دەکرد؟ بگرە لەوەش نالەبارتر، هاوڕێکانی خۆم دەیانگوت:

ـ باش کەوتوویتە قۆرخی دەژ و نازانی لەگەڵ کامیان ڕابوێری. زۆر چاکە، واتلێهاتووە بەشەوانە لەسەر پشتی چنار شەوگار تێدەپەڕێنی و بە ڕۆژانەش لەسەر زگی کەژاڵ. وا نانت لە ڕۆن کەوتووە کە نازانی کامە پاروو هەڵگریی!

ئەوەی ڕاستی بێ گەلێك نیگەرانی ئەم چلوچاوە بووم. بۆ خۆم هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە دەبێ بابەتەکە لەگەڵ چنار و کەژاڵ بێنمە گۆڕێ.

سەرلە بەیانی ڕۆژی پێنجشەممە لە دەرگای ماڵی دادە خاسپەریم داو هەواڵی کەژاڵم پرسی. کەژاڵ هاتە دەرکی حەوشە و پاش هەواڵپرسیی، پێمگوت:

ـ چنار ئاگادار کەوە تاکو پێکەوە بچین بۆ لای مام نەسۆر. ئەو بەڵێنی دا کە چنار ئاگادار بکاتەوە، پاشان لێی پرسیم:

ـ زانیوتە خەڵکی دێ چیمان پێدەڵێن؟

ـ ئەگەر سەبارەت بە نێوانی من و ئێوە بێ، بەڵێ.

ـ ڕات چییە؟

ـ لە کۆمەڵی ئێمەدا زۆر جار مرۆڤ دەبێتە قوربانی داب و نەریتە کۆنەکان. هەربۆیە نامەوێ خۆم بەو جۆرە دەنگۆیانەوە ماندوو بکەم و زاری خەڵکیش بە من نابەسترێ و خەڵك چۆنیان پێخۆشە با وابڵێن.

ـ ئەی بۆخۆت چۆن لەسەر ئەم بابەتە بیردەکەیەوە،کەژاڵ؟

ـ من لە مێژە گوێم لەو لیتکە و پیتکە هەڵبەستنانە بووە و هەر بەبای خەیاڵیشمدا نایە.

ـ ئەی هەڵوێستی دادە خاسپەری چۆنە؟

ـ دایکم دەڵێ زۆر کەس لە بێکاری نازانن چی بکەن و کاریان بۆتە لیتکە و پیتکە هەڵبەستن بەم و ئەودا و بەمجۆرەش تەنیا خۆیان لۆمە دەکەن، بێجگە لەوەش ئەو پێوایە ئەمە نەخۆشییێکە کە ڕیشەی لە دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی دایە و هەندێکیش لە بەخیلییان ئەم دەنگۆیانە بڵاو دەکەنەوە.

بەدوای ئەوەدا هاتمەوە بەرەو ماڵ و هێندێك خۆم خەریك کرد بە نووسراوە و بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوەیی خۆمەوە، پاشان هێندێك پەتاتەم بۆ نیوەڕۆ کوڵاند.

زۆری پێنەچوو کە دایکم هاتەوە و پێکەوە نانمان خوارد. ئەویش بەش بە حاڵی خۆی چەند پرسیاری سەبارەت بە چلوچاوی نێو ئاوایی، لێکردم و گوتم:

ـ دڵنیا بە هیچ کارێك بەبێ ئاگاداریت ناکەم، بەتایبەت سەبارەت بە پێکهێنانی ژیانی هاوبەش.

تۆف و کرێوەیەکی سارد لەگەڵ دەمەکردنی بەفر، دیمەنێکی چۆڵی دابووە گۆڕەپانی دێ و بە دەگمەن کەسێکم دەدی هاتوچۆ بکا. بە مەبەستی کڕینی هێندێك شتوومەك بەرەو دووکانی نێو دێ وەڕێ کەوتم و ئەو شتانەی کە پێویست بوون کڕیمن و هێنامنەوە. خەریکی تاوتوێکردن و دامەزراندنی کەلوپەلەکان بووم، کە کەژاڵ و چنار پێکەوە وەژوور کەوتن.

سێ کەسی بەرەو لای مام نەسۆر ڕچەی بەفرمان شکاند و دامان لە دەرگای ماڵەکەی کە بە تەنەکەی ڕۆن دروستکرابوو. مام نەسۆر دەنگی هەڵبڕیی و گوتی:

- توانای هەستانم نییە. دەرگا ئاواڵەیە و هەرکەس هەی وەرە ژوورەوە.
ئێمە چووینە ژوورەوە و لەسەر بەڕە شڕ و خۆڵینەکەی دانیشتین و پاش هەواڵپرسی، هەرکەسە و خۆمان پێ ناساند.
(کەژاڵ، کچی خاسپەری و هەیاسی بێسەر و شوێنکراو. چنار کچی جەیران و مامۆستا جوامێر. شوان کوڕی وەنەوش و ناوخاسی لە سێدارە دراو.)
مام نەسۆر گەلێك خۆشحاڵ بوو لەو بەسەرکردنەوەیە و گوتی:
- ئادەی ئازاکەن چاییەك دەم کەن.
ئێمە بە تێکڕا گوتمان چا ناخۆینەوە.
- ئێوە ناخۆنەوە، بەڵام من دەخۆمەوە.
چنار هەستا و کترییەکەی پڕ کرد لە ئاو و لەسەر کوورەکەی دانا. هێندە دۆرنج و دوکەڵ لەسەر کەلوپەلەکانی مام نەسۆر نیشتبوو، کە دەستت بۆ هەر چی دەبرد، وەکو چاڵە خەڵوز تۆزی لێهەڵدەستا. ئاو هاتە کوڵ و پوختێك چاییم بەستە بانی. چایی دەمی کێشا و سێ چوار پیاڵەم لە سەریەك بۆ مام نەسۆر تێکرد.
ئەو جارێکی دیکە بەخێرهاتنی کردین و گوتی:
- ئەوە دوو ڕۆژە کە هیچم پێ ناخورێ و لە پەلوپۆ کەوتووم.
کەژاڵ گورج هەستا و تەڕاوێکی لە دۆین بۆ لێنا. مام نەسۆر دوو جامی لەسەریەك و بە گەزگوپ خواردەوە. ئەو هێندێك وزەی وەبەرهاتەوە و ئەو جار پرسیی:
- مامۆستا جوامێر چۆنە؟

چنار سوپاسی کرد و گوتی:

ـ لەبەر ساردی هەوا هیچی پێ ناکرێ و جاروباریش خەریکە بە نیلە و هێش دروستکردنەوە و خۆی تەیار دەکا بۆ کشتوکاڵی وەرزی بەهار.

منیش (شوان)، داوای لێبووردنم لێکرد کە درەنگ سەردانم کردووە. وادەردەکەوت کە مام نەسۆر لە گیانی خۆی ئاسی بوو. گەلێك لە خەڵکی ئاوایی بەگشتی و لە لاوەکان بە تایبەتی بە گلەیی بوو. ئەو گازندە و سکالاکانی خۆی لەسەر ژیانی خۆی و کۆمەڵگا بەمجۆرە بۆ گێڕاینەوە.

«من لە دایك بووی ساڵی ۱۹۰۵م و ئێستاش ۷٦ ساڵم تەمەنە. دایکم خەڵکی شاری حەڵەب و بابیشم خەڵکی قامیشلییە. هێشتا تەمەنم یازدە ساڵ بوو، کە دایکم حاڵ بردی و تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشت. ساڵێك لە مردنی دایکم تێنەپەڕیبوو، کە بابم لە لایان عوسمانییەکانەوە بێ سەروشوێن کرا، کە ئێستاش کەس نازانێ چی بەسەرهات. ماڵی پورم منیان بردە لای خۆیان و لەوێ کرام بە بەرخەوان. چەند ساڵێك بە نانە زگی بەرخەوانیم کرد. لە نۆزدە ساڵیدا تووشی نەخۆشی سیل هاتم و پوریشم هەر ئەو ساڵە کۆچی دوایی کرد. لەو سەردەمە نەخۆشی سیل خراپترین نەخۆشی بوو. هەر بەو هۆیەوە کەس منی وەخۆیەوە نەدەگرت. ئەوکات سنووری دەستکرد لەنێوان بەشەکانی وڵاتی حاشا لێکراوی کوردان دا وەك ئێستا نەبوو. خەڵك دەیانتوانی هاتوچۆی کەسوکاریان لەم دیو بۆ ئەودیو بکەن. تاکو لە ساڵی۱۹۲۵ لەگەڵ دەستەیەك کاروانچی بەرەو شاری موسڵ وەڕێ کەوتم. وەرزی بەهار بوو منیش باری لەشساغیم بەدەست نەخۆشی سیلەوە زۆر خراپ بوو. ئێوارە وەختێکی گەیشتینە سەر

چۆم و ئاوێك كە دەبا لێی پەڕیباینەوە. كاروانچییەكان هەر هەموویان مەلەیان دەزانی و لە ماوەیەكی كورتدا لە ئاو پەڕینەوە. من مەلەم نەدەزانی و بێجگە لەوەش بە هۆی نەخۆشییەوە گەلێك كز و لاواز بووم. هەر چەند نەخۆش بووم و هیچ هیوایەكیشم بە چاكبوونەوە نەبوو، بەڵام ژیان لام خۆش بوو. سوورسووریش دەمزانی كە ئەگەر لە ئاوەكە بدەم، بە جارێك هەڵم دەپێچێ و وەك گلۆڵە بەن وەبەرخۆیم دەدا. سەرەڕای ئەوەش بڕیارمدا بدەم لە ئاوەكە. بە مەبەستی پەڕینەوە ملم پێوەنا و تاكو ئاو ناوكمی گرت. هەركە گەیشتمە قووڵایی ئاوەكە، نە دەمتوانی بەرەو پێش بڕۆم نە بەرەو دوا. چاوم لەملاوئەولای خۆم كرد دیتم هەموو عەرزەكە لەگەڵما دەسوڕێتەوە. لەپڕێك دا ئەوەندەم زانی كە ئاو هەڵی گرتم و ڕایپێچام بەرەو لێژی. هاوارم كرد ئاو بردمی و ئەوەندەم ئاگا لە خۆ بوو كە ئاوەكە چەندین جاران سەرمەقولاتانی پێكردم. پاش ئەو سەرمەقولاتانە چیم بە سەر هاتبێ، ئاگام لە هیچ نەبووە. كاتێك وەهۆش هاتمەوە، دەبینم بە دەمەوە ڕاكشاوم و پەیتا پەیتا دەست بە پشت و زگمدا دێ و هەر ئاو هەڵدەڕێژمەوە. خەڵكێكی زۆر لە دەورم كۆ ببوونەوە. لەنێو هەمواندا تەنیا یەكێك لە كاروانچییەكانم دەناسیەوە. كاروانچییەكە هاتە لامەوە و پێی گوتم:

ـ خەمت نەبێ، لە مردن ڕزگارت بووە و من دەبێ بچم، ئەگینا لە كاروان بە جێدەمێنم. ئەتۆش لێرە بمێنەوە تاكو لەو لاوە دەگەڕێمەوە و دێم بۆ لات.

ئەو خەڵکەی کە لەوێ بوون، گوێدرێژێکیان هێنا و منیان لێ سوارکرد. کە گەیشتینە خواری دێ، لەوێ پێیان گوتم کە دەبێ بمبەنە ماڵی ئاغا.

کە گەیشتینە ماڵی ئاغا، یەکێك لە مزیورەکانی ئاغا هاتە پێش و پرسیاری چۆنیەتی ڕووداوەکەی لێکردم، کە خەڵکەکە بۆیان گێڕاوە، پاشان منی بردە ژوورێك و بڕێك جلوبەرگی وشکی بۆ هێنام و لە بەرم کردن. چێشتیان بۆ هێنام، بەڵام هیچم پێنەخورا. جێگایان بۆ ڕاخستم و لێفەیەکیان بە سەرمدا دا. لە چارپێکدانانێکدا نەمزانی شەوە یان ڕۆژ.

شەو درەنگانێك لە تینوان وەخەبەرهاتم، بەڵام نەمدەزانی کونەڵان و ئاوەکە لە کوێیە. هێندێك پاڵم داوە و بیرم لە چۆنیەتی ڕۆژی ڕابردوو دەکردەوە، کە کاکی مزیور، کە ئەویش لەو ژوورەی لای من نووستبوو هەستا و پرسی:

- برسیتە؟

- نە، بەڵام تینومە.

- دەك ماڵت نەشێوێ. ئەتۆ هەر ئەم ئێوارەیە بەشی شەشمانگت ئاو هەڵلوشیوە و هێشتاش تینوتە!؟

هەستا و جامێك دۆی بۆ هێنام، کە بە ڕاستی تاسەم دەکرد. ئێمە نووستینەوە و بەیانی کە ڕۆژ هەڵهات منیان برد بۆ لای ئاغا. ئاغا پرسیاری چۆنایەتی ژیانی خۆم و بنەماڵەمانی لێکردم و منیش هەرچیم بەباش زانی، بۆم گێڕاوە، پاشان پێی گوتم کە دەتوانم لە ماڵی ئەوان بمێنمەوە تاکو کاروانچییەکان لە شاری موسڵ دەگەڕێنەوە.

ئیتر ڕۆژ دەهاتن و ڕۆژ دەچوون تاکو وایلێهات من وردە وردە لەگەڵ کرێکار و ورزێر و خزمەتکارەکانی ماڵی ئاغا ئاشنا بووم. ڕۆژێکیان یەکێك لە ئەسپەکانی ئاغام زین دەکرد، کە بۆ خۆی چاوی پێمەوە بوو. بانگی کردم و گوتی:

ـ ئەگەر پێت خۆشبێ دەتوانی لە ماڵی ئێمە بمێنیەوە و بەسەر ئەسپ و ئێسترەکان ڕابگەیت.

منیش کە لە حەوت ئاسمان ئەستێرەیەکم شك نەدەبرد، گوتم:

ـ بەڵێ، هەر چۆنێك ئێوە بفەرموون من ئامادەی خزمەتم.

بێجگە لەوەش دۆستایەتییەکی باشم لەگەڵ یەکێك لە نۆکەرەکانی ئاغا پێك هێنابوو و هێندە متمانەم پێدەکرد کە باسی نەخۆشییەکەی خۆمم بۆ کرد.

ـ ئامان سەد ئامان نەسۆر، ئەمەی بۆ منت گێڕاوە، قەد بۆ کەسی دیکەی نەگێڕییەوە، چونکە ئەگەر بزانن نەخۆشییەکی وات هەیە، لێرەت وەدەر دەنێن.

ـ دەزانم، بەڵام چارم چییە؟

ـ لوقمانێك (دوکتۆری گیایی، یان سروشتی) دەناسم کە لەوانەیە یارمەتیت بکا.

ڕۆژێکیان سەر لە بەیانی زوو ئەو کرێکارەی ماڵی ئاغا کە ناوی شالی بوو و پێکەوە هاوڕێ بووین، هات و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ماڵی کاکی لوقمان. ئەو تا چاوی لە نێوچاوانم کرد، بەبێ ئەوەی من هیچ بڵێم، گوتی:

ـ تۆ تووشی نەخۆشی سیل هاتووی.

پاش هێندێك پرسیار و وەڵام، چوو دەرمانێکی بۆ هێنام و گوتی:
ـ ئەمە حەوت دەرمانەیە و لە ڕیشە و توێکەڵ و گژوگیا و گەڵای دار دروستکراوە. بۆ تاقیکردنەوەش بێ، دەبێ ئێستا نەختێکی لێ بخۆی. منیش هێندێکم لێنایە سەر زمانم، ژاری ماریم بەلاوە وەك نوقڵ بوو.
"لەو کاتەی مام نەسۆر ئەوەی گێڕاوە، وەبیری دووپشك پێوەدانی خۆم و خواردنی زراوی بەرازەکە کەوتمەوە کە شێرزاد لە ئەشکەوتەکە پێیدام".
سەرتان نەیەشێنم، من لە ماوەی مانگێکدا کە لەو دەرمانەم دەخوارد، ئاڵوگۆڕێکی باشم بەسەردا هات. پاش مانگێك و تەواوبوونی دەرمانەکە، بۆ جاری دووەم چووینەوە لای لوقمان و دیسان دەرمانی تازە دروستکراوی پێدام.
لەوە بەدواوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چاك و چاکتر دەبوومەوە. لەو ماوەیەدا کە من لە ماڵی ئاغا بووم، هیچ هەواڵێك لە کاروانچییەکان نەهات. وادیاربوو کە کاروانچی هاتبوون و ماڵی ئاغا پێیان گوتبوون کە لێرە دەمێنێتەوە. هەرچی کات تێدەپەڕی باری لەشساغیم باشتر دەبوو و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش خۆشەویستتر دەبووم. تاکو وایلێهات ئاغا لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ ڕاو، بۆ سەردان لە ئاغاکانی دیکە و لە داوەت و داوەتکاریەکان، بێجگە لەوانەش بە شەوانە فێری خوێندن و نووسینیان کردم. لە سەریەك زیاتر لە دوو ساڵ لە ماڵی ئاغا مامەوە و کارم بۆ دەکردن. جل و پێڵاو، خواردن و نووستن و هەموو خەرجم لەسەر ماڵی ئاغا بوو، ڕاستە هیچ دراوێکم لە لایان ماڵی ئاغاوە پێ نەدەدرا و بە نانەزگی کارم دەکرد، بەڵام ئەو ماڵە یارمەتییەکی شیاویان پێکردم، کە

هەم لە دەست نەخۆشی مەرگ هێنەری سیل ڕزگارم بوو، هەمیش فێری خوێندن و نووسینی کوردی بووم. لەوانەش گرینگتر تێکەڵ بە دونیای سیاسەت و ئاشنا بوون بە چارەنووسی نەتەوەیەك، کە ببووە پارسەنگی تەرازوو بۆ فەرەنسییەکان و ئینگلیسییەکان، چونکە مەگەر بە دەگمەن شەو باسی دەوڵەتی عوسمانی، کۆلۆنیەکانی ئینگلیس و فەرانسە و چارەڕەشی کورد نەکرابا.

ئێمە، هەرسێکمان وا چووبووینە ناخی لێدوانەکەی مام نەسۆرەوە، کە بگرە خۆشمان لەبیر چووبوو. ئەو هەر چەند خولەکێك جارێ هەناسەیەکی بە کوڵی هەڵدەکێشا کە بەردی دەتواندەوە.

داوای چایەکی کرد و منیش لە چایە کۆنەکەم بۆ داکرد و خواردییەوە.

ئێمە وا چووبووینە نێو بەسەرهاتی مام نەسۆرەوە، کە هەروات دەزانی سواری پاپۆڕێکی گەورەین بەسەر شەپۆلی زەریاوە، کە لە تاریکایی شەودا بەرەو ئامانجێکی نادیار دەچێتە پێش. مام نەسۆر لە درێژەدا گوتی:

ـ پاش دوو ساڵ مانەوە لە ماڵی ئاغا، بڕیارمدا ئەوێ بەجێ بێڵم و بە دزی ماڵی ئاغاوە و لەوێشەوە قۆناغ بە قۆناغ گەیشتمە هەولێر و ڕێگای ناوچەی بارزانم گرتە بەر، چونکە هەموو شەوێك لە ماڵی ئاغا باسی بارزانیان دەکرد و ئاغا بۆ خۆی دەیگوت لەو ناوچە بەرهەڵستکاریی بەدژی دەوڵەتانی تورکان و عێراقی تازە دروستکراو بە هێزە. بەگەیشتنم بۆ ئەو ناوچەیە خۆمم ناساندە شۆڕش و بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕانەوە. پێشوازییەکی چاکم لێکرا و پێیان گوتم کە ئێرە وڵاتی خۆتە و کەسیش لە هەنات خاوەن ماڵ نییە. ئیتر لەوێ تێکەڵ بە کاروانی پێشمەرگە بووم و

شەڕیش بەردەوام بوو تاکو ئاخر و ئۆخری شەڕی دووەمی جیهانیی و پێکهاتنی کۆماری کوردستان بە سەرۆك کۆماری قازی محەممەد. ئەودەم منیش وەك کوردێك لەگەڵ زۆر کەسی دیکەدا خۆمان گەیاندە مەهاباد و لەلایان پێشەوا و خەڵکی ئەو شارەوە بە گەرمی پێشوازیمان لێکرا. ئەوەی ناوی ژیان بێ، ئەو یەك ساڵە بوو کە خۆمان دەسەڵاتمان بەسەر بەشێك لە وڵاتەکەماندا هەبوو. ئێستاش بە دوای ئەو هەموو کۆسەڵکۆسەدا چۆن گەیشتوومەتە ئێرە، بۆ خۆی بەسەرهاتێکی دوور و درێژە کە لە گێڕانەوە نایە. ئەوەتا بۆ خۆتان دەبینن کە ئێستا بە کاسە هاوسێیی دەر و جیرانان دەژیم و خاوەن هیچ سامانێك نیم و لە وڵاتی خۆم وەك پەنابەرم. ئێوە کە ئێستا لام دانیشتوون، جێی خۆیەتی سەبارەت بە دوو بابەت کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی ئێوە و کۆمەڵی خۆمانەوە هەیە بۆتان بدوێم. یەکەمیان ئەوەیە کە ئێوە نابێ چیدی ببنە داردەستی هیچ تاقم و ڕێکخراوێکی خۆماڵیی و دەرەکی. جا ئەوانە چەپ بن یان ڕاست، هیچ جیاوازییەکیان لەنێواندا نییە، چونکە ئەوان بە چەپ و بە ڕاستیانەوە، بە دوای قازانج و بەرژەوەندیی خۆیانەوەن و هەر کاتێکیش هەست بکەن بەرژەوەندیەکانیان لە مەترسیدایە، پشت لە هەموو پێوەندیی و دۆستایەتییەك دەکەن. مادام ئەوان بەدوای بەرژەوەندیی ئابووری و نەتەوەیی خۆیان و داسەپاندنی دەسەڵاتی پاوانخوازانەی خۆیانەوەن، بۆ ئێمەش ڕەوایە کە دۆست و نەیاری خۆمان باش پێناسە بکەین. ڕووداوەکانی ئەم سەدەیە بە ئێمەی سەلماندوە کە چیدی نەبینە پارسەنگی ئاڵوگۆڕەکانی هەرێمی و بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان. واتە چیدیکە

خۆتان ماندوو مەکەن بە دانی دروشمی بێ نێوەڕۆك بە بەژن و بالآی ئەم و ئەودا، بەڵکو تەنیا بۆ بەرژەوەندی گەلی خۆتان تێبکۆشن. بۆیە ئەمەتان پێدەڵێم، چونکە دەزانم زۆربەی لاوەکانی ئێمەی کورد، گیرۆدەی ئایینێکی نوێ هاتوون، کە چ جیاوازییەکی لەگەڵ ئایینەکانی دەستکرد و داسەپاوی کولتوری بێگانە نییە. ئێوە دەبێ لەوە ئاگادار بن کە بەرزەفڕیی و دانانی ئاواتەکان لە جێگای ڕاستییەکانی نێو جەرگەی کۆمەڵ، دوو شتی بە تەواوی لێك جیاوازن. ئێوە وەك جیلی گەنج، ئەرکی گرینگتان لەسەر شانە و نابێ بە هەڵوێستی هەڵنەسەنگێندراو و لەگەڵ ڕاستیدا نەگونجاودا، خۆتان بخەنە" هەچەڵێکەوە" کە بە درێژایی مێژوودا تاکتیك و پلانی داگیرکەران بووە، بۆ لەنێوبردنی گەل و وڵاتی ئێمە. ئەوەتان بۆ مێژوو پێ دەڵێم تاکو بەباشی بیری لێبکەنەوە و شەرمەزاری دواڕۆژی گەلەکەتان نەبن، بێجگە لەوانەش، گەنج و لاوی ئێمە بەرەو ڕووی هەڕەشەیەکی گەلێك مەترسیدار بوونەتەوە. ئەوەش ئەوەیە کە نەیاران بە فێڵن و بە پلانی دارێژاو و پڕوپاگەندەی خەیاڵاوی، کولتور و کەلەپوری ئێمەیان خستۆتە ژێر تەوژمی داگیرکەرانەی خۆیانەوە. بابەتی دووەم کە دەمەوێ باسی بکەم ئەوەیە کە گەل و وڵاتی ئێمە ڕووبەڕووی دەستێوەردانێکی بێبەزەییانە بۆتەوە. لە لایەکەوە وڵاتەکەمان دابەشکراوە بە سەرچوار وڵاتدا کە ئەمە بۆ خۆی نەهامەتییەکە، کە بە سەر هیچ نەتەوەیەکی دیکەدا نەهاتووە. یان ئەگەریش وێنەیەکی دیکەی ئاوا هەبێ، من زانیارییەکم لەسەریان نییە. لە لایەکی دیکەوە دین، ئایین و ئایینزاکان بوونەتە هۆی دابڕان و لێکپچڕانی بنەما کولتوری و کەلەپوری و

نەتەوەییەکانی گەلی ئێمە، بێجگە لەوانەش خۆبەزلزانی و بیری تەسکی ناوچەیەیش، لەگەڵ دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی بوونەتە هەوێنی لێکدابڕانی زیاترمان. ئەوەشتان بۆیە پێدەڵێم تاکو بێجگە لە هێز و توانای خۆتان، چاوەڕوانی یارمەتیی لە ئەم وڵات و ئەو دەوڵەت نەکەن، تاکو ڕێگاچارەتان بۆ دەستنیشان بکەن. ڕووداوە مێژووییەکان سەبارەت بە هەڵسوکەوتی دەوڵەتانی داگیرکەر لەگەڵ نەتەوەکانی بندەست دا ئەوەیان سەلماندووە کە، بەرژەوەندییەکانی ئابووری، بنەماڵەیی و دەوڵەتی، سیاسیی و لەشکری بۆ مانەوە لە دەسەڵاتدا، لە سەرەوەی هەموو بەرژەوەندییەکانی دیکەوەیە. واتە ئەو وڵاتانەی کە بۆ خۆیان هۆی ئەم دابڕدابڕ و لێك داپچڕانەی وڵاتی ئێمەن، نابێ چاوەڕوانیی چاکە و پێکەوە ژیانی هاوچەرخیان لێبکەی. دوایین وتەیشم بەوە تەواو دەکەم و دەڵێم: دڵسۆزترین کەس بۆ خۆتان، هەر خۆتانن و بەس.

ئێمە هەر سێکمان وا بە تاسەوە گوێمان لە مام نەسۆر گرتبوو کە دەتگوت هێشتا تازەکە لای دانیشتبووین. شەو بەسەردا هاتبوو. ئێمە سوپاسی مام نەسۆرمان کرد و بەرەو ماڵ گەڕاینەوە. لە ڕێگادا ڕاوێژی ئەوەمان کرد کە لە داهاتوویەکی نیزیکدا بە سێ کەسی سەردانی بکەین و ماڵەکەی بۆ خاوێن بکەینەوە. ئەگەری ئەوەشمان هێنایە گۆڕ، گەر بێت و بۆمان بلوێ، ئەو بەسەرهاتەی مام نەسۆر بنووسینەوە.

لەپێشدا چنارمان بردە دەرکی ماڵی خۆیان و پاشان من و کەژاڵیش هەر کەسە و بۆ ماڵی خۆمان گەڕاینەوە.

کاتێك گەیشتمەوە دەرکی ماڵ، وامدەزانی لە گەردوونێکەوە هاتوومەتەوە، کە گەلێك لەگەڵ سروشتی ژیانی ڕابردووم ناتەبایە. هەر لە بەسەرهاتی سەیران و مێرمنداڵەکەیەوە بگرە، تاکو دادە خاسپەری و منداڵەکانی، هەڵوێست و هەڵسوکەوتەکانی بنەماڵەی مامۆستا جوامێر، دوکتۆر زەردەشت لە شاری ئیلام و دوکتۆر نەبەز لە شاری سەرپێڵی زەهاو و بەم دوایەش مام نەسۆر، هەر هەموویان ببوونە هەوێنی بیرکردنەوەیەك، کە پێشتر لێیان بێگانە بووم. بێگومان لەوە تێگەیشتبووم کە خاوەنی نەتەوەیەکم کە لە سەرەتاییترین مافەکانی خۆی بێبەش بوو، بەڵام بەو حاڵەش نەمدەویست دەست لە بێگانەپەرستی هەڵگرم. دڵەڕاوکە دایگرتبووم و لە دووڕیانێکدا گیرم کردبوو کە بڕیاردان هەروا سانا نەبوو. پێم شورەیی بوو کە دەست لە بەرزەفڕیی و پێداهەڵگوتن بە دایکی سۆسیالیست دا! هەڵگرم. پێم وابوو کە بە جارێك دەکەومە ڕیزی "سیخوڕەکانەوە" و هەموو ڕابردووی خۆم بە جارێك دەشۆمەوە. لە لایەکی دیکەیشەوە هاوەڵ و هاوڕێی زۆرم بوون کە نەمدەتوانی بە ئێکجاری دەستیان لێهەڵگرم، بەڵام لە هەموویان گرینگتر پڕوپاگەندەی دەسەڵاتدارانی ملهوڕ بوو کە بە پلان و بەرنامەی لەپێشدا دارێژراو، لە لایەکەوە بیر و هزری بێگانەپەرستی لە مێشکی ئێمەدا چاندبوو، لە لایەکی دیکەشەوە ناساندنی مافخوازیی و سەروەریی خوازی نەتەوەیی وەك خەیانەت و خۆفرۆشی پێناسە دەکردن.

لەو ماوەیەدا شێرزادم بە تەواوی لە بیر چووبوو. بۆ بەیانی سەردانی بێگەرد و شێرزادم کرد. ئەوان ژیانی ئاساییان دەست پێکرد بۆوە.

شێرزاد پێی گوتم کە دەیەوێ دەست لە دروشمدان هەڵگرێ و خەریکی بزگێری بێ. بەتایبەتی ئەو پارەیەی کە دوکتۆر زەردەشت لە ئیلام پێیدان، دەیتوانی دەستمایەیەکی باش بێ بۆ کاسبی کردن. باسەکانمان لەگەڵ شێرزاد دا لە هێندێك هەواڵپرسی و جەفەنگی دۆستانە تێنەپەڕی. بێگەردیش خۆی خەریك کردبوو بە منداڵەکەیەوە و جاروباریش لێی دەپرسیم:

ـ کاك شوان ئەم منداڵە لە من دەچێ یان لە شێرزاد؟

ـ جارێ زووە و هێشتا دەرنەکەوتووە کە لە کامەتان دەچێ.

لە ماڵی شێرزاد کە گەڕامەوە، دایکم ئاوی گەرم کردبوو کە خۆی بشوا. پاش ماوەیەك هات بۆ لام و لە تەنیشتم دانیشت. دەمزانیی پرسیارێکی پێیە و دەیەوێ ئاڕاستەم بکا، بەر لەوەی ئەو پرسیار بکا گوتم:

ـ ڕۆژگاری بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئێمە ڕەشە، بەڵام چارەی بەشێکیان هێندە ڕەشە کە لە گێڕانەوە نایە.

ـ وەکو کێ؟

ـ مام نەسۆر، خاڵۆ شامار میراوی گوند، دادە خاسپەری، سەیران و تۆش و زۆری دیکە.

"هەڵبەت لە هێنانە گۆڕی ئەم بابەتە مەبەستێکی تایبەتیم هەبوو. ئەوەش ئەوە بوو کە بەڵکو بە جۆرێك لەگەڵ دایکم بدوێم و وای تێبگەیێنم کە ئیتر تەنیایی بەسە و بەڵکو پێی خۆش بێ لەگەڵ خاڵۆ شامار دا دەستیان بگەیێنمە یەك. بێگومان نەمدەوێرا هەروا بەبێ سێ و دوو لەسەر

ئەو بابەتە باسی لەگەڵ بکەم و تێبینی و ڕێنوێنییەکانی پورە گەلاریژم لە پێوەندی لەگەڵ قەیرانی کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵگای خۆمانم لەبیر بوو".

- بەڵێ، ئەوە ڕاستە کوڕم. دەستەیەك لە دەستەیەکی دیکە چارەڕەشترن، بەڵام ئەوەش ئەتۆ دەیزانی هێشتا مشتێکە لە خەروار.

بۆ ئەوەی پرسیاری دیکەم لێنەکا، گوتم:

ـ دایکە گیان! ئاوەکەت گەرم بووە و دەکوڵێ.

ئەو هەستا و ئاوەکەی شیلەتێن کرد بۆ خۆشوشتن و سیپاڵ شوردن. منیش خۆم خەریك کرد بە خوێندنەوەی هیندێك نووسراوەی ڕابردووەوە. تا ئەو جلەکانی شوشت، منیش چایەکم دەمکرد. پێکەوە چاییمان خواردەوە و لەو نێوانەدا پێشنیاری کرد کە ئێوارێ سەردانی دادە خاسپەری بکەین. منیش پێشنیارەکەم بەباش زانی، بەڵام پێمگوت:

ـ پێمخۆشە لەوێ باس لە شوکردن و ژنخواستن و ئەو جۆرە بابەتانە نەکەی.

بە داهاتنی بۆلێڵی ئێوارێ، بۆ ماڵی دادە خاسپەری وەڕێ کەوتین. بە گەیشتنمان بەوێ، ئەوان گەلێك کەیف خۆش هاتنە بەرچاو. دایکم و دادەخاسپەری دیسان سەری گلەیی و گازندەی خۆیان دامەزراند. گلەیی لە دەست خودا، ئیمامەکان، بێبەزەیی ڕۆژگار، زۆرداری و ملهوڕی دەسەڵاتداران و...

من و کەژاڵ و کاروانیش کتێب و نووسراوەکانی هەیاسی باوکی‌یانمان لێك دەدا. لە یەکێك لەو نووسراوانەدا کە لە شاری خانەقین نووسیبووی، هەیاس بەجۆرە لە گەردوون و ژیان بە گلەیی بوو:

«کرێکارێکی کۆڵکێشم. بۆ تێرکردنی زگم بیست تۆپ پارچە هەڵدەگرم و بە شەوانە لە بەرزاییەکانی ئاخداخەوە کە زاڵە بە سەر شاری قەسری شیریندا، تێدەپەڕم. ئێمە ناتوانین بە ڕۆژانە ئەم مەودایە ببڕین و ناچارین بە شەوانە ئەم کارە بکەین. لە هەردووك دیوی سنووردا، ژاندارم و شورتە لە بۆسەماندا دانیشتوون. نازانین لە کوێ و کەنگێ وەبەر دەستڕێژی شورتەی عێراقی و ژاندارمەی ئێرانی دەدرێین و دەکوژرێین، یان بریندار دەبین و بەدیل دەگیرێین. تا ئێستا تووشی دەیان ڕووداوی دڵتەزێن هاتووین. هەر دوو شەو لەمەو بەر بوو کە سێ کەس لە کۆڵکێشەکان بە ناوەکانی داود، شاکل و وەیسك کوژران. ئێمە بۆ ئەوەی لە مەرگ ڕزگارمان بێ، کۆڵەکانمان فڕێ دان. من سوورسوور لێم ڕوونە کە لەم ڕێگایەدا تێدا دەچم، بەڵام ئەم کارەش نەکەم بە چی بژیم».

لە کۆتایی نووسراوەکەدا هاتبوو کە «من و هەزارانی دیکەی وەکو منیش، لە دایك بووینمان سەرەتای مەرگێکی پڕ لە مەینەت و پڕوکێنەرە. هەربۆیەشە تاکو لە ژیاندا بم نە ئەو سنوورە دەستکردەم قەبووڵە و نە خۆشم بە هاوولاتی داگیرکەران دەزانم».

ئەو نووسراوەیە کاریگەرییەکی زۆری تێکردم و لە کاتی خوێندنەوەیدا بوغز گەرووی گرتبووم. کاتێك سەرم هەڵبڕیی، دیتم کاروان نووستووە. گوتم:

ـ ئەوە کەنگێ کاتی نووستنە.

کەژاڵ لە وەڵامدا گوتی:

ـ منداڵێك كه به نازی دایك و بابی و ڵێو نه‌بێ، كۆمه‌ڵگا چ چاوه‌ڕوانیه‌كی ده‌بێ لێی هه‌بێ؟!

هه‌ستم كرد كه كه‌ژاڵ وه‌ڵامێكی ده‌روونناسانه‌ی پێدامه‌وه. له لایه‌كه‌وه كه‌یفم پێده‌كرد كه كه‌ژاڵ بیرێكی وا به‌رز و تیژڕوانینێكی وا كۆمه‌ڵناسانه‌ی سه‌باره‌ت به‌و پرسه هه‌بوو. له لایه‌كی دیكه‌وه به داخبووم كه ڕه‌نگه دواڕۆژی كاروانیش هه‌ر وه‌ك هی بابی بێ. ئه‌وجار به ته‌واوی چوومه ناخی نووسراوه‌كه‌وه و بۆم ده‌ركه‌وت كه هه‌یاس له خۆڕا بێسه‌ر و شوێن نه‌كراوه، به‌ڵكو له‌به‌ر دژایه‌تی له‌گه‌ڵ زۆرداریی و سه‌ره‌ڕۆیی‌دا له‌نێویان بردووه. دایكم و داده خاسپه‌ری چووبوونه نێو كاتی جحێڵیی خۆیان و قسه‌یان له به‌روبووم چنینه‌وه‌ی چیاكانی داڵه‌هۆ ده‌كرد: وه‌ك گزگل و مازوو، قه‌سقه‌وه‌ن و به‌ڕووچنینه‌وه، كواری پیرچك و سیره‌ونه، گه‌زۆ و شۆكه دروست كردن‌و... هتد. ئه‌وان به گێڕانه‌وه‌ی بیره‌وه‌ریه‌كانیان دونیایه‌كی ڕازه‌وه‌یان له سروشتی جوان و به‌رهه‌مه‌كانی ئه‌و ناوچانه، وه‌ك تابلۆیه‌كی به‌نرخ ده‌دایه ناساندن. كه‌ژاڵیش وه‌ك من سه‌ره‌ڕای گوێگرتن له‌وان، جاروبار سه‌ری هه‌ڵدێناو چاوێكی ده‌بڕییه نێو چاوانم، به‌ڵام ئه‌وه‌ی هه‌ستی دڵداریی بێ له مندا نه‌ده‌بزوا و خوتوره دایگرتبووم. خه‌م و خه‌فه‌ت و بیركردنه‌وه له هه‌ڵه‌كانی ڕابردووم، تووشی بۆچوونێكی كردبووم كه هه‌ستم به شه‌رمه‌زاریی ده‌كرد، به‌ڵام سه‌ره‌ڕای ئه‌وانه‌ش ده‌هاتمه سه‌ر ئه‌و بڕوایه كه ئێستاش دره‌نگ نه‌بووه.

له كه‌ژاڵم پرسی:

ـ ئه‌م نووسراوه‌یه‌ی باوكتت پێشتر خوێندۆته‌وه؟

ـ بەڵێ، بێجگە لەوەی کە خوێندومەتەوە، کاتێك کە لە ژیاندا بوو چۆنیەتی ژیان و بە سەرهاتی خۆیشی بۆ گێڕاوینەتەوە.

دیسان پرسیم:

ـ هەستت چی بوو سەبارەت بەو بەسەرهاتانە؟

ـ ئەو کات وەك مێرمنداڵێك تەنیا گوێم دەگرت و پێدەکەنیم. پێموابوو کە چیرۆکم بۆ دەگێڕێتەوە، چونکە نەمدەتوانی بیر لەو کارەساتانە بکەمەوە کە ئێستا رێکا و رێك بەر بینگی بە خۆشمان گرتووە. ئێستا بە ئێسك و پێست هەست بە بێمافی، نایەکسانیی و زەبر و زەنگە دەکەم کە ئێمەی لە سەرەتاییترین مافەکانی مرۆڤایەتیی بێبەشکردووە. نامەوێ ژیانێکی وەك ژیانی دایك و بابم هەبێ.

من کە گوێبیستی لێدوانەکانی کەژاڵ بووم، پێموابوو جارێ زوو بوو بچینە نێو بابەتی رامیارییەوە، چونکە پێم وابوو بەمجۆرە دەرەتان لە خۆم بەرتەسك دەکەمەوە.

بۆ خۆم پێویستم بە خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی لەسەر رابردووی کۆمەڵی خۆمان هەبوو. بۆیە پێشنیارم کرد کە با هەرچی زووترە سەردانی مام ناسۆر بکەینەوە و هێندێك کەلوپەل و جل و پێڵاوی بۆ بکڕین.

کەژاڵ گوتی، پێمخۆشە و لە بەیانی زووتر نییە ئەم کارە بکەین، بەڵام دەبێ بەیانی چنار ئاگادار بکەینەوە. ئەو هەستا و لە دوو دەوریدا هەنجیری وشککراوی لەگەڵ گوێز هێنا کە بەدەم قسەکردنەوە دەمانخوارد. ئێمە تا درەنگانێکی شەو دانیشتین و لە کۆتاییدا وامان دانا کە کەژاڵ بەیانی لەسەر کانیی و ئاوی دێ چناریش ئاگادار بکاتەوە.

ئەو شەوە تا بەیانی بیرم لە دەربەدەریی و کوێرەوەرییەکانی ژیانی هەیاس کردەوە. هەڵبەت ئەگەر بکرێ ناوی ژیانی لەسەر دابنێی. بۆ بەیانی چاوەڕوانی وەڵامی کەژاڵ مامەوە. هەتا خۆرئاوا بوو، چ هەواڵێکی لێنەبوو. دایکم بانگی کردم و پێی گوتم:

ـ هێندێك خواردەمەنیمان وەك، نیسك و نۆك، ماش و لەپە، پەتاتە و ئاوتەماتە، قەیسی و خورما، پیواز و ڕۆن تەواو بووە.

- خۆ ئێمە لەو خواردەمەنیانە نەبێ شتی دیکە ناخۆین، پێم ناڵێی چمان هەیە؟

بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وڵام بم، گورج بەرەو دوکان وەڕێ کەوتم. لەبەر ئەوە پارەمان کەم بوو، هێندێك لەو شتومەکانەم بە قەرز لای خاڵە لەتیفی دوکاندار هەڵگرتن. هێشتا لە دوکانەکە وەدەر نەکەوتبووم، سەیران کە دەستی شاهۆی بە دەستەوە بوو هاتنە ژووری دوکانەوە. پاش چاك و چۆنی لەگەڵ من، هەواڵپرسی لە خاڵە لەتیف کرد و پێی گوت:

ـ هاتووم بۆ کڕینی هێندێك شتومەکی خواردەمەنی، وەك شەکر و پەتاتە و نیسك و نۆك.

خاڵە لەتیف دەفتەرەکەی هێنا پێش و پاش ئەوەی چاوێکی پێدا خشاند. پێی گوت:

ـ ئەوە شەش مانگە کەلوپەلت بە قەرز بردووە و تا ئێستاش قەرزەکانت نەداوەتەوە. دەبێ بڵێم بە داخەوە تاکو ئەو قەرزانە نەدەیەوە، ناتوانم شتی دیکەت بە قەرز پێبدەم، چونکە منیش کاسبی دەکەم و

ئەگەر بڕیار وابێ کەلوپەلەکان بدەمە قەرز و هیچ دراوێکیشم نەدرێتێ، ئەوکات دەبێ دەرگای دوکانەکە داخەم و بڕۆمە سوالکردن.

لەو کاتەشدا شاهۆ هەردووك پێی کردبووە لنگە کەوشێکەوە و نوقڵ و کولیچەی دەویست. منیش لە مام لەتیفی دوکاندارم پرسی:

- دەکرێ لەسەر حیسابی من ئەمجارەیان کەلوپەل و خواردەمەنیت لێوەرگرن؟

- بەسەرچاو، بەڵام منیش دەبێ پارەم هەبێ تاکو بتوانم کەلوپەل و خواردەمەنی بۆ نێو دوکانەکە بکڕم.

سوپاسی مام لەتیفم کرد و بە سەیرانم گوت:

- بزانە چیتان پێویستە بۆ خۆتان هەڵگرن. ئەو سوپاسی من و دوکانداری کرد و خەریك بوو بە وەرگرتنی شتومەکەکانەوە و منیش گەڕامەوە بەرەو ماڵ.

کاتێك هاتمەوە ماڵ، چۆنییەتی گرفتی سەیرانم بۆ دایکم گێڕاوە.

- بە واز گفت نەبێ رۆڵە ئەم هێشتووە لەو چەند رۆژەدا کە شاهۆمان بردە دوکتۆر، تەنیا قەرانێکیش خەرج بکا. ئێستاش ئەوەی هەمبێ دوو خڕخاڵ و ملوانکێکە کە کاتی خۆی برا خێر لەخۆ نەدیوەکانم بۆیان کڕیوم و تا ئێستاش ئەوانەم وەك یادگار هەڵگرتوون. ئەوەتان، بەیانی بیانبە بیانفرۆشە و هەم قەرزەکانی خۆمان و هەم هی سەیرانی لێبدەوە. هەرچەندیشی دەمێنێتەوە با بمێنێتەوە بۆ داهاتوو. هەرکاتێکیش بەروبومی بەهار و هاوین و باخ و بێسان پێبگا، ئەوەدەم گوزەرانمان بڕێك چاکتر دەبێتەوە.

ـ پێشنیارێکی باشە، بەڵام ئێستا تەنیا خڕخاڵێکیان دەفرۆشین و قەرزەکانی پێدەدەینەوە.

لە چاوەڕوانی هەواڵی کەژاڵ و چناردا مابووم، بەڵام شەو داهات و هیچ هەواڵێکیان نەبوو. بۆ بەیانی چوومە دەرکی ماڵی دادە خاسپەری و هەواڵی کەژاڵم پرسی. ئەو بە جۆرێك لە ناهومێدی کە بە نێوچاوانیەوە دیار بوو گوتی:

ـ کەژاڵ لە دوێنێ پاش نیوەڕۆوە نووستووە و نایەوێ لەگەڵ کەس بدوێ.

ـ هۆکارەکانی چین؟

ـ بە تەواوی نازانم، تەنیا ئەوە نەبێ کە دوێنێ کاکم لێرە بوو و کەژاڵی کێشایە لێ و بە سرتە چەند شتێکی پێگوت.

دەستبەجێ وەبیری ئەوە کەوتم کە ڕەنگە ئەو هاتوچۆیەی ئێمەیان پێ نالەبار بێ، یان دەنگۆی پێوەندیی نێوان ئەمن و کەژاڵی بیستبێ و لێیان بە گران هاتبێ.

ـ دەتوانم بیبینم؟

ـ ڕۆڵە! کەژاڵ بۆ خۆی گەورەیە و هەر بۆ خۆشی خاوەن بڕیارە. بڕۆ بزانە کاکم چی پێگوتووە و دڵی بدەوە. ڕاستە کاکم برای گەورەمە، بەڵام من نامەوێ ئەو چارەنووسی کەژاڵ دیاری بکا.

بە بیستنی ئەو قسانەی دادە خاسپەری، چوومە ژوور بۆ لای کەژاڵ و گۆشەی لێفەکەم لەسەر دەموچاوی هەڵدایەوە. پاش ڕۆژباش، پرسیم:

ـ کوێت دێشێ؟

لەنێو جێگاکە ڕاست بووەوە و گوتی:

ـ نەخۆش نیم و هیچ کوێم نایەشێ.

داوای لێبووردنی کرد کە ئاگاداری نەکردۆمەتەوە سەبارەت بە سەردانمان بۆ لای مام نەسۆر.

بێ ئەوەی پرسیاری دیکەی ئاڕاستە بکەم، گوتی:

ـ نامەوێ بژیم و لە ژیان لەنێو ئەم کۆمەڵگایەدا بێزارم.

کەژاڵ هێندە تووڕە بوو کە نەیدەزانی چۆن ڕقی خۆی دەربڕێ. منیش هێندێك دەستم بە سەر شان و ملیدا هێنا و پرچەکانیم لەسەر ڕوومەتی لێ دان. ئەو جار پێمگوت:

ـ هەر چەند هێشتا نازانم هۆی نیگەرانی و بێزاریەکەت چییە، بەڵام دڵنیات دەکەم کە هەر چی لە دەستم بێ، دریغی ناکەم لە بۆ یارمەتی پێکردنت.

ئەو هەستا و دەست و ڕووی شوشتن، پاشان پێی گوتم:

ـ لەو بڕوایەدا نیم کە گرفتەکە هەروا بە سووك و ئاسان کۆتایی پێ بێ. کۆمەڵگای ئێمە تووشی نەخۆشییەکی کوشندەیە، کە شێرپەنجە بەڵایەوە وەك هەوا و پەتایە.

ـ ئەم گرفتەی کە هاتۆتە پێش و بەرۆکی گرتووی، هیچ پێوەندییەکی بە هاتووچووی من بۆ ماڵی ئێوە هەیە؟

ـ نە هیچ جۆرە پێوەندیی بە ئێوەوە هەیە و نە بە کەسێکی دیکەشەوە. پاش نیوەڕۆی دوێنێ، خاڵم هات بۆ ئێرە. ئەو بەبێ یەك و دوو پێی گوتم: کە دەبێ مێرد بکەم بە کوڕەکەی خۆی، واتە کوڕی خاڵم. لە کۆتاییدا بە

هەڕەشەوە پێی گوتم: هەرچیت لە مێشکدایە لە ئێستاوە فڕێی دە دەرەوە. بمری هی خاکی و بشمێنی هی شێرکۆی.

ـ هەڵوێستی دایکت چۆن بوو؟

ـ دایکم بۆ خۆی قوربانیی ئەمجۆرە داب و نەریتە کۆنەیە و لەو بڕوایەدا نیم کە ڕازیی بێ.

ـ ئەی چار چییە؟

ئەو هێندێك ماتبوو و گوتی:

ـ خۆ کوشتنم لێ گەلێك نەنگە و نامەوێ بیر لەو کارە بکەمەوە. ڕاستت دەوێ، من پێویستیم بە یارمەتی هەیە و دەرفەتەکانیش گەلێك بەرتەسکن" بۆ ئەوەی لەسەر دواڕۆژی خۆم بڕیار بدەم. بۆ خۆت چاك دەزانی کە ئێمە لە تەنیا جارێك زیاتر ناژین و منیش نامەوێ ئەو جارەش کە هەیە کەسانی دیکە بڕیاری ژیانم بۆ بدەن.

من پشتگریم لە بۆچوونەکانی کەژاڵ کرد و گوتم:

ـ ئەوە ڕاستە و ئێمە دەبێ ئاڵوگۆڕ لەم کۆمەڵەدا پێك بێنین، ئەگینا بۆخۆشمان دەبینە قوربانی داب و نەریتە دواکەوتووەکانی ئەم کۆمەڵگایە، کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی و زەبروزەنگی ملهوڕان.

من سەرەڕای ئەوەی کە دڵدانەوەی کەژاڵم دەکرد، بۆخۆشم قەڵای دڵم گیرابوو. نەك لەبەر ئەوەی بترسم کە بە گژی دواکەوتوویی و کۆنەپەرستیدا بچمەوە، بەڵکو لەبەر ئەوە کە دەمزانیی ئەگەر کچێك بە پێچەوانەی خواستی مام و خاڵ و برا و باب و بگرە تایەفە و عەشیرەتیش بجووڵێتەوە،

بە نرخێکی گران بۆی تەواو دەبێت. بە دەیان جار بیستبووم کە کچ ناموس و شەرەفی بنەماڵە و کەسوکاریەتی. هەر ئەوە بۆ خۆی بەس بوو کە دەستی پیاو ئاواڵە بێ بۆ توندوتیژی و لەنێوبردنی فیزیکی ئافرەت، پاشان پرسیم:

- هەڵوێستی کوڕە خاڵت لەم پێوەندیەدا چییە؟

کەژاڵ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- ئێمە وەك برا و خوشکین پێکەوە. ئەو خوێندەوارە و لەوە ناچێ خاڵم ئەویشی ئاگادار کردبێتەوە.

- کەوابێ بۆ خۆت لەگەڵ کوڕی خاڵت گرفتەکە بێنە گۆڕێ. بەمجۆرە دەکرێ ئەو ببێتە بەشێك لە لایەنی کێشەکە و بۆ خۆی بەرهەڵستی خاڵت ببێتەوە.

کەژاڵ ئەو پێشنیارەی منی لێ گەلێك پەسەند بوو. وام هەست پێدەکرد کە بەو پێشنیارە هیوایەکی زیاترم بە کەژاڵ بەخشیبێ. لە درێژە دا پێمگوت:

- ئەگەر لەسەر بەڵێنی خۆت ماوی، چنار ئاگادار بکەوە تاکو سەردانی مام نەسۆر بکەین.

- لەسەر هەڵوێستی خۆم سوورم و هەر بەیانی چنار دەبینم.

- سوپاس شوان، پێمخۆشە لەمەولا زیاتر پێکەوە دانیشین و ئاڵوگۆڕی بیرورِا بکەین.

منیش سوپاسم کرد و بەڵێنیم پێدا کە بێدڵی نەکەم. کاتێك ویستم بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە، دادە خاسپەری هاتە پێشم و گەلێك خۆشحاڵیی دەربڕی کە دڵدانەوەی کەژاڵم کردبوو.

ـ شایانی نییە و من بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم بە پێی توانا یارمەتی ئەو کەسانە بدەم کە پێویستیان بە یارمەتی هەبێ.

کە هاتمەوە ماڵ، دایکم یەك دانە لە خڕخاڵەکانی خۆی کە لە پرێسکەیەکەوە پێچابۆوە، پێی دام و گوتی:

ـ ئەم خڕخاڵە خۆی لە چوار مسقاڵ دەدا، بەڵام نازانم چەندی دەکا. بیبە پرسیاری نرخی بکە، بیفرۆشە و قەرزەکانی لێبدەوە.

خڕخاڵم لێوەرگرت و بەرەو لای مام لەتیفی دوکاندار وەڕێ کەوتم. بە گەیشتنم بەوێ و پاش هێندێك ڕاوەستان، خڕخاڵەکەم دەرهێنا و گوتم:

ـ کاکی خۆم ئەتۆ هاتوچۆی شار دەکەی، دەتوانی ئەم خڕخاڵە بفرۆشی و قەرزەکەی خۆتی لێهەڵگری و ماباقیشی پێم بدەیتەوە؟ چاوێکی لێکرد و گوتی:

ـ بە چەند دەیفرۆشی؟

ـ پازدەهەزار تمەن.

ـ چەند مسقاڵە؟

ـ نەم کێشاوە، بەڵام دایکم دەڵێ چوار مسقاڵە.

ـ من دەیبەمە شار و لای زێڕفرۆش نرخی دەردێنم. هەرچەندە نرخیان لەسەر دانا، بۆ خۆم پارەی دەدەم.

منیش ڕەزامەندیم نیشاندا و بەرەو ماڵ گەڕامەوە. لە ڕێگادا تووشی خاڵە شامار هاتم. ئەو کۆڵێك گلەیی لێکردم و گوتی:

ـ چەند ڕۆژە نەخۆشم و لێتان نەپرسیومەتەوە.

ـ گلەییەکانت بەسەرچاوم، بەڵام بەڕاستی ئاگادار نەبووم و بێجگە لەوەش دەرفەتم بۆ نەڕەخساوە.

ئەو گورج لێمهاتە جواب و گوتی:

ـ نە برام! وانییە. ئێمەگەر هەرکات خەڵك پێویستیان پێمان بێ، ئەوکات لێمان دەپرسنەوە.

ـ ئێستا خۆ شوکور باشتری و ئەم ئێوارەیە میوانی خۆمان بە.

سوپاسی کردم و گوتی:

ـ با وا بێ.

هاتمەوە ماڵ و دایکم ئاگادار کردەوە. ئەو شێوی حەلیمی بۆ ئێوارێ لێنابوو، بێجگە لەوەش خورما و کونجی و گوێزی پێکەوە لە هەوەنگدا کوتابوو.

بۆ ئێوارێ خاڵە شامار هات بۆ ماڵمان. ئەو لە پشتەوەی کوورەی ئاگرەکە دانیشت و گوتی:

ـ چەند ڕۆژێکە ناسازم و تەنیا ساردم بووە، بەڵام چەند خولەکێك پێش ئێستا لەرزیش دایگرتووم.

ئەو دوو چاکەت و کۆتێك و پاڵتۆیەکیشی لە بەرکردبوو، بەو حاڵەش لەرز دایگرتبوو. دایکم پێیگوت:

ـ هەندێك لەو جلانەی بەرت دەرهێنە تاکو لەشت ئاسودەتربێ!.

ـ وەنەوش! خێرت دەگاتێ ئەگەر مەوجێکی کوردیم بە کۆڵدا دەی، چونکە سەرما خەریکە بڕستم لێدەبڕێ.

ـ لەوانەیە تات هەبێ، واتە پلەی گەرمای لەشەت لە سەرەوە بێ و ناکرێ لەوە زیاتر خۆت گەرم ڕاگری، چونکە ڕەنگە تووشی کارەساتی چاوەڕواننەکراو بیتەوە.

ئەو ئامادە نەبوو ئەوە قبووڵ بکا و گوتی:

ـ مەوجێکم پێدادەن.

من نەمهێشت. ئەو هێندێك لە سەختی و کڕێوەی ئەو زستانە دوا و گوتی:

ـ ساڵێکی پڕ بەفر و بارانمان هەبووە و بێشك ئاوی ڕووبارەکان باشتر لە ساڵی ڕابردوو دەبێ.

هەرچی دەهات لەرزی خاڵە شامار ڕووی لە زیادبوون دەکرد. ئەوجار گوتی:

ـ لێفەیەکم پێدادەن.

من بە قسەم نەکرد و پێمگوت:

ـ جارێ پەلە مەکە.

هەستام تەشتێکم هێنا و پڕم کرد لە ئاوی سارد. ئەوجار دوو گۆمەڵ خوێم تێکرد و بەباشی خوێیەکەم لە ئاوەکەدا تواندەوە. ئینجا بەشێك لە جلوبەرگەکانی بەریم دەرهێنا و هەردووك قاچ و دەستیم نایە ئاوەکەوە. زیاتر لە چارەکێك نەمهێشت دەست و قاچی لەناو ئاو و خوێیەکە دەر بێنێ. سەرەڕای ئەوەش پەیتا پەیتا بە پارچەیەکی تەڕ دەموچاویم فێنك

دەکردوە. بە دوای ئەوەدا بەرە بەرە لەرزی خاڵە شامار ڕووی لە کەم بوون دەکرد. هەتاکو وای لێهات بۆ خۆی ڕایگەیاند کە ئیتر سەرمای نییە و ئیشتیای لە خواردنە. خاولییەکم هێنا و دەست و پێیم وشك کردنەوە و یارمەتیم کرد تا لەسەر جێگاکە پاڵی داوە بە پشتییەکەوە.

سفرەمان ڕاخست و بۆنی خۆشی هەلیماو نێو ماڵەکەی داگرتبوو. خاڵۆ شامار بە جارێك گرەی لێکەوت کە وا هەست دەکرا کە قەت نەخۆش نەبووە. تا درەنگانێك دانیشتین و گەپمان دەدا. بە دوای ئەوەدا دایکم خورما و کونجیەکەی هێنا و ئەویشمان کردە شەوچەرە، پاشان ئەو کەوتە جووڵەجووڵ بۆ چوونەوە و بە دایکمی گوت:

ـ ئەمساڵ بۆ خۆی یارمەتی دەدا و کێڵگەکەی بۆ دەکاتە بێستانێکی باش کە پڕ بێ لە هەموو چەشنە سەوزەیەك.

دایکیشم هیوای دەربڕی کە لەشیساغ بێ. لە هەمانکاتیشدا من گەلێك خۆش کەیف بووم لەوە کە ڕەنگە ئەو یارمەتییەی خاڵە شامار ببێتە هۆی ئەوەی دایکم جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ دامەزرێنێ، کە بەڵکو لەو تەنیایە بێنەدەر.

ئەو چۆوە و ئێمەش هێندێك لەسەر نەهامەتی و چارەڕەشی خاڵە شامار دواین. بۆ بەیانی کە هەستاین، هەتاوێکی گەرم و خۆش بوو. سەهۆڵی سەر پاسار و بانەکان تواوبوونەوە و ناخەواکان کەوتبوونە خۆڕە. بۆ ئەوەی ماڵەکان دلۆپە نەکەن، بڕێکی باش بانگلانی سەر ماڵ و دیوار و پاسارەکانم دان. زۆری پێنەچوو کە لە پڕ دایکم بانگی کردم و گوتی:

ـ شوانە! کەژاڵ کاری پێتە.

دەستبەجێ چوومە خوار و خولقم کرد کە بێتەماڵەوە، بەڵام ئەو گوتی:

- ئێستا کاتی ئەوە نییە و دایدەنێین بۆ کاتێکی دیکە. ئەم بەیانییە چنارم بینی. چنار پێشنیاری کرد کە هەرکات ئێمە ئامادە بین ئەو هیچ نکۆڵییەکی نییە بۆ سەردانی مام نەسۆر.

پاشان پێی گوتم:

- ئەمڕۆ لەگەڵ دایکم دەچین بۆ ماڵی شاسواری خاڵم و بڕیارم داوە لەگەڵ شێرکۆی خاڵۆزام، بابەتەکە بێنمە گۆڕێ، بەڵام نازانم چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەم؟

بە هەندێك بیرکردنەوە گوتم:

- باشتر وایە بۆ خۆت لەپێشدا هەلاجی و تاوتۆی قسەکانت بکەی. دوای ئەوەش من پێم باشە بەر لە هەموو شتێك پرسیاری ئەوەی لێبکەی کە ئایا بۆ خۆی ئاگادارە کە بابی دەیەوێ ژنی بۆ بخوازێ. ئەوجار لەوانەیە لە وەڵامدانەوەی شێرکۆدا بەشێك لە چۆنیەتی گرفتەکەت بۆ دەرکەوێ، بێجگە لەوەش بەو وەسفەی کە ئەتۆ لە شێرکۆی دەکەی، لەو بڕوایەدام کە رەنگە شێرکۆ ئاگاداری ئەم داواکارییەی خاڵت نەبێ، چونکە ئەگەر هاتباو شێرکۆ ئاگاداری ئەم داواکاریەی خاڵت بووایە، دەبا خۆی بە خاوەنی تۆ زانیبا و تائێستا نیشانی دابا کە خۆشی دەوێی. سەرەڕای ئەوانەش ئەگەر خۆی بە خاوەنی تۆ زانیبا، دەبا هەڵوێستێکی سەبارەت بەو دەنگۆیانەی کە لێرە لەسەر ئێمە لە ئارادایە، دەربڕیبا.

کەژاڵ گەلێك کەیفی پێهات و سوپاسی کردم بۆ ئەو ڕێنوێنیانە. ئەو گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و منیش درێژەم دا بەبانگلانی بانەکان.

کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ بوو کە ماشێنی دێ لە شار گەڕایەوە.

هەستام دە پازدە دانە پەتاتەم کردە ژێر ژیلەمۆی نێو کوورەکە. پاش چەند خولەك دەرم هێنان کە جوان برژابوون.

دایکم خەریکی نانکردن بوو. بانگم کرد:

ـ دایکە گیان پەتاتەم برژاندووە و لەگەڵ نانی گەرم بەچێژە.

نانێکم هەڵگرت و بەشێك لە پەتاتە برژیوەکانم خستە دەفرێکەوە و خەریك بووم بە توێکوڵ گرتنەوەیانەوە، کە لە پڕ دایکم گوتی:

ـ شوانە، بەیانی زوو کەژاڵ جامێك پڕ لە کەرەی تازەی بۆ هێناوین. وابزانم مەشکەیان ژەندبوو، چونکە کەرەی تازە لە مەشکە داکرابوو.

لە دڵی خۆمەوە گوتم «نانی نیوەڕۆمان شاهانەیە. نانی گەرم و کەرەی تازە لەگەڵ پەتاتەی برژاو. تەنیا جامێك دۆی مەشکەی دۆکەڵینی کەمە».

پاش نانی نیوەڕۆ، بەرەو لای مام لەتیفی دوکاندار وەڕێ کەوتم. ئەو بارەکانی لە ماشێن داگرتبوو و لە دوکانێی دامەزراندبوون و لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و چای دەخواردەوە. ڕۆژباشم لێکرد و ئەویش خوڵقی چا خواردنەوەی کردم. پیاڵەیەك چاییم لێوەرگرت و خواردمەوە، پاشان خڕخاڵەکەی بەو جۆرە کە لە پرێسکەکەدا بوو وێدامەوە و گوتی:

ـ کاکە شوان! بە داخەوە خڕخاڵەکە تەنیا ڕوویەکی تەسکی زێڕە و نەوەد و پێنج لەسەدی مسە، بێجگە لەوەش بردوومەتە لای چەندین

زێڕینگەر و هەرهەموویان وایان پێگوتووم کە لە پێنجسەد تمەن زیاتر ناهێنێ. ئەگەر بەو نرخەی دەفرۆشی، ئەوە دەتدەمێ، ئەگینا دەتوانی بیبەیتەوە.

منیش سوپاسم کرد و گوتم:

ـ دەبێ لە دایکم بپرسم.

خرخاڵم وەرگرت و بەرەو ماڵ هاتمەوە. دایکم دەستی لە نانکردن خاڵی ببوو. چۆنیەتی خرخاڵەکەم بۆ گێڕاوە. ئەو گوتی:

ـ بڕوام نییە کە ئەو خرخاڵە بەدەڵ بێ، چونکە بەلانی کەم هی سی ساڵ لەمەو بەرە و ئەوکاتە زێڕینگەرەکان فرت و فێڵی کەمتریان دەزانی، بەڵام زێڕینگەری ئەم سەردەمەی ئێستا فرت و فێڵیان زۆرە و کڵاو لەسەر خەڵك دادەنێن. جارێ لێیگەڕێ با بۆخۆم بچمە شار دەیفرۆشم.

بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە شێرزاد و بێگەرد میوانمان بوون. ئێمە باسی زۆر شتمان کرد، لە کۆبوونەوەکانمان، لە گەورماڵێن، لە ئاگرتێبەردانی پاڵتۆی ئەمریکی کابرای کرێکار لە سەرپێڵی زەهاو، لە دووپشك پێوەدانی من و گەلێك باسی دیکە. لەسەریەك شەوێکی خۆشمان بردەسەر. بێگەرد ڕووی بە مندا هەڵنەدەهات و زیاتر پێدەکەنی و قسەی نەدەکرد. هەڵبەت من دەمزانی کە پێکەنینەکانی پێوەندیان بە دووگیانبوونەکەی شێرزاد و تاقیکارییەکەی خۆی و شێرزادەوە هەبوو. ئێمە تا درەنگانێکی شەو لە هەر گێڕێك چەپکێکمان دەبڕی. درەنگانێکی شەو ئەوان چوونەوە و ئێمەش نووستین.

بۆ بەیانی دایکم خۆی ساز کرد بۆ چوونە شار و خڕخاڵەکەی لەگەڵ خۆی برد. منیش خەریکی ئاڵوگۆڕ لە خۆمدا بووم و ڕاهێنانی خۆم بۆ خوێندن و نووسین بە کوردی.

خۆر لە زەردەی ئێوارەدا بوو، کە لە پڕ درا لە دەرگای ماڵمان. کاروان کوڕی دادە خاسپەری بوو. بە هەناسە بڕکە گوتی:

- دایکم ناردوومی بە دواتا، تاکو بێی بۆ ماڵی ئێمە.

منیش پشت و پەلم توند کردەوە و چووم بۆ ماڵیان. پاش بە خێرهاتن کران، دەستمان کرد بە قسەکردن لەسەر سەردانەکەیان بۆ ماڵی شاسواری برا گەورەی. کەژاڵ پێی گوتم:

- لەسەر بابەتی پێوەندیدار بە خۆمەوە، پێمخۆشە دوو بە دوو قسە بکەین.

دادە خاسپەری گوتی:

- شوانە! پاوانخوازیی کاکم ئێمەی گیرۆدە کردووە. ئەو نەك هەر کچەکان بگرە کوڕەکانیش ناچار دەکا بە سازی ئەو سەما بکەن.

کەژاڵ لێدوانەکەی لە دادەخاسپەری بڕی و گوتی:

- دایکە من بۆ خۆم ئەو بابەتە لەگەڵ شوان باس دەکەم و دڵنیاشت دەکەم ئەگەر ببمە لۆمەی وڵات، ناچمە ژێر باری داوا زۆرەملییەکانی خالم.

من لای خۆم بیرم لەوە دەکردەوە کە لە کاتی سەردانی دادە خاسپەری و کەژاڵ دا بۆ ماڵی شاسوار، کەژاڵ نەیتوانیوە لەسەر خۆی و گرفتێك کە

بۆی هاتبووە پێش، پرسیار لە شێرکۆ بکا. لەو باسانەدا بووین کە کاروان بانگی کردم و گوتی:

- دادە وەنەوش لە شارهاتەوە.

من هەستام کە بچمە دەمیەوە، بەڵام دادە خاسپەری نەیهێشت و گوتی:

- وەنەوش لە ڕێگاوە هاتووە و ئێستا ماندووە. ئێوە دانیشن و من بۆ خۆم دەچم و دەیهێنمەوە بۆ ئێرە.

دەست خۆشیم لە کەژاڵ کرد لە بۆ جامە کەرەکەی دوێنێ کە وەك کاسەهاوسێ بۆی هێنابووین و ئەوەشم پێگوت کە حەزم لە دۆی تازە و دۆکەڵێن کردووە.

ئەو دەستبەجێ چوو جامێك دۆی لە مەشکە داکرد و بۆی هاوردم. بەدەم دۆ خواردنەوە، چاوێکم بڕیە ڕوومەتی کەژاڵ کە گەلێك کز و پەرۆش هاتە بەرچاوم. دۆیەکەم خواردەوە و پێم گوت:

- حەز دەکەم لە سەرەخۆ بی و هەڵوێستت سەبارەت بە خاڵت هەڵوێستی کچێکی تێگەیشتوو و خوێندەوار بێ، چونکە ئەوە تەنیا خاڵت نییە ئەو دەسەڵاتەی هەیە و دەیەوێ بە زەبر و زەنگ ویستەکانی خۆی بەسەر تۆدا بسەپێنێ. ئەو داب و نەریتە کۆن و دواکەوتووانەی کۆمەڵایەتی کە بە میرات وەبەرمان براون و دەرەتانیان لە ئافرەتان وگەنجان لەم کۆمەڵگایە دا بڕیوە، دەبێ سەرچاوەکی وشك بکرێ!

زۆری پێنەچوو کە دایکم لەگەڵ دادە خاسپەری هاتنە ژوورەوە. ئەو دانیشت و دەستبەجێ پارچەیەکی هەڵپێچراوی دا بە دەستی منەوە و گوتی:

ـ ئەمگوت! دەبینی، چۆن فێڵبازی و کلاو لەسەر نانی خەڵك بۆتە پیشەی ڕۆژانەی بەشێکی زۆر لە مرۆڤەکان؟ ئەوەتا ئەمڕۆ سەردانی چوار دووکانی زێڕ فرۆشیم کردووە کە هەرکامەیان نرخێکیان لە سەرخڕخاڵەکە دادەنا. تاکو ئاخرەکەی فرۆشتم بە بیست و یەك هەزار تمەن. ئەو لەشینەکەی کردەوە و دوو پاکەت کولیچە برنجی و هێندێك خواردەمەنی دیکەی تێدا بوو، دەریهێنان.

کەژاڵ کەشەفێکی هێنا و دایکم لە هەرکامەیان هێندێکی تێکرد. بە دەم کولیچە و شیرینی خواردنەوە باسی ئەوەی دەکرد کە هاڕە و بۆڕەی بڵندگۆی مزگەوت کەڕی کردووە. ئەو گوتی:

– هەرکەسە و بۆ خۆی پوفی پێدا دەکا و کەس لە کەس تێناگا و ڕکەبەرییەکی سەیر و سەمەرە لەنێوان مزگەوتی شیعەکان و سوننەکان دا بەردەوامە. من بە دەرفەتم زانی قەرزی کاکی دوکاندار بدەمەوە. لە هەمانکاتدا وەبیری کەژاڵم هێنایەوە کە سەردانی مام نەسۆرمان لەبیر نەچێ. ئەوانم بەجێ هێشت و بەرەو لای کاکی دوکاندار وەڕێ کەوتم. لەوێ قەرزەکانی خۆمان و سەیرانم داوە و بەرەو ماڵ گەڕامەوە. بێتاقەت بووم و نەمدەزانی چیبکەم. لە کورتە بیرکردنەوەیەکدا وەبیرم هاتەوە کە سەیران لە ڕادە بەدەر دەستکورتە و مادام هێندێك پارەمان بەدەستەوەیە با سەردانێکی بکەم. لەم پێوەندیەدا نەمدەویست کەسێکی دیکە پێمبزانێ.

هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لەوانە بوو لیتکە و پیتکەی دیکەشیان بۆ دروست کردبام.

تاریك کە داهات بەرەو لای ماڵیان وەڕێ کەوتم بە گەیشتنم بەوێ لە دەرکی ماڵیانم دا. سەیران دەرگای لێکردمەوە و بەرلەوەی هەواڵپرسی بکا، گوتی:

ـ خێر و بێرتان پێدا بباریّ، ئێوە نەبووایان دەبا ئەوە چەند ڕۆژە سەری بیّ شاممان نابایەوە و قاچی شاهۆش چاك بۆتەوە و هەڵبەز و دابەزەکانی جارانی بۆ گەڕاوەتەوە.

ئەوجار داوای لێبووردنی کرد و گوتی:

ـ لەبەر کڕ و کپی و تەنیایی هەر ئێواریّ دەنوین و شەو و ڕۆژمان هەروەك یەکە.

ئەو بەبێ ڕاوەستان گلەیی و گازندەکانی دەست پێکرد و گوتی:

ـ کاکە شوان! بەو گۆڕەی ناوخاسی بابتی تێدایە، هەموو کاتەکان لای من هەروەك شەوە. پێمخۆشە هەر شەو بێت و ڕۆژ بە چاو نەبینم. ئێستاش نامەویّ خەم و کەسەری خۆم بەسەر کەسدا هەڵڕێژم. لام وایە ئەوە بەخت و چارەی ڕەشی خۆمە کە لە ڕۆژی ئەوەڵێ وا نووسراوە.

من کە باوەڕم بە چارەنووس نەبوو و لەو جۆرە بیرکردنەوانەش گەلێك بێزار بووم، بەگشتی نەمدەویست گوێم لەو ئاخافتنانە بێ کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی بێدەسەڵاتی و باوەڕ بەخۆنەبوونن. پێمگوت:

ـ نە چارەنووسی تۆ و نە هی هیچ کەسی دیکەیش نە نووسراو و نە لەپێش دا دیاریکراوە. دەبێ بڕوات بە خۆت هەبێ و نافرەت بوونت نابێ ببێتە هۆی ئەوە کە دەست لە هەموو ژیان بشۆی.

گەلێك دڵدانەوەی سەیرانم کرد و هانمدا، کە بەڵکو ژیانێکی نوێ دەست پێبکا، بەڵام ئەو دەیگوت هەیهات، چ خێرێکم لەوەی ڕابردوو دیوە، تا لە داهاتوودا ببینم.

ڕاستی ئەوە بوو کە من نەمدەتوانی ئەو بارە قورسەی سەرشانی سەیران کەم بکەمەوە. ئەوەی لەو کاتەدا پێم دەکرا ئەوە بوو کە لە پارەی خڕخاڵەکە هێندێکی بۆ بە جێ بێڵم. هەزار تمەنم پێدا و گوتم:

ـ هەموو ئەو قەرزانەی مام لەتیفی دوکاندار کە لات بوون دراونەتەوە و پێویست ناکا پەرۆشیان بی.

پاشانماڵئاواییم لێکردن و گەڕامەوە بەرەو ماڵ. بە گەیشتنەوەم بە ماڵ، چوومە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. خۆم دڵم بە حاڵی خۆم دەسووتا و دەمگوت: ئەی دڵەی خافڵ! ئێستا دەزانم کە لەم کۆمەڵگەیەی ئێمەدا زۆر کەس بە پیری لەدایك دەبن. ئەوە ئێستایە کە لە دەردی مام نەسۆر و ملیونەها مام نەسۆری بە جوانەمەرگی لە دایك بوو تێدەگەم، بەڵام لە هەمانکاتدا ورەم بە خۆ دەبەخشی و دەمگوت: تەواوی ژیان خەباتە، خەبات لەگەڵ نەداریی و هەژاریی بۆ ژیانێکی باشتر، لەگەڵ داب و نەریتە کۆنەکان، لەگەڵ چەوسێنەران و داگیرکاری، لەگەڵ سەرما و گەرما، لەگەڵ بێبەزیی بوونی دونیای پڕلە تەنگ وچەڵەمەی ئەم سەردەمەو... هتد.

لەو بیرکردەوانەدا بووم کە دایکم لە ماڵی دادە خاسپەری گەڕایەوە. ئەو هەر بە دانیشتنی دامیە بەر گازندە و پرسی:

ـ ئەوە چیت بە سەر هات؟ ئێمە هەتا ئێستاش چاوەڕێی گەڕانەوەت بووین. ئەوە کەی خوو و خدەی مرۆڤێکە کە خۆی بە تێگەیشتوو بزانێ و دۆستانی خۆی لە چاوەڕوانیدا بێڵێتەوە. نازانی کەژاڵ چەندەی دەشت وماڵی کردووە بە دواتا؟.

من کە زانیم کارێکی باشم نەکردووە، داوای لێبوردنم کرد و گوتم:

ـ سەردانی سەیرانم کرد و لە داخی نەهامەتی ئەودا هەموو شتێکم لە بیر چووبوو.

دیسان داوام لێکرد، کە بەڵکو بتوانێ لە داهاتوودا زیاتر سەردانی سەیران بکا.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی دادە خاسپەری قابلەمەیەك پڕ لە کەرە و دۆی بۆهێناین. منیش داوای لێبوردنم لێ کرد سەبارەت بە شەوی ڕابردوو. ئەویش پێی گوتم:

- کەژاڵ دەیەوێ بەر لە نیوەڕۆ چاوی پێت بکەوێ. درەنگیم نەکرد و بە بیستنی قسەکانی دادە خاسپەری، یەکڕاست چووم بۆ لای. ئەویش بەش بە حاڵی خۆی گلەیی شەوی ڕابردووی لێکردم و پرسی:

ـ بۆ پشتگوێت خستووم، لە حاڵێکدا ئێستا لە هەمووکاتێك پێویستی زیاترم بە یارمەتیت هەیە.

وڵامێکی گونجاوم بۆ پرسیار و گلەییەکی پێنەبوو و بێدەنگەم کرد.

ئەو درێژەی داو گوتی:

ـ ئەم بەيانييە باسی سەردانی مام نەسۆرم لەگەڵ چنار کردووە و ئەو ئامادەیە کە بۆ سبەینێ سەردانی بکەین.

ئەو ڕۆژەمان تێپەڕ کرد و شەویشم بە چاوەڕوانی بەیانییەوە ڕۆژ کردەوە. بۆ بەیانی چوومە لای مام لەتیف، دوو کیلو گۆشت، سێ کیلۆ برینج، چارەکێك قەیسی، قوتوویەك ڕۆن، پاڵتۆیەکی کۆن، کراسێك، جووتێك پێڵاوم، دووجووت گۆرەویم کڕین و هاتمەوە بۆ ماڵ.

بە هاتنی چنار و کەژاڵ، سێ بە سێ کەلوپەلەکانمان هەڵگرت و لێفەیەك و نەوگێکیشمان لە ماڵی خۆمان هەڵگرت و بەرەو لای مام نەسۆر داجمیاین.

کاتێك گەیشتینە وێ، پێمانگوت:

ـ دەمانەوێ ماڵەکەی بۆ خاوێن کەینەوە. بەبێ ڕاوەستان تێکەوتین و هەرچی جل و جەواڕ و کەلوپەلی کۆن و بێ کەڵکی هەبوون فڕێمان دانە دەرەوە، پاشان دەر و دیوار و قوژبنی ماڵەکەمان خاوێن کردەوە. ئەوجار لە تەنەکەیەکدا ئاومان بۆ گەرم کرد. تاکو من و چنار یارمەتی حەمامکردنی مام نەسۆرمان دا و جلە نوێکانمان کردە بەری، کەژاڵیش پلاوگۆشتێکی لێنا و بۆ نیوەڕۆ پێکەوە نانمان خوارد. هێندەی پێ نەچوو کە مام نەسۆر گوتی:

ـ هەست دەکەم لەشم سووك بووە و دەمەوێ وەنەوزێك بدەم.

کەژاڵ جێگایەکی بۆ ڕاخست و ئەو نووست. ئێمە هەرکەسە و لەسەر بابەتێك کە پێوەندی بە ژیانی مام نەسۆرەوە بوو، لێدوانمان دەکرد، پاشان لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە لەجۆرە سەردانانە بۆ لای ئەو کەسانەی کە

لێیان قەوماوە بەردەوام بین. ئەوجار کەژاڵ هاتە سەر گرفتەکەی خۆی لەگەڵ خاڵی و هەرکەسە و بە جۆرێك ڕاو بۆچوونی خۆمانمان لە سەری دەربڕی. کەژاڵ و چنار پێیانوابوو کە دەبێ هەموو پێوەندییەك لەگەڵ ماڵی شاسوار بپسێنن، بەڵام من گوتم:

- ئەوە ڕێگاچارە نییە، چونکە دەمزانی نەدواندن و پەراوێزخستن نەك هەر ڕێگا چارەی گرفتەکە نین، بەڵکو ئاکامی خراپیشی بۆ هەردوولایەن بەدواوە دەبێ. هەربۆیە پێشنیارم کرد کە لەگەڵ خاڵە شاسوار، قسە بکەین. کەژاڵ و چنار ئامادە نەبوون کە پێکەوە لەگەڵی دابنیشین. من پێشنیارم کرد کە لەپێشدا لەگەڵ شێرکۆی کوڕی دانیشم و پاشان کە ڕای ئەوم وەرگرت، بچم بۆ لای شاسواریش. بۆ ئەم مەبەستە بە کەژاڵم گوت:

- لە شێرکۆی کوڕەخاڵت بگێڕەوە با بێت بۆ ئێرە و ئەویش بەڵێنی دا کە ئەم بابەتە لەگەڵ دایکی باس بکا و منیش لە ئاکامی ئاگادار بکاتەوە. بەجۆرە تا مام نەسڕۆ لە خەو هەستا، ئێمە بەردەوام بووین لە بیروڕا گۆڕینەوە، پاشان کە مام نەسڕۆ لە خەو هەستا، ماڵئاواییمان لێکرد و پێمانگوت: لە داهاتوودا سەردانی زیاتری دەکەین. لە ڕادەربرینەکانی مام نەسڕۆ وادەردەکەوت کە ڕۆشناییەك بە ڕوویدا کراوەتەوە. گەلێك بە هەستەوە بەڕێی کردین و هیوای خواست کە زیاتر بە خۆماندا بچینەوە و نەتەوەی خۆمان لەبیر نەکەین. لە کاتی گەڕانەوە بەرەو ماڵ، تووشی مامۆستا جوامێر هاتین کە پێمەڕەیەکی بە دەستەوە بوو. ڕۆژباشمان لێکرد و پرسیمان:

- خێرە؟

- خێر دەبێ، بەفرەکان وردە وردە تواونەتەوە و دەمەوێ جۆگەلەی پشتی باخەکە چاك کەمەوە کە ڕنوو تێکی داوە. مامۆستا جوامێر گەلێك بەو دۆستایەتی و هاوڕێتی کردنەی ئێمە کەیف خۆش بوو و هانی داین بۆ بەردەوامی زیاتر.

ئێمەش هیوای تەمەن درێژیمان بۆ خواست. لەوێوە چنار بەرەو لای ماڵی خۆیان لە ئێمە دابڕا و ئێمەش ماڵئاواییمان لێکرد. من و کەژاڵ لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە هەر ئەم بەیانی یە بنێرێتە دوای شێرکۆدا تاکو بێت بۆ ماڵی میمکی و لەسەر تەنگەژەیەك کە بۆیان هاتبووە پێش، قسەی لەگەڵ بکەین.

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی هێشتا قاوەڵتیم نەکردبوو، کە کاروان هات بە دوامدا و پێی گوتم کە لە ماڵی خۆیان کاریان پێمە.

گورج خۆم سازکرد و خۆم گەیاندە ئەوی کە لەگەڵ هەواڵپرسی و چاکوچۆنیەکی گەرم وگوڕی شێرکۆ بەرەوڕوو بوومەوە. پاش هەواڵپرسی و بەخێرهاتن، دەستمان کرد بە گلەییکردن لە یەکتر، شێرکۆ پێی گوتم:

- دەیانگوت گەلێك چالاکی، بەڵام دەمێکە لە چەند جێگایەك گوێم لێبووە کە دەڵێن بات داوەتەوە، نەکا بیر و باوەڕت سست بووبێ؟

- ئەگەر مەبەستت لە سستبوونی بیروباوەڕ، دروشمدان و بە بەژن و باڵای ئەم یان ئەو سیستمی بێگانەدا هەڵگوتن بێ، ئەوە بۆچوونەکەت ڕاستە و ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتیم بەسەردا هاتووە، چونکە گەیشتوومەتە سەر ئەو بڕوایە کە مرۆڤ دەبێ لەپێشدا مافەکانی خۆی بزانێ، ئینجا دەتوانێ باس لە مافی خەڵکانی دیکە و مافناسی بکا.

شێرکۆ دەستیکردە لێدوان لەسەر وڵاتانی کوبا. نیکاراگوا، ڕۆمانی، یەمەن و ویتنام. من نەمهێشت درێژە بدا و پێمگوت:

ـ برای بەڕێز! ئەتۆ دەبینی هاوولاّتییەکانی خۆت خەریکن لە برسان دەمرن، کە چی باسی وڵاتانێکم بۆ دەکەی کە بە هەزاران کیلومیتر لە ئێمە دوورن. ئەو جۆرە هەست و بیرکردنەوەی تۆ، لە پێوەندی لەگەڵ مرۆڤ دۆستیدا، خۆی لە خوێدا خاڵێکی بەهێزە، بەڵام ناکرێ ببنە بنەمای لێکدانەوە لەسەر شێوەی دەسەڵاتداری و مافخوازیی و ئازادیی لەو وڵاتانە. کوانێ ئەو بە بەژن و باڵا هەڵگوتنانە دەبنە ڕزگاریی خوازی. ئێمە بۆ خۆمان هەموو مافەکانمان پێشێلکراوە و هەر ڕۆژەی دەیان هاوولاّتیمان لەلایان داگیرکەرانەوە لە سێدارە دەدرێن، تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئێمەش دەمانەوێ وەك مرۆڤ بژین.

لە وەڵامی ئەم قسانەی مندا ئەو گوتی:

ـ تائێستا نەم دیتبوو کە مرۆڤ بەو جۆرە و لە ماوەی چەند مانگێکدا ١٨٠ گەرا وەرگەڕێ و پشت لە بیروباوەڕی خۆی بکا.

نەمدەویست باسی ئایدۆلۆژی ببێتە هۆی ناکۆکی لەنێوانمان، هەربۆیە پێم گوت «بە پێچەوانەوە، من ١٨٠ گەرا بام نەداوەتەوە و بۆ هیچ لایەکیش وەرنەسووڕاوم. بەڵکو ئاڵوگۆڕم بەسەردا هاتووە دەمەوێ لەمەولا بە بەژن و باڵای گەل و وڵاتی خۆمدا هەڵبڵێم».

درێژەم دا و گوتم:

ـ لەو بادانەوە و وەرچەرخانانە گەڕێ و کارێکی تایبەتیم پێتە. بۆ ئەم مەبەستەش باوەڕم پێتە" چونکە ئاگاداری چۆنیەتی بیرکردنەوەتم و دەزانم

دژی ئەو داب و نەریتە کۆنانەی کە ساڵەهای ساڵە کۆمەڵی ئێمە بە دەستییەوە دەناڵێنێ.

ـ ئەگەر مەبەستت ئەو دەنگۆیانە بێ کە سەبارەت بە ئەتۆ و کەژاڵ لە ئارادایە، جێگای هیچ چەشنە نیگەرانییەك نییە و بەڵکو بە دژی ئەو جۆرە دەنگۆ سازکردن و ئاکارە دواکەوتووانەش لە هەر کوێ و بۆ هەرکەسێکیش بێ ڕادەوەستم. کەژاڵ سەربەستە بۆ خۆی بڕیار بدا و زۆریشم پێباشە کە تۆی هەڵبژاردووە.

منیش سەرەڕای ئەوەی سوپاسم لێکرد گوتم:

ـ باسەکە چ پێوەندییەکی بە دەنگوی نێوان ئێمەوە نییە و ڕاست سەبارەت بە خۆتە.

ـ چ باسێك و چ پێوەندییەك؟

ـ دوێنێ و پێرێ شاسواری بابت لەسەر کەژاڵی کردووە و پێی ڕاگەیاندووە کە بمرێ هی خاکە و بمێنێ هی تۆیە.

شێرکۆ بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

ـ کام داوا، لێت تێناگەم مەبەستت لە داوای بابم چییە؟

دەستبەجێ تێگەیشتم کە شێرکۆش ئاگاداری بڕیارەکانی شاسوار لە پێوەندی لەگەڵ ژن بۆهێنانی دا نییە. بۆیە لێم پرسی:

ـ ئاکا ئاگادار نەبی کە شاسوار دەیەوێ دەستی ژنت بۆ بگرێ؟

ـ شوانە، زۆربەی خەڵکی گوندی خۆمان، بابم و شێوەی بیرکردنەوە و خۆ و خدەی ئەو دەزانن، من بەرپرسی هیچ ئاکار و کردەوەیەکی بابم نیم، تەواو و بڕاوە.

ـ بەڵام من نازانم. تەنیا کەژاڵ بۆی گێڕامەتەوە کە شاسوار دەیەوێ لەسەر دەستی خۆی کەژاڵت لێ مارە بکا.

شێرکۆ دەستی کردە گاڵتە و گوتی:

ـ بابم لە ناوەکەی ڕا دیارە کە چەندە دەتوانین چاوەڕوانی پشوودرێژی و لێبوردنی لێبکەین. بەتایبەتی کە ئێستا ڕەشبگیرە و هەرکەس وشەی "شا" بە پێش یان پاشی ناوەکەیەوە بێ دەیانگرن، بەڵام بابمیان نەگرتووە هیچ، پێشیان گوتووە کە پێویست ناکا ناوەکەی بگۆڕی، چونکە شاسوار، یانی سواری سەرپشتی شا بوون! بەدوای ئەوەدا کە ئەوەیان پێگوتووە، هێندەی دیکە شێرەکە بووە و جوابی کەس ناداتەوە. هەروەك لەپێش دا ئاماژەم پێ کرد، کەژاڵ بۆ خۆی لە هەڵبژاردن و هەڵبژێران دا سەربەستە و لەم پێوەندییەشدا ئەوەی بە من جێبەجێ بکرێ، ئامادەم یارمەتی بکەم. سەبارەت بەبابم، لام وایە ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایە و ناکرێ بڕواشی پێبکەین، چونکە ئەگەر بێت و بەو کەین و بەینەی خۆمان بزانێ، ڕەنگە ئەودەم ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە.

بەدوای ئەوەدا، بە شێرکۆمان گوت:

ـ پێمان خۆشە پێوەندی زیاترمان پێکەوە هەبێ.

شێرکۆ بەڵێنی دا بەردەوام بێ و ئێمەش سوپاسمان کرد.

نانی نیوەڕۆمان پێکەوە لە ماڵی دادە خاسپەری خوارد و پاشان شێرکۆ ماڵئاوایی لە ئێمە کرد. من ئیتر بەتەواوی دڵنیا بووم کە شێرکۆ شێلگیرە لەسەر هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە کەژاڵ و نایەوێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێك بێنێ. بۆیە پێشنیارم بە کەژاڵ کرد کە بابەتەکە لەگەڵ

مامۆستا جوامێر باس بکەین، بەڵکو بتوانێ خاڵە شاسوار لەو هەڵوێستە پاشگەز بکاتەوە. کەژاڵ پێشنیارەکەی پەسەند کرد و گوتی:

ـ مامۆستا خاوەنی گەلێك ئەزموونی بەنرخە و لەوانەیە بتوانێ چارەسەری کێشەکە بکا.

ئێمە لەسەر ئەوە ساخ بووینەوە کە بۆ ئێوارێ سەردانی مامۆستا جوامێر بکەین. بۆ ئەم مەبەستە کاروانمان نارد بۆ ماڵیان تاکو ئاگاداریان بکاتەوە.

لە کاتی ماڵئاوایی کردن لە ماڵی دادە خاسپەری، وەبیرم هاتەوە کە بەڵێنم بە خاڵە شامار دابوو زیاتر لێی بپرسمەوە، بەتایبەتیش کە نەخۆش بوو. کە هاتمەوە یەکڕاست چووم بۆ لای خاڵە شامار. زیاتر لە شەش تا حەوت جاران لە دەرگای ماڵەکەیم دا، بەڵام دەرگام لێ نەکراوە. لای خۆم گوتم کە بەهار وساڵی نوێ پێی لێهەڵچنیوین و هەواش وردە وردە گەرم داهاتووە و ڕەنگە خەریکی چاککردنەوەی جۆگەی ئاوەکان بێت و ئامادەیان بکا بۆ ئاوداشتن. گەڕامەوە بۆ ماڵ و باسی دانیشتنەکەی خۆم و کەژاڵ و شێرکۆم بۆ دایکم گێڕاوە. ئەویش نەهێنای و نەبردی و گوتی:

ـ ئەگەر من شاسوار بناسم، ئەو هێندە کەللەڕەق و لاکێشە، کە مافی ئافرەت و سەربەستیی ئافرەت لای وەك گێرەی گایە و بێجگە لە قسەی خۆی، گوێبیسی کەس نابێ.

ـ جا چارە چییە؟

ـ چارە ئەوەیە ئەگەر واز نەهێنێ، دەبێ کەلێن بکرێ.

پاش تاوێك بیرکردنەوە گوتم:

ـ من دژی ئەم کەڵێن کردن و زەبر و زەنگەم، چۆن دەکرێ بۆ خۆم پێشنیاری کەڵێن کردنی کەسێك بکەم و لە هەمانکاتیشدا خۆم بە لایەنگری مافی مرۆڤ بەگشتی و مافی ئافرەتان بە تایبەتی بزانم؟

دایکم بزەیەکی کرد و گوتی:

ـ مەبەستم لە کەڵێنکردن خۆ زەبروزەنگ نییە. شاسوار وا چەسپاوە بە هێندێك داب و نەریتی کۆنەوە کە قاچی لە بەرەی ژێری شۆڕتر بووە. ئەو هەموو هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتیی لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی تەسکی خۆیدا دەبینێ. بێشك ئەگەر بیەوێ تەنیا ئەسپی خۆی تاو بدا، بێجگە لە کەڵێنکردنی، ڕێگا چارەیەکی دیکەم پێ شك نایە.

هەرکە گوێم لەو لێدوانەی دایکم بوو، خەریك بوو لە خۆ بایی بم. بە جورێك هەستم دەکرد کە خەریکم دەبمە مرۆڤێك کە گۆڕانکاریم لە خۆمدا پێك هێناوە و لە هێندێك بواردا وا گەشەم کردووە کە دەتوانم چاکە و خراپە لە یەك جوێ کەمەوە، پاشان ڕووم لە دایکم کرد وگوتم:

ـ بڕیار وایە من و کەژاڵ ئەم ئێوارەیە سەردانی مامۆستا جوامێر بکەین. دەتوانی هاوڕێیەتیمان بکەی و لەوێش لەگەڵ دادە جەیران باسی ڕابردووی خۆتان بکەن. خۆ هیچ نەبێ نەختێك وەڕەزیت دەشکێ. بە داهاتنی لێڵەی ئێوارێ کەژاڵ هات و ئێمە پێکەوە بەرەو ماڵی مامۆستا وەڕێ کەوتین. بە گەیشتنمان بە دەرکی ماڵیان، دادە جەیران بەرەو پیرمان هات. دوو سێ جار لەسەر یەك بەخێرهاتنی کردین، من و کەژاڵ گەلێك سوپاسی مامۆستامان کرد بۆ ئەو هەموو یارمەتییەی لە بۆ فێربوونی کوردی پێی کردبووین. چنار خەریك بوو بە چایی لێنانەوە و من بە

دەرفەتم زانی باسی گرفتی کەژاڵ و شێرکۆ بۆ مامۆستا بکەم. هەموو شتێکم بۆ گێڕاوە. مامۆستا گوتی:

ـ ئەو بەشەی کە پێوەندی بە شاسوارەوە هەیە دەبێ بە تێبینییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین، چونکە شاسوار لە ڕادە بەدەر دەمارگرژ و خۆویستە و لەم دواییانەش دا بۆرە پێوەندییەکی بە دامودەزگاکانی تازە دامەزراوی مەلاکانەوە گرتووە.

کەژاڵ سوپاسی کرد و مامۆستاش کەژاڵی بە تەواوی دڵنیا کردەوە کە لە بەیانی زووتر نییە ئەو تەنگژەیە لەگەڵ شاسوار دێنێتە گۆڕێ. کاتی ماڵئاوایی کردن هاتبوو، بەڵام دایکم و دادە جەیران وا چووبوونە نێو دونیای خۆیانەوە کە ئاگایان لە دەوروبەری خۆیان نەمابوو. ئێمە تاکو درەنگانێك دانیشتین و کاتی نووستن هاتبوو، بۆیە پێمگوت:

ـ باشتر وایە دەردە دڵەکانتان هەڵگرن بۆ جارێکی دیکە و ئێستا کاتی ماڵئاوایی هاتووە.

لام وایە ئەو شەوە یەکێك لە شەوە خۆشەکانی ژیانی پاش تەنیایی دایکم بووبێ. لە گەڕانەوەدا، لەپێشدا چووینە دەرکی ماڵی کەژاڵ، بەڵام هەرچەند لە دەرگای ماڵماندا کەس هەڵنەستا دەرگامان لێبکاتەوە. دایکم گوتی:

ـ جا کەژاڵیش وەك کچی خۆمە و با لە ماڵی خۆمان بنوێ تا بەیانی.

ئێمە هاتینە ماڵ و جێگامان بۆ نووستن ڕاخستن. دایکم و کەژاڵ لە ژوورێك و منیش لە ژووری خۆم. تازە خەو چووبووە چاوم، کە دەستێك

لێفەکەی لەسەر لادام و لە خەوی کردم. ویستم شتێك بڵێم ، بەڵام ئەو نەیهێشت بە چپەوە گوتی مەترسە کەژاڵم:

ـ شوانە، لەبەر دوو هۆ نەمتوانیوە بنووم. یەکەم زگم زۆر دێشێ و دووەمیش پرخەپرخی دادە وەنەوش هەراسانی کردووم.

لە حەق دەرنەچین کە من بۆ خۆم چەند ساڵێك بوو بە پرخەی دایکم ڕا هاتبووم ردەمزانی کە نووستن لە نیزیکی ئەو هەر وا ئاسان نییە. بە تایبەت ئەو کاتانەی کە زەختی دەچووە سەر.

پێمگوت:

ـ ئەگەر پێت خۆشە ڕاخەرەکانت بێنە ئێرە با جێگا گۆڕکێ بکەین.

ئەو قبوڵی نەکرد و گوتی جێگاکەم دێنمە ئێرە و پێویست ناکا ئەتۆش ئێرە بەجێ بێڵی، چونکە دڵنیام کە ئەتۆش ناتوانی لەو ژوورە و لە پەنا ئەو پرخە پرخەدا خەوت لێ بکەوێ.

هەستم کرد کە دایکم لە بیری چووە دەرمانی زەخت هێنانەخوارەوەکەی بخوات. هەستام لە خەوم کرد و سەرەڕای ئەوەی دەرمانەکانم پێدا، لە جێگا گۆڕینی کەژاڵێش ئاگادارم کردەوە.

هاتمەوە سەرجێگای خۆم و بە کەژاڵم گوت:

ـ ئەوە جارێ لە کۆڵ پرخەی دایکم بوویەوە. چۆنی لەگەڵ ئێش و ئازاری زگت؟

لە وەڵامدا گوتی:

ـ قەت زگ ئێشەی وام تووش نەبووە و جار لەگەڵ جاریش ئازاری زیاتر دەبێتەوە.

بەو جۆرەی کە کەژاڵ باسی دەکرد، ئازارەکەی جێگای مەترسی بوو، بەڵام نە دوکتۆر لەوێ بوو نە دەرمان، منیش هیچم پێنەدەکرا. پاش خولەکێك داوای ئاوی لێکردم، هەستام و گورج بۆم هێنا. بە دوای خواردنەوەی دوو سێ قوم ئاودا، لێی پرسیم:

ـ دەتوانی هێندێك نێوشانم بشێلی؟

منیش بە گەلێك شەرمەوە گوتم:

ـ بێگومان دەتوانم، بەڵام ئەزموونی ئەو کارەم نییە.

ـ ئەوەیان گرفت نییە و ڕۆژێك دادێ کە دەبێ پشت شێلانیش فێر بی.

لەسەرخۆ هەستام و دەستمکرد بە شێلانی شان و ملی. ئەو لە کاتی نووستن دا سەڵتە و زوونەکەی لەبەر داکەندبوو و تەنیا کراسێکی لەبەردا بوو. بۆ چەند خولەکێك شان و پیلیم شێلاو هەرچی دەهات لەشی گەرمتر دادەهات.

ـ دەستت نەڕزن، بۆ دەڵێی نازانم؟ ئەی ئەگەر زانیبات چۆنت دەشێلام؟

ئەو جار داوای لێکردم کە هێندێك سەرشان و باڵی بشێلم. منیش زۆر لە سەرەخۆ هەر لەسەر شانەکانی تاکو دەگاتە ئانیشکەکانی، بە وردیی دەمشێلان. پاش چەند خولەکێکی دیکە گوتی:

ـ وابزانم بە پێوە ماندوو دەبی و باشتر وایە دانیشی و بمشێلی.

منیش دانیشتم و بەدانیشتنەوە هێندێکی دیکە شان و ملیم شێلا و پاشان لێمپرسی:

ـ پێت وانییە بەست بێ؟

لە وەڵامدا گوتی:

ئێستا خەریکە لەشم گەرم دادێت و واش هەست دەکەم کە دەبێ ناوکم کەوتبێ. دەزانی ناوکمە بێنییەوە جێ؟

ـ نا، نازانم نێوك بێنمەوە جێ و هەر باوەڕیشم بە ناوککەوتن نییە، بەلام دایکم وەستای نێوکە هێنانەوەیە.

- پێم خۆش نییە دایکت لە خەو بکەین، چونکە ئەو نەخۆشە، با بەم شەوە نەیخەینە زەحمەت و خەوحەرامیشی نەکەین.

کەژاڵ درێژەی دا و گوتی:

ـ بۆخۆم پێت دەڵێم چۆن بکەی تاکو ناوکم بێتەوە سەر جێ!

ڕاکشا و گوتی:

ـ پێویست ناکا شەرم بکەی.

لەوپەڕی خاویی و دڵپاکیی خۆم هێشتا لە مەبەستەکەی نەگەیشتبووم ، بیریشم نەکردبۆوە کە خەریکە دەکەومە داوێکەوە کە خوازیاری نیم. گەڵێك لە سەرەخۆ دەستی ڕاستی گرتم و بە ئەسپایی لە بانی کراسەکەیەوە نایە سەر نێوك و زگی، پاشان دەستی چەپی گرتم و ڕایکێشا بۆ سەر ئەو دەستەکەم. من بە جارێك هەستم کرد کە خەریکە دەکەومە سەر کردەوەیەکی نەخوازراو و نەمدەزانیی چۆن خۆ لەو تەنگەژەیە ڕزگار بکەم. لە لایەکەوە نەمدەویست دۆستایەتیمان لەو بوارەدا بچێتە پێش. لە لایەکی دیکەوە ئەو میوانی ئێمە بوو و ئێمە جێگای بڕوای یەکتر بووین، بێجگە لەوانەش من کەوتبوومە نێو قەیرانێکی فکرییەوە و تازە خەریك بوو خۆم بناسمەوە. دەمەویست قەرەبووی هەڵەکانی ڕابردووم بکەمەوە و

بەجۆرە ببمە هەڵگری بیروباوەڕێك کە دوور بێ لە دەمارگرژی و بێگانە پەرستی.

پاش چەند چرکەیەك گوتی:

ـ کراسەکەی بەرم زبرە و ڕێگریشە لەبەر دەستت.

کراسەکەی تاکو سەرسینگی هەڵماڵی و ئەوجار دەستی خستمە سەر ناوکی بەبێ کراس. چرکە بەدوای چرکەدا باری دەروونی دەگۆڕا و بەدەستێکی دەستی چەپی بەسەر ناوك و زگیا دەخشاند، بەدەستەکەی دیکەشی دەستی ڕاستمی گرت و سەرەڕای ئەوەی دەیگوشی، گوتی:

ـ پێمخۆشە ئەم دەستەت لەسەر دڵم بێ.

دەستی بردم بۆ سەردڵی و وای بەسەردڵی دا دەخشاند، کە جاروبار بە حاستەم گۆشەیەکی دەستم دەخشایە سەر مەمکی. من وەکو پەسێك کە چەقۆی بۆ سەربڕین لەبەرچاو تیژ بکەن، هەناسەم بە حاستەم دەهاتە دەرێ و خۆمم کش و مات کردبوو. تەواوی ئازای لەشم ببووە ئاو. لەرز بە جۆرێك دایگرتبووم وەك ئەوەی لە سەرمای ژێر پەنجا پلەی دەشتی سیبری گیرم کردبێ. لە بارودۆخێکدا بووم کە وامدەزانی هیپنۆتیزم کراوم، بەڵام بەو حاڵەش دەمزانی چ دەگوزەرێ. لە چرکەیەك دا چەند جار ڕەنگم دەگۆڕا. تەواوی لەشم موچوڕکی پێدادەهات و جۆرە ترسێکیش دایگرتبووم و دەروونیشم ئازاری دەدام. لە شەرم دا ددانم بە جەرگم دا دەنا. ویستم پێی بڵێم کە لەوانەیە ناوکی هاتبێتەوە سەر جێگای خۆی، بەڵام بەرلەوەی بێمە زمان، دەستی گرتم و ڕاست لەسەر مەمکی دانا. لە چاوتروکانێکدا هەستم کرد بەرقی چوارسەد ڤۆڵت گرتمی. هەناسەکانم سوار بوون و بۆ

خولەکێك نەمزانی خەون دەبینم یان بەرەو ڕووی ڕاستییەکم. لام وابێ کە ڕووداوەکە لای ئەو سروشتی بوو، چونکە بەدوای چەند چرکەیەکدا هەناسەکانی تا دەهات خێراتر و دەنگیشی بەرزتر دەبوو. منیش وام هەست پێ دەکرد کە لە بەرزایی چوارهەزار گەزییەوە بە پەرەشوت خۆم بەرداوەتەوە، بەڵام پەرەشوتەکەم لە کارکەوتووە و ناکرێتەوە. پاش کەمتر لە خولەکێك، وا هەناسەکانی سوار بوون، کە ژمارە نەدەکران. بەدوای ئەوەدا لە گل و پل کەوت و دەستەکانی بەردام. وادەردەکەوت کە ناوکی هاتبێتەوە سەر جێگای خۆی. ئەم ڕووداوە لای من سروشتی نەبوو. نەك لەبەر ئەوەی کە حەزم لە دڵداریی و خۆشگوزەرانی نەبووبێ" بەڵکو لەبەر فەیرانێکی هزری بوو کە هەموو بوارەکانی ژیانمی گرتبۆوە، بێجگە لەوەش من پێشتریش مەبەستەکانی کەژاڵم دەزانی و لەوەش ئاگادار بووم کە منی خۆشدەوێ. منیش ئەوم خۆشدەویست و لەو بوارەدا بەباشی لێی تێگەیشتبووم، بەڵام گرفتەکانی سەر ڕێگای ژیان هێندە زۆر بوون کە لە بیری ژیانی تایبەتیدا نەبووم. لای خۆم دەمگوت: هەر دوێنێ بوو کە خڕخاڵەکەی دایکم فرۆشرابوو بۆ دانەوەی قەرز و کڕینی پێخۆری ڕۆژانە. سەرجەمی ئەو تەنگ و چەڵەمانە وا کاریگەری تێکردبووم کە وەکو داری خۆرکە لێدراوم لێهاتبوو.

کاتێك هەستم پێکرد کە کەژاڵ بە نیوە ئاکامێك گەیشتووە، پێمگوت:

- لام وایە ناوکت هاتووەتەوە سەر جێگای خۆی و باشترە هەندێك بحەسێیەوە.

به خەیاڵی خۆم وام دانابوو کە لەوانەیە کەژاڵ سوپاسم بکا، کە بە نیوە و ناتەواو ناوکی گیرایەوە. ئەو هەستا سەرپێی و داوێنەکەی دادایە خوارێ، پاشان وەك ئەوەی تورە بێ، پێی گوتم:

ـ هەروەك دەزانی خوێن لە دەمارەکانتدا ناسورێ و هەست دەکەم کە هیچ خۆشەویستییەکت بەرانبەر بە من نییە؟

خۆم خستە ئەوپەڕی بێ خەبەرییەوە و پێم گوت:

ـ ڕاستە، بۆ خۆم تا ئێستا ناوکم نەکەوتووە، بەڵام لە زۆر کەسی دیکەم بیستووە کە ئازارێکی لە ڕادە بەدەر و بڕست بڕی هەیە.

دەستبەجێ دڵیم داوە و پێم گوت:

ـ هیوادارم بە هەڵە لێم تێنەگەی. بڕوا بکە نەك هەر خۆشتمدەوێ و ڕێزم بۆت هەیە، بەڵکو بە مرۆڤێکی تێگەیشتوو و سەربەستت دەزانم و ئەوەشم لێ ڕوونە کە مرۆڤێکی خوێنگەرم و دڵسۆزی، بێجگە لەوانەش خۆشەویستی من بۆ تۆ لە دڵەوەیە.

ئەوجار بەگەرمی لە ئامێزی گرتم و سەرمی لەسەر سینگی دانا. بۆ ماوەی زیاتر لە چارەکێك وا لە ئامێزی گرتبووم کە دەمتوانی هەموو لێدانەکانی دڵی ببژێرم. وام دەزانی لە گەردوونێکی دیکەدا پیاسەم دەکرد کە بێجگە لە ئێمە بوونەوەری دیکەی تێدا ناژی، بەڵام بە بێشك نەك تەنیا لەبەر ئەوەی کە لە ئامێزی جوانە کچێکی خوێنشیرین و بەژن و باڵا جواندا بووم، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە دڵی مرۆڤێکم ڕازی کردبوو، بێ ئەوەی هیچ چاوەڕوانییەکی خۆشگوزەرانی و کەیفکردنم لێی بووبێ. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە خۆشگوزەرانی و کەیفکردن لە تەمەنی گەنجیەتیدا

گەلێك سروشتیە و منیش وەك گەنجێك دەبا خۆشم ڕابواردبا. لای خۆم بیرم دەکردەوە کە مرۆڤەکان هەموویان وەك یەك بیرناکەنەوە و نابێ دڵی خۆم لە جێی دڵی کەژاڵ و یان هیچ کەسی دی دانێم. دڵی کەژاڵ بەو جۆرە ڕازی دەبوو کە بۆ خۆی حەزی دەکرد، بەڵام دڵی من بە شێوەیەکی دیکە.

بێجگە لەوەی کە پاشماوەی شەوەکە چۆن تێپەڕ بوو، بە کەژاڵم گوت:

ـ ئێمە دەبێ ڕێگا چارەیەك بۆ گرفتێك کە خاڵە شاسوارت دروستی کردووە بدۆزینەوە. ڕاستە ئەتۆ مرۆڤێکی سەربەست و خوێندەواری و زۆر داب و نەریتی کۆنت لێ دواکەوتووانەیە، بەڵام نابێ لە بیرت بچێ کە کۆمەڵی ئێمە لە سایەی سەری ئەم تازە بە دەسەڵات گەیشتووانە دا، بەرەو سەدەکانی نێوەڕاست و بگرە ئەولاتریش دەگەڕێتەوە.

کەژاڵ لەو جۆرە قووڵ بیرکردنەوەی من لەسەر دڵداری و گرفتی لاوان، تێبینی خۆی هەبوو. ئەو دەیگوت مرۆڤێك کە گەیشتبێتە تەمەنی یاسایی و بیەوێ بە ویستی خۆی خۆش ڕابوێرێ، بۆی هەیە بەو جۆرەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە هەڵبژێرێ.

درێژەی دا و گوتی:

ـ دڵداریکردن بەشێکی زۆر گرینگە لە ژیانی مرۆڤەکان و ئەگەر ئێمە بە گەنجی دڵداری نەکەین، کە تەمەنمان چووە سەر ئیتر دڵداری و خۆشەویستی مانای نامێنێ. من لە شتێك دەدوێم کە شوێنی ڕاستەوخۆی لەسەرباری دەروونی گەنجان و لاوان هەیە. بێشك ئەوەش دەزانی کە نەریتی بیرکردنەوەیە کە کۆمەڵی ئێمەی بەرەو هەڵدێر و نایەکسانی بردووە. ڕاستە ئەمەی کە من لەسەری دووام لەگەڵ ئەوەی کە ئەتۆ لە مێشکت دایە

جیاوازییان هەیە، بەڵام من لە کاتی دڵداریدا دڵداری دەکەم و لە کاتی سیاسەتکردنیشدا سیاسەت. شوانە، زانیوتە کە یەکێك لە گرفتە بنەڕەتیەکانی گەلی ئێمە لە درێژایی مێژوو دا ئەوە بووە کە ئێمە سیاسەت و دڵداریمان وەك دوو بابەتی بە تەواوی لێك جیاواز، لە سەرێکی تەرازوو داناوە و چۆنیەتی بیرکردنەوەی خۆشمان لەو سەری تەرازووەکە. بە داخەوە هەر بۆ خۆشمان دەبینە پارسەنگەکانی هاوتا کردنیان. واتە هەرچی بەدڵمان نەبووە، نەمان لێ کردووە و بە گژیدا چووینەتەوە. هەر بۆیەشە دوژمن بە کەڵکوەرگرتن لەو لاوازییانە، دەرفەتی ئاژاوە نانەوەی بۆ ڕەخساوە و توانیویەتی لێکمان دوورخاتەوە، بێجگە لەوەش ئێستاشی لەگەڵ بێ، باری دەروونناسی ئێمە گەلێك کزە و لاوازیی بەرچاوی پێوە دیارە. هەربۆیە لە بەرانبەر ڕووداوەکان و لە تاوتوێکردنی ئامانجە دوور و ستراتژییەکاندا دەستەوەستان دەمێنینەوە.

هەستم پێکرد کە ئەوە لە بنەڕەتدا ڕاستە، بەڵام گومانیشم لەوەدا نەبوو کە ناڕاستەوخۆ ڕووی لە منیشە و بێشك حەقیشی بوو. نەمدەویست کە ئەو واهەست پێ بکا کە لە مەبەستەکەی تێنەگەیشتووم، هەر بۆیە گوتم:

- هیوادارم بە خراپ لێم تێنەگەی و واش نەزانی کە خۆشم لە ڕابواردن نایە.

ئەو گەلێك تێکۆشا بە جۆرێك بەڵێنییەکم لێ وەرگرێ، یان لانی کەم ڕازیم بکا بە جۆرێك پێوەندی کە من هێشتا بیرم لێنەکردبۆوە.

ـ هێشتا کاتی بەڵێن دان نەهاتووە و بۆم ڕوون کردەوە و دڵنیام کردەوە کە بە جوانی هەست بە ویستەکانی دەروونی دەکەم.

پاشان کشامەوە سەرجێگاکەی خۆم و ڕاکشامەوە.

کەژاڵ شەوقی چراکەی لەڕادە بەدەر کز کردبوو. ئەو هەستا و هاتە لای منەوە و پرسی:

ـ تۆ بڵێی دادە وەنەوش گوێی لێمان نەبووبێ؟

ـ نە، دایکم بە هۆی لەسەر بوونی زەختی خوێنەوە، خەوی قورسە و پێم وانیە گوێی لێمان بووبێ.

پاشان داوای لێبوردنی لێکردم و گوتی:

ـ ئەمشەو نەمهێشت بنوی و لەوانەشە لێم دڵگیر بووبی، بەڵام بابزانی خۆشەویستی لەو شتانە ناپرسێتەوە.

سوپاسم کرد و گوتم:

ـ هیوادارم کە تاسەر خۆشەویستی یەکتر بین.

بەرەبەرە ڕۆژ بۆوە و هەرکەسە و ڕاخەری خۆمان کۆ کردەوە.

کەمێك دارم هێنا و کوورەی ئاگرەکەم هەڵکرد. کترییەکەم خستە سەر کوورەکە و لە خشەخشی ئێمە ڕا، دایکیشم لەخەو هەستا. بەیانی باشی لێکردین و داوای لێبوردنیشی لە کەژاڵ کرد کە بۆتە هۆی نەنووستنی شەوی.

ئاو کوڵی و چاییمان بەستەبان قوریەکە و قاوەڵتیمان کرد. کەژاڵ بە پەلە بوو دەبا چووباوە، چونکە دادە خاسپەری ئاگاداری نەهاتنەوەی شەوێ نەبوو.

وەبیرم هاتەوە کە دەبا سەردانی خاڵە شامار بکەم. کەژاڵ چۆوە و منیش تا گەرم داهاتنی تاو و بان لە ماڵ دانیشتم، پاشان بەرەو لای خاڵە شامار وەڕێ کەوتم. چەندین جاران لە دەرگای ماڵم دا، بەڵام وا دیاربوو کە لە ماڵ نەبوو. دیسان گەڕامەوە و لە وەڕەزیدا نەمدەزانی چی بکەم. تازە ئیتر لە هاوەڵاتی چەپم دابڕابووم و جێگای بڕوایان نەمابووم. ڕەنگ بێ ئەوان ڕووبەڕوو پێیان نەگوتبام، بەڵام گومانم لەوەدا نەبوو کە خرابوومە نێو لیستەی "سیخوڕەکانەوە"! لەو بیرانەدا بووم کە دەبێ خۆ لەو تەریکی و سەرلێشێواویە دەرباز بکەم، بەڵام پێویستم بە یارمەتی بوو. من دەبا بەر لە هەموو شتێك لەگەڵ دایکم دانیشتبام و چۆنیەتی لە سێدارەدرانی بابی بۆ ڕوون کردەبامەوە، چونکە لە کاتی بەدواداچوونی شێرزاد دا لێم تووڕە ببوو و پێی گوتبوو کە لە گەڕانەوەم دا، دەبێ هێندێك بابەتم لەگەڵ دا بێنێتە گۆڕێ، بێجگە لەوەش نەمدەزانی کە کەژاڵ و چنار پێوەندییەکی ڕێکخراوەییان لەگەڵ لایەنێك هەیە یان نا. ئەمانە و گەلێك بیری دیکە، مێشکمیان بە خۆیانەوە ماندوو کردبوو. هەر لەو بیرانەدا بووم کە لە نەکاو درا لە دەرکی حەوشەکەمان. بە پای پەتی چووم دەرگام کردەوە، دەبینم شێرکۆیە. ڕۆژباشم لێکرد و یەك ڕاست هاتینە ژوورەوە. ڕۆژێکی خۆش بوو وەك ڕۆژێکی بەهاری. نەوگێکم هێنا و لە سەربان ڕاخست. دایکم هات و بەخێرهاتنی شێرکۆی کرد و لامان دانیشت. شێرکۆ هێندێ باسی بابی خۆی (شاسوار) ی کرد و لە هەڵسوکەوتەکانی گەلێك بێزار بوو. ئەو گوتی:

- شاسوار خۆی هەڵدەقورتێنێتە نێو ژیانی خەڵك و منیش شەرم دەكەم لەوەی كە بابم بەو شێوەیە خۆی دەنوێنێ.

دایكم پێی گوت:

- ڕۆڵە، پێویست ناكا خۆت بەو جۆرە هەڵسوكەوت كردنەی بابتەوە ماندوو بكەی. هەرچەند شاسوار تۆخس و یەك گەرەیە، بەڵام لەو بوارەدا تاڕادەیەك بێتاوانە. بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئەوە بزانی كە ئەو نەخوێندەوارە، بێجگە لەوەش ئەوە ئەو سیستمە دەسەڵاتدار و كۆمەڵگا دواكەوتووەیە، كە گۆڕەپانی بۆ خۆ هەڵقورتاندن لە ژیانی تایبەتی خەڵكانی دیكە ڕەخساندووە. گرینگ ئەوەیە كە ئێوە وەك شاسوار نەبن. ئەوە ئێوە كچان و كوڕانی گەنجن كە دەتوانن تێبكۆشن بۆ پێكهێنانی ئاڵوگۆڕی كۆمەڵایەتی، بە جۆرێك كە شیاوی سەردەم بێ. كوڕی خۆم! منیش ڕۆژگارێك لەسەر ئەو بڕوایە بووم كە ئەجۆرە گیانلەبەرانەی وەك شاسوار دەبا كەڵێن كرابان، بەڵام بە كەڵێنكردنی ئەویش دەردێك لە دەردەكانی لە ئەژمار نەهاتوومان چارەسەر نابن. دایكم هێشتا قسەكانی تەواو نەكردبوو، كەژاڵ بە قابلەمەیەك و دەسەوارەیەك نانەوە هاتە سەرەوە.

- هەر ئێستا مەشكەمان ژەندووە و كەرە و دۆی تازەم لەگەڵ نانی هەڵاتەی گەرم بۆ هێناون.

قابلەمەكەی دا بە دەستی دایكمەوە و بۆ خۆی لامان دانیشت. دایكم دوو جامیلكەی هێنا و هەر كەسە و كەمێكمان دۆ خواردەوە. بە تێكڕا سوپاسی كەژاڵمان كرد و دەست خۆشیمان پێگوت. دایكم ئێمەی بە

جێهێشت بۆ ئەوەی خواردنێك بۆ نیوەڕۆ لێ بنێ، چونکە یەکەمین جار بوو کە شێرکۆ بێتە ماڵمان.

کەژاڵیش بە دوای دایکمدا بە جێی هێشتین. شێرکۆ بەبێ پێشەکی دەستی بە گلەیی کردن لە هاوەڵانی ڕێکخراو کرد و گوتی:

ـ دوێنێ لە شاری کرند دانیشتنێکمان هەبوو. زۆر لە هاوەڵان هێرشیان دە کردە سەر تۆ. دەیانگوت کە ئەو ئیتر لە ئێمە نییە. ئەوان بە منیشیان گوت کە نابێ هیچ پێوەندییەکت پێوەبگرم.

ـ کاك شوان، دەکرێ بڵێی هۆی ئەم هەڵوێستەی هاوڕێیان لە چییەوە سەرچاوە دەگرێ؟

ـ هیچ بە خۆمەوە شك نابەم و کارێکیشم نەکردووە کە دژ بە کەسێك بێ. هەر وەك جاری پێشتریش پێم گوتی، ئێستاش لێت ناشارمەوە، من دەمێکە بڕوام بە دانی دروشمی بێ نیوەڕۆك، بەم وڵات ئەو سیستم ئەو ڕێبەردا نەماوە. خەریکی بە خۆداچوونەوەم و لە ڕێبازێك بیر دەکەمەوە کە بەر لە هەموو شتێك ڕزگاری لە بندەستی و چەوسانەوەی خۆمانی ئامانج بێ. لەوەش بێ باکم کە لیتکە و پیتکەم بۆ دروست بکەن و تاوانم بدەنە پاڵ. شۆڕشگێڕبوون چ پێوەندییەکی بە لایەنگری کردن لە سۆسیالیسم و هەڵبژاردنی ئایدۆلۆژیەوە نییە و مرۆڤ دەکرێ شۆڕشگێڕ بێ، بەبێ ئەوەی مارکسیست بێ یان کۆمۆنیست.

لە کۆتاییدا گوتم:

ـ لە بەشێك لە وڵاتانی ئەورووپایی و سەرمایەداریدا گۆڕانکاری بەرچاو کراوە، کە لە زۆر بواردا بە قازانجی کرێکاران و هەژاراندا

شکاوەتەوە، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە هەموو ئامانجەکانی هەژاران و کەم داهاتەکان بە دی هاتبن. بەتایبەتی لە بواری سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیریی و ئازادی دا، گەشەکردنەکە بە ئاشکرا دیارە، بەڵام ئەمجۆرە گەشەکردنانە لە وڵاتانی سۆسیالیستی یان نین و یان ئەگەریش هەبێ، وەڵامدەرەوەی ویستی دانیشتووانی ئەو وڵاتانە نییە. بۆ وێنە هێنانەوەش پێویست بە بەڵگە لەسەر کردارەکانی ئەم یان ئەو وڵات و دەسەڵاتی دەرەکی ناکا و دەتوانین هەر ئەو بەشداربوونەی خۆت لەو کۆبوونەوەی دوێنێتان و چۆنیەتی هەڵوێستەکانی هاوڕێکانت بکەینە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر. ئەوە نییە من وەك مرۆڤێك نامەوێ درۆشم بە بەژن و باڵای ئەم سەرکردە و ئەو سیستەم دا بڵێم. چۆن دەستبەجێ دەبمە بەکرێگیراوی بێگانە و دەیان بوختانم بۆ هەڵ دەبەستن! کاتێك مرۆڤ ئازاد نەبێ کە بۆ خۆی ژیانی هەڵبژێرێ، کە سەرەتاییترین مافی هەر مرۆڤێکە، ئیتر چ جیاوازیەك دەمێنێ لەنێوان ئایینی کۆن و سوننەتی، لەگەڵ ئەم ئایینە نوێیەدا کە لە ململانێ و پێشبڕکێ دایە بۆ دروستکردنی پێغەمبەرێکی هاوچەرخ!؟ بێجگە لەوانەش من بۆ خۆم دەمەوێ خاوەنی بیر و هزری نەتەوەیی خۆم بم و کەسانێکی دیکە خەت و نیشانم بۆ نەکێشن و ناشمەوێ ببمە پاشکۆی هیچ کەس و لایەنێکی دیکە.

شێرکۆ لێدوانەکەی لێ پساندم و گوتی:

- لێت تێگەیشتم شوان. من دەمێکە لەوە تێگەیشتبووم کە ئێوە لەگەڵ هاوەڵاندا نەماون. دڵنیا بە کە ئەمە چەندین جارە لە جەرگەی دانیشتنەکانمان دا تووشی گرفت دەبین و بڕیارەکان بەگشتی لەسەرەوە

دەدرێن و ئێمە هیچ بەشدارییێکمان لەو بڕیاردانانەدا نییە، بێجگە لەوەش ئاڵۆزی هەموو ڕیزەکانی ڕێکخراوی داگرتووە و ئێمە بەگشتی لەو بارودۆخە وەڕەزین. لەوانەش دەربچێ، پێشم خۆشە ئەگەر ئێوە پلانێکتان بۆ داهاتوو هەیە، منیش لە دەستەی خۆتان بژمێرن.

هێشتا شێرکۆ قسەکانی تەواو نەکردبوو، کە کەژاڵ هاتەوە بۆ لامان و گوتی:

ـ دایکم ڕایسپاردووم کە ئاگادارتان کەمەوە کە بۆ ئێوارێ میوانی خۆمانن.

ئێمەش سوپاسمان لێکرد و ڕەزامەندییمان نیشاندا. لە دڵی خۆمدا نەمدەزانی چۆن خۆشحاڵی خۆم سەبارەت بەو هەڵوێستەی شێرکۆ دەربڕم. وادەردەکەوت بە پێچەوانەی شێرزاد، شێرکۆ مرۆڤێکی گەلێك لەسەرەخۆیە و بە خۆڕایی لەسەر هەر پێشهات و ڕووداوێك هەڵناچێ. بەدوای ئەوەدا من هێندێك لەسەر کوێرەوەری مام نەسۆر و سەیران و خاڵە شامار، بۆ شێرکۆ دوام، پاشان چۆنیەتی فێربوونی خۆمم بۆ خوێندن و نووسین بە کوردی و پێوەندیم لەگەڵ کەژاڵ و چنار بۆ گێڕایەوە.

ئێمە هێشتا وردەکارییەکانی لێکدانەوە و ڕاوێژکاریەکەمان کۆتایی نەهاتبوو، کە دایکم بانگی کردین:

ـ شێرکۆ! شوانە! وەرن، چێشت پێ گەیوە، تیسم و میسمەکان لە دەستتان دەرناچن، بەڵام چێشتەکە سارد دەبێتەوە.

ئێمەش هەستاین و چووین بە دەنگیەوە. پەتاتەی کوڵیو و کوتراو لەگەڵ پیواز و ڕۆنی سوور کراوە و دۆی تازە لە مەشکە داکراو، بوو بە پێخۆری نیوەڕۆمان. پاش ئەوەی نانمان خوارد، شێرکۆ گوتی:

ـ کارێکی تایبەتیم پێتە، بەڵام شەرم دەکەم لە هێنانە گۆڕێ.

دەستبەجێ بیرم چوو بۆ لای کەژاڵ. پێم وابوو کە ڕەنگە کارەکەی لەو پێوەندیە دابێ و یان هیچ نەبێ شاسوار گوشاری خستبێتە سەر بۆ ئەوەی شێرکۆ بە چۆکدا بێنێت و کارێکی زۆرە ملی پێبکا، کە بە پێچەوانەی ویستی خۆی بێ. بۆیە پێم گوت، دەتوانی بەدڵنیاییەوە پشتم پێ ببەستی و پێویست ناکا لە هیچ ڕادەربڕینێك لەگەڵ مندا شەرم، یان سڵ بکەی.

ـ لەوە دڵنیام کاك شوان کە بە هانامەوە دێی، بەڵام لەوە دەترسم کە شاسوار بە بۆنەی منەوە کێشەتان بۆ ساز بکا.

ـ کاکە شێرکۆ، ئێمە تەواوی ژیانمان پڕە لە کێشە، با کێشەیەکی دیکەیشی پێ زیاد بێ. گرینگ ئەوەیە کە بە ڕوویەکی ئاواڵەوە لەگەڵ گێرە و کێشەکان بەرەوڕوو ببینەوە.

شێرکۆ بە جۆرێك کە نیشانەی بێ هیوایی پێوە دیار بوو گوتی:

ـ شاسوار لە ماڵ وەدەری ناوم و سوێندیشی خواردووە کە بۆم نییە جارێکی دیکە سەر بەو ماڵەدا بکەم. بۆ خۆت دەزانی بابم لە دەمارگرژی و دواکەوتوویی‌دا هاوتای نییە. لەوەش دەترسم بەڵایەك بە سەر فرمێسکی خوشکم بێنێ.

ـ خوشکت بۆ؟

ـ خوشکم دوو ساڵ لە من چووکەترە و بیست و دوو ساڵیەتی. بەبێ ئەوەی بۆ خۆی ئاگادار بێ، بە مێردی داوە بە کابرایەکی دەوڵەمەند کە دوو خێزانی دیکەی هەیە. ئێمە لە ماڵی خاڵم پێ گەیوین و ئەمە چەند ساڵێکە بە بۆنەی دەرس خوێندنەوە ئەمان هێشتووە ئەم کارە سەر بگرێ. خاڵم کە ماڵیان لە کرماشان بوو و ئێمەی بەخێو کردووە. بەداخەوە ئەو کۆچی دوایی کردووە و فرمێسکیش لە زانکۆ وەدەرنراوە و گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی بابم. لەو لاشەوە ئەم تازە بە دەسەڵات گەیشتووانە پاڵپشتی بێ ئەملاو ئەولای دواکەوتوویی و دەمارگرژین. بە کورتی گۆڕەپان بۆ هەڵبەز و دابەز و چوار ناڵکردنی بابم وا ڕەخساوە، کە بێنە و سەیر بکە.

لەو پەڕی پەرۆشی دا ڕووم لە شێرکۆ کرد و پێم گوت:

ـ ماڵی ئێمە هی خۆتانە. بۆ خۆت دەزانی کە ئێمە جێگا و ڕێگامان بۆ چوار کەسی دیکەش هەیە. ئێوە دەتوانن بە ئارەزووی خۆتان لێرە هەڵسوکەوت بکەن. هەر لە ئێستا زووتر نییە دادە خاسپەری دەنێرین هەموو کەلوپەلەکانت بێنێ بۆ ئێرە. سەبارەت بە خوشکیشت، باشتر وایە درێژە بە خوێندنەکەی بدا.

ـ شوانە، دەبێ بۆ خۆت بزانی کە فرمێسک لەلایەن بەڕێوەبەریی زانستگاوە، کە ڕاستەوخۆ لەلایەن شێوە مەلایەکەوە بەڕێوە دەچێ، بە تاوانی ئەوەی کە سەر بە دژە شۆڕشە و ناموسوڵمان، وەدەرنراوە!؟ خۆ ئەو بێچارەیە لە خۆشیان نەهاتۆتەوە. بڕوام پێ بکە لەو کاتەوە گەڕاوەتەوە، ساتێکی لێ وەك ساڵێك تێ دەپەڕێ.

لای خۆم گوتم بێبەزەیی بوونیش دەبا سنوورێکی هەبایە. بەدوای ئەو گلەیی و گازندانەدا، دوو بە دوو بەرەو لای خاڵە شامار وەڕێ کەوتین تاکو هەواڵێکی بپرسین.

ئێمە زیاتر لە پێنج خولەك لەوێ ڕاوەستاین و لە دەرگامان دا، بەڵام نە کەسمان دیت و نە دەرگاشمان لێ کرایەوە.

بە شێرکۆم گوت:

ـ لەوانەیە خاڵە شامار شتێکی بەسەر هاتبێ، چونکە ئەوە چەند جارێکە دێمە ئێرە و لە دەرگا دەدەم، بەڵام هیچکات لە ماڵ نەبووە.

ئێمە گەڕاینەوە بەرەوماڵ و دایکمم ئاگادار کردەوە کە ئەوە چەند جارێکە دەچمە سەردانی خاڵە شامار، بەڵام دەرگاکەی داخراوە، پاشان گیرۆدە بوونی شێرکۆ و فرمێسکم بە دەست شاسوارەوە بۆ گێڕاوە. ئەویش وەك خو و خدەی دایمی خۆی، گوتی:

- خۆ سەری ئاسمان بە پووش نەگیراوە. با فرمێسك و شێرکۆش بێنە ئێرە و ببنە کچ و کوڕی من.

شێرکۆ سوپاسی کرد و گوتی:

ـ ئێوە ڕێزتان هەیە و لە جێی دایکمانی.

بەدوای ئەوەدا تاکو خۆرە چەرخەی ئێوارێ خۆمان خەریك کرد بە هێندێك بەڵگە و نووسراوەی کۆنەوە و بەشێکیان کە چی دیکە کەڵکیان نەمابوو سووتاندن. بۆ ئێوارێ بە تێکڕا وەڕێ کەوتین بۆ ماڵی دادە خاسپەری. ئێوارەیەکی خۆش بوو. هەرکەسە و سوچێکی لە گرفتی خۆی

گێڕایەوە. بەرلەوەی شام بخورێ، کەژاڵ پێشنیاری کرد کە بنێرین بە دوای چنار و فرمێسک دا.

ئێمە هەموومان بە پێشنیارێکی چاکمان زانی و پێمان خۆش بوو. کەژاڵ ئامادە بوو بچێ بەدوای فرمێسک دا. کێ کێی زۆرمان کرد، بەڵام کەس ئامادە نەبوو بچێ بە دوای فرمێسک دا. هەمووان پێیان وابوو کە شاسوار وەبەر شەقانمان دەدا. دادە خاسپەری پێشنیاری کرد با تیروپشك بگرینەوە و ناوی هەرکەس دەرچوو، بچێ فرمێسك بێنێ. کاروان بۆ ئەم کارە بە منداڵ زانراو نەدەکرا بەشداری تیروپشك بێ. شێرکۆ ئەم ناوانەی لەسەر چوار پارچە کاغەز نووسی. وەنەوش، خاسپەری، شوان، شێرکۆ. کاغەزەکان ملۆچە کران و کاروانمان بانگ کرد تاکو دانەیەکیان هەڵبژێرێ. ئەو هاتە پێشەوە و هێندێکی کاغەزە ملۆچە کراوەکانی ئەملاو ئەولا پێکردن، پاشان دانەیەکیانی هەڵگرت و دای بە دەستی شێرکۆوە. ئەویش کردیەوە و گوتی:

ـ برا ناوی کاك شوان دەرچووە.

من خۆم گورج کردەوە و بەرەو ماڵی شاسوار وەڕێ کەوتم. هەوا هێشتا تاریك دانەهاتبوو، بەڵام هاتووچۆی نێو کۆڵانەکان کەمی کرد بوو. خەڵك مەڕ و ماڵاتەکانیان بەسەر دەکرد و دەرگای گەوڕی ئاژەڵەکانیان پشکۆڵ دەکرد. پاش چەن خولەکێك گەیشتمە دەرکی ماڵیان و لە دەرگایانم دا. دادە گەرشە، دایکی فرمێسك و شێرکۆ هات و دەرگای لێ کردمەوە. ئێوارە باشم لێکرد و ئەویش گەلێك بە ڕێزەوە وەڵامی دامەوە. ئەو خاتوونێکی گەلێك لەسەر دڵان و لەسەرەخۆ بوو. لە دایکمی پرسییەوە و گوتی:

ـ ڕۆڵە گیان، لە مێژە دەمەوێ سەردانی وەنەوش بکەم، بەڵام دەرفەتم بۆ نەڕەخساوە.

منیش سوپاسم کرد و پاشان هەواڵی فرمێسکم لێپرسی.

ـ فرمێسک لە ماڵەوەیە، بەڵام ناساغە.

بانگی فرمێسکی کرد و پێی گوت:

ـ شوانە هاتووە و کاری پێتە.

زۆری پێ نەچوو کە فرمێسک بە ڕەوتێکی زۆر شارستانیانە، بەڵام شڵەژاو و تێکچوو، هاتە دەر و هەواڵپرسی لێکردم و پاشان پرسی:

ـ ئەرکێکی تایبەتیتان هەبوو؟

ـ ئەرکێکی تایبەتیم نییە، بەڵام ئەمڕۆ شێرکۆ لە ماڵی ئێمە بووە. وارێك کەوتووین کە ئەمشەو ئەمن، شێرکۆ، چنار و دایکم لە ماڵی دادە خاسپەری کۆ بینەوە. پێشنیار کراوە ئەتۆش لەگەڵمان بی. جا ئەگەر دەتوانی، ئەوە من چاوەڕوانت دەبم تاکو خۆت ساز دەکەی.

فرمێسك ڕووی لە دادە گەرشە کرد و خەریك بوو شتێك بڵێ، کە دادە گەرشە پێی گوت:

ـ بۆ چاو لە من دەکەی؟ بۆ خۆت دەتوانی بڕیار بدەی. بۆ خۆت هەڵبژێرە و چۆنت پێخۆشە ئاوا بکە. مەگەر نازانی چۆن و بە چ شێوەیەك شێرکۆ لە ماڵ وەدەرنرا. خۆ ئەتۆ لە شێرکۆ زیاتر نیت. ئەگەر چاوەڕوانی چەپۆکەسەری زیاترت بە دەست شاسوار بەرکەوێ، ئەوە دانیشە و خەمت نەبێ. ئەگەریش ناتەوێ شاسوار داخی شێرکۆش بە سەر تۆدا بڕژێنێ، ئەوە بۆ خۆت بڕیار بدە.

فرمێسک کە توسقاڵێک وردەی تێدا بەدی نەدەکرا، ڕووی لە من کرد و گوتی:

ـ چاوەڕوانم بە، تا جلەکانم دەگۆڕم.

دادە گەرشە گەشایەوە و گوتی:

ـ دەك بە خێر بێی ڕۆڵە گیان. هیوادارم سەرت بەرز و لەنێو سەراندا دیار بێ، هەروەك ئەو باوکە کەس لێ نەڕەنجا و بوێرەت. بابت حازر بوو سەری بچێتە بان دار، بەڵام ئامادە نەبوو بچێتە ژێرباری زۆرداریییەوە.

زۆری پێ نەچوو کە فرمێسك بە نیوە شپرزەیی هاتە دەر و ئێمە پێکەوە هاتینەوە بۆ ماڵی دادە خاسپەری. بە ڕێگادا کە دەچووین، فرمێسك گەلێك پرسیاری ئاڕاستە کردم، کە زۆربەیانم وەڵام داوە بێجگە لە یەکێکیان. ئەو پرسی:

ـ خۆشەویسترین شت یان کەس کە لە سووچی دڵت دا جێی خۆی کردبێتەوە، چییە یان کێیە؟

پرسیارەکەم نائاسایی و بێ وەخت هاتە بەر چاو، چونکە ئێمە پێشتر تێکەڵاوییەکی وامان نەبوو. سەرەڕای ئەوەش بۆ دەبا ڕێك ئەو پرسیارەی لە من کردبا؟ هەڵبەت من وەڵامم بۆ ئەو پرسیارە هەبوو، بەڵام لام وابوو کە لەوانەیە فرمێسك لەو وەڵامە بە جۆرێکی دیکە تێ گەیشتبا، چونکە وام دەزانی ئەو تێکەڵاوی لەگەڵ سیاسەت دا نەبێ. بۆیە دەڵێم وەڵامم بۆ هەبوو، چونکە لەو چەند مانگانەی ڕابردوودا، هەستی نەتەوەییم وەکو گوڵە هەڵاڵە لە پشکووتن دا بوو، بێجگە لەوەش، لەوە تێگەیشتبووم کە

خاوەنی وڵاتێکی پارچە پارچە کراوم، کە لەسەر نەخشە نەدەبینرا، بەڵام بە ملیۆنەها حەشیمەتی لەسەر دەژیا. لە وەڵامی پرسیارەکەی دا گوتم:

ـ ئێمە هێشتا یەکترمان بەباشی نەناسیوە تاکو وەڵامێکی ڕێکو پێکت بدەمەوە، بێجگە لەوەش ڕەنگە ئەو هەستەی کە من سەبارەت بە خۆشەویستی شتێك یان کەسێك هەمە، لای تۆ جۆرێکی دیکە بێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە داهاتوویەکی نیزیکدا، ئەگەر بۆ خۆشم ڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکەت نەدەمەوە، لە ڕادەربڕین و کردارەکانمدا، وەڵامی ئەو پرسیارەت دەست دەکەوێ.

لە کاتی ڕێ ڕۆیشتنمان دا و لەبەر تەسکایی و کەم دەرەتانی کۆڵانەکان، نەماندەتوانی دوو بە دوو بە پاڵ یەکتردا بچین. هەر بەو بۆنەوە هێندێ جار ئەو دەکەوتە پێش و هێندێ جاریش من. ئەو کاتانەی کە ئەو دەکەوتە پێش، لە دواوە سەرنجێکی تایبەتیم دەدایە بەژن و باڵای.

فرمێسك لەش و لارێکی جوان و بە لەنجەی هەبوو. لام وایە لە تەواوی ژیانم دا کچی وا جوان و بە لەنجە و لارم نەدیبوو. گەلێك زەختم لە خۆم کرد، بەڵکو ئاسایی خۆم بنوێنم، بەڵام بە کردەوە ئاسان نەبوو. فرمێسك دوو جاران لەو وەپاش و پێش کەوتنانەدا لای دەکردەوە و چاوێکی پێدادەخشاندم، کە وەك تیشکی لێزر، کاری تێ دەکردم. دوو جاران هاتمە سەر ئەو باوەڕە پرسیارێکی ئاڕاستە بکەم، بەڵام زۆر زوو پاشگەز دەبوومەوە. ئەو پاشگەز بوونەوە چەندین هۆیان هەبوو، بێجگە لەو هۆیانەی کە تەواوی بیرمی بە خۆیەوە خەریك کردبوو، بەڵێنم بە کەژاڵ دابوو کە لە بیری ناکەم. بە گەیشتنەوەمان بە ماڵ، دەبینین کە کەژاڵ و

چنار لەگەڵ شێرکۆدا، هەرکامە و چەپکێکیان لە گێڕێك دەبڕی. هەواڵپرسی و گلەیی کردن دەستی پێکرد و هەرکەسە و بە جۆرێك گلەیی خۆیانیان ئاراستەی یەکتر دەکرد و پاکانەشیان بۆ هەبوو. زۆری پێ نەچوو کە کەژاڵ بە ئیشارەی برۆی منی بانگ کردە لای خۆی. پێم وابوو کە دەیەوێ لەسەر فرمێسك بدوێ، بەڵام لە هەڵەدا بووم. ئەو پێی گوتم:

ـ شاسوارم لە ماڵی مامۆستا جوامێر دیوە و زۆر تورە هاتۆتە بەر چاوم.

ـ ڕەنگبێ مامۆستا لەسەر داوای خۆمان بانگی کردبێ. هەر هیچ نەبێ بۆ بەیانی هەواڵێکمان دەستگیر دەبێ کە شاسوار بەڵێنێکی بە مامۆستا داوە یان نا.

من سفرەکەم ڕاخست و کەوچك و چەتاڵ و قاپ و دەوریەکانم دانا. هەستم پێکرد کە فرمێسك بە جۆرێك ئەو بانگهێشتنەی منی لە لایان کەژاڵەوە، پێ نامۆ بوو. نانمان خوارد و پاشان وەك جاری جاران بنەمای ئاخافتنمان دەست پێکردەوە. ئێمە زیاتر لە کاتژمێرێك لەسەر چەندین لایەن، بەتایبەت گرفتەکانی سەر ڕێگای ژیانی سەردەم دوواین، بەڵام فرمێسك بێجگە لە گوێگرتن و جاروباریش بەڵێ گوتن، تەنیا وشەیەك لە زاری نەهاتە دەر. ئێمە تا ڕادەیەك هاوتەمەن بووین و لە دونیای خۆماندا دەسوڕاینەوە، بەڵام دڵی خافڵ، دایکم و دادە خاسپەریمان بە تەواوی لە بیر کردبوون. من لە هەمووان زیاتر دەدوام و حاڵ و گوزەرانی مام نەسۆر و خاڵە شامارم، وەك نموونەی نەهامەتی و چارەڕەشی بۆ هێنانەوە. هێشتا

وتەکانم تەواو نەببوون، کە لەپڕێکدا لێدوانەکەم لەلایەن فرمێسکەوە لێ بڕدرا. ئەو کە تورە و زویر دەهاتە بەرچاو، پێی گوتم:

ـ شوان! ئیتر بەسیەتی. نامەوێ گوێ لەجۆرە لێدوانانە بگرم، چونکە پێشتریش چەند جارێکم بیستبوو کە گۆیا ئەتۆ تەواوی کاتی خۆتت تەرخان کردووە بۆ داکۆکی و پاڵپشتیکردن لە مافی ئافرەتان، بەڵام ئێستا دەزانم کە ڕاستیان گوتووە کە دەڵێن: دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە، ئەگەر ئەتۆ لەگەڵ ئەوانی دیکەی وەك خۆت دەتانەوێ داکۆکی لە مافی ئێمەمانان بکەن، باشتر وابوو کە وێنەیەکیشت لە ئافرەتان هێناباوە و لانیکەم لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بوایەن. داکۆکیکردن لە مافی ئافرەتان نابێ تەنیا لە چوارچێوەی ئاخافتن و دروشمدان دا بمێنێتەوە و دەبێ بە کردەوەش بسەلمێندرێ.

هاوکات لەگەڵ ڕادەربڕینی فرمێسك دا و سەرەڕای ئەوەی کە گوێم لە ئاخافتنەکانی دەگرت، لە سەرسوڕمانێکی سەیریشدا پەنگم خواردبۆوە. لە دڵی خۆمدا گوتم کاکە شوان با بزانی کە ماڵ لەو هەوارگە نەماوە. بەو ئاخافتنەی فرمێسك گەز گەز باڵام دەکرد، هەرچەند ڕووی ڕەخنەکانی بەر لە هەموو کەسێك لە من بوو کە باسی مام نەسۆر و خاڵە شامارم کرد کە هەردووکیان لە ڕەگەزی نێر بوون. ئەوجار گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە باوکی شاسواریش لە گۆڕ بێتەوە، ناتوانێ فرمێسك بە چۆکدا بێنێ و بەبێ خواستی خۆی بڕیاری دواڕۆژی بۆ بدا. من بێدەنگەم کرد، چونکە ڕەخنەکانی بەجێ بوون. بە کورتی تف لە زارمدا وشك ببوو، کەژاڵ و چناریش دەستەوەستان مابوون. دایکم و دادە خاسپەری نەیاندەویست خۆ

هەڵقورتێننە نێو باسەکانی ئێمەوە. شێرکۆ کە خەریکی گوێز خواردن بوو، پاش خواردنی کاکڵە گوێزێك کە بە دەستیەوە بوو، ڕووی لە فرمێسك کرد و پێی گوت:

ـ فرمێسك! حەیفت کرد بەو شێوەیە هێرشت کردە سەر شوان، چونکە پێموابێ بە هەڵە لە شوان تێگەیشتووی. ئەوە دەمێکە شوان دەستی لە دروشمدان بەم و بەو دا هەڵگرتووە. خۆ لە خۆڕایی نەگوتراوە کە مرۆڤ دەبێ بگاتە بگار، ئەوجار قاچی هەڵگا.

فرمێسك لێی هاتە جواب و گوتی:

ـ من ڕەخنەم لە شوان گرتووە. ئەو پێویستی بە پاڵپشتیکردن نییە و بۆ خۆی زمانی هەیە و دەتوانێ وەڵام بداتەوە، پاش ئەوەش ئێمە دەبێ فێری ڕەخنەگرتن و ڕەخنە قبووڵ کردن بین. دڵفراوانی و لەخۆبووردوویی، ئێمە بەرەو لوتکەی ڕێزگرتن لە بیروڕای جیاواز دەبا، بەڵام تا کەنگێ دەبێ پیاوان خاوەنی هەموو چەشنە بڕیارێك بن. جا چ ئەو بڕیارە بە قازانجی تاك و کۆمەڵ بێ، یان بە پێچەوانە. من وەك کچێك لە خۆمەوە دەستم پێکردووە و باکیشم لەوە نییە کێ چیم پێدەڵێ. کۆمەڵی ئێمە بە درێژایی مێژوو پڕ بووە لە شاسوار و شاسوارەکان، بەڵام ئەم شاسوارانە دەبێ لەسواریکردن دابەزێنرێن و گوێڕایەڵی خواستی نیوەی کۆمەڵ بن.

چنار بۆ پاڵپشتی لە بۆچوونەکانی فرمێسك بەمجۆرە ڕای خۆی دەربڕی:

ـ کۆمەڵی ئێمە هەراسانە بە دەست کولتور و کەلەپوری بێگانەوە. بۆ ئەوەی لەژێر تەوژمی ئەم بارە قورسە بێینە دەرێ، پێویستە کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان ببنە سووتەمەنی ئەم ئەرکە. بێگومان ئەم سووتەمەنیەش

دەبێ ئێمە بین و نابێ دەستەوئەژنۆ دانیشین و چاوەڕوان بین تاکو شاسوارەکان ئەم ئەرکەمان بۆ بەجێ بگەیەنن.

وادیار بوو گۆڕەپان بە تەواوی بە دەست فرمێسکەوە بوو، چونکە چناریش بە پشتیوانی لە ڕادەربڕینەکەی ئەو هاتبووە جواب. من بۆ خۆم مەلاقم وشك ببوو و هەر زمانم بە دەوری کەلاوە و زارمدا دەسوڕاند. چاوەڕوان بووم کە کەژاڵ شتێك بڵێ، بەلام یان نەیدەویست یان هیچی بۆ گوتن پێ نەبوو.

دایکم لە بیری چووبوو دەرمانەکەی لەگەڵ خۆی بێنێ. داوای لێبوردنی لە فرمێسك کرد کە لێدوانەکەمان دەپسێنێ. ڕووی لە لای من کرد و گوتی:

ـ شوانە، دەتوانی بڕۆی دەرمانەکانم بۆ بێنی؟

بەر لەوی من وەلامی بدەمەوە، کەژاڵ گوتی من دەچم دەیانهێنم.

دایکم شاوێری بۆ کەژاڵ کرد کە دەرمانەکانی لە کوێ داناون، پاشان ڕووی لە فرمێسك کرد و لێی پرسی:

ـ کچە شیرینەکەم! من هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا گوێم شل کردووە بۆ ئاخافتنەکانتان. وەك خۆم شانازیت پێوە دەکەم بۆ ئەو هەڵوێستە جوامێرانەت و هیوادارم وێنەی وەك تۆمان زۆربێ، بەلام پێمخۆشە پرسیارێکت ئاراستە بکەم.!

- ڕۆڵە گیان، کچی خۆم! چ پلان و گەلالەیەکت بۆ بەدیهاتنی ئەم ئامانجە پیرۆزانە هەیە؟ بە واتایەکی دیکە، چۆن دەتوانین ئالوگۆڕێکی

بنەڕەتی لە کۆمەڵدا پێکبێنین تاکو بتوانین بگەینە ڕزگاریی نەتەوەیی و یەکسانی و مافی وەك یەك؟

وام هەستپێکرد کە فرمێسك بەرەو ڕووی پرسیارێکی دژوار بۆتەوە و لەوانەیە وەڵامێکی گونجاو کە بتوانێ گشت لایەنەکانی کێشەی کۆمەڵگای ئێمە لە باری نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، ڕامیاریی، کولتوری و ئابوورییەوە بگرێتەوە، پێ نەبێ.

فرمێسك لە وەڵامدا گوتی:

ـ گەلێك ئاساییە کە ئێمە لاوان و گەنجان باری ڕۆشنبیریی خۆمان بەهێز بکەین. بیروباوەڕی پێشکەوتووخوازانە ڕەچاو بکەین. چارەنووسی خۆمان نەدەینە دەست ئەوانەی کە ئەم ڕۆژە تاڵ و پڕ لە مەینەتەیان بۆ بە دەستکەوت هێناوین. ئەوەش دەزانم کە بە گوڵێك بەهار نایە، بەڵام ئەگەر ئێمە هەموومان پێکەوە دەست بدەینە دەستی یەکتر، دەتوانین لە چلەی زستانیش دا بەهارێکی پڕ لە گوڵ دروست بکەین.! خۆ ئەو خەڵکە پێشکەوتووانەی سەرگۆی زەویی، پێشکەوتنیان لە زگی دایکیان لەگەڵ خۆ نەهێناوە.

دایکم سوپاسی فرمێسکی کرد و پێی گوت:

ـ لەوەی کە دەبێ گۆڕانکاری بکرێ پاسا و هەڵناگرێ، بەڵام وا تێدەگەم کە وەڵامێکی ئەوتۆ و بەرفراوانم وەرنەگرتەوە تا پێی ڕازیبم.

منیش بە دوو هۆ بە دەرفەتم زانی کە لەم پێوەندییەدا ڕوونکردنەوەیەك بدەم. یەکەم، لەبەر ئەوەی کە فرمێسك وا هەست نەکا کە لە لێدوان و وەڵامەکەیدا لاواز بووە. دووەم، دایکیشم پێی وانەبێ کە

فرمێسك به دەمارگرژی و دژایەتی لەگەڵ ڕەگەزی نێرینه دا ویستویەتی بەگژ كێشه كۆمەڵایەتییەكاندا بچێتەوە.

بۆ ئەو مەبەستانه گوتم:

ـ دیاره ئەوانەی كه فرمێسك باسی كردن، گەلاڵەی خۆی بۆیان هەیه كه لەوانەیه له كاتی وەڵامدانەوەكاندا وەبیری نەهاتبێتەوە. ئەوەندەی من تێگەیشتبم مەبەستی فرمێسك ئەوە بوو كه سەرەتای هەر كێشەیەك، چ كۆمەڵایەتی بێ یان هەر كێشەیەكی دیكه، بنەمایەكی هەیه كه بەداخەوە بەشی هەره زۆریان هۆی ئابووری و ڕامیارییان هەیه. مەبەستی سەرەكی فرمێسك ئەوەیه كه دەبێ سیستمی دەسەڵاتداریی له بنچینەدا بگۆڕدرێ، ئابووری وڵات به شێوەیەكی دادپەروەرانه بەسەر هاوڵاتیان دابەش بكرێت و یاسا دەبێ سەروەر بێ و هەمووان لەبەرانبەر یاسادا ملكەچ بن. یەكسانی لەنێوان ڕەگەزی نێر و مێدا، چ له بواری خێزانداری و سامان و ماڵدا و چ له هەڵبژاردن و هەڵبژێردراندا و هەم له كار و موچەدا، دەبێ له یاسای گشتی وڵاتدا، دەستەبەر بكرێ.

لەو كاته دا كه له پێوەندی لەگەڵ پرسیارەكەی دایكم كه ئاراستەی فرمێسكی كردبوو دەدواین، كەژاڵ دەرمانەكانی دایكمی هێنا و لەگەڵ لیوانێك ئاو دانی به دەستییەوە، بەڵام كەس نەپەڕیە نێو لێدوانەكانم تاكو دواین وتەكانم پێشكەش كردن. فرمێسك كه له ڕاده بەدەر خۆشحاڵ دەهاته بەرچاو، به گەرمی سوپاسی كردم و گوتی:

ـ ئەوەی شوان باسی كردن ڕاست بیروباوەڕی منن، بەڵام بەشێكی گرینگیم له بیرچوو كه باسیان بكەم. دیاره ئەگەر هەموو ئەوانەش كه

شوانە لە سەریان ئاخافت جێبەجێ بکرێن، بەڵام کێشەی نەتەوەیی چارەسەر نەکرێ، هەوڵەکانمان هەروەك ڕابردوو بە نەزۆکی دەمێننەوە. چی دەتوانێ لەوە داخهێنەرتر بێ کە ئێمەی کورد ڕادەی زانیاریەکانمان لەسەر نەتەوەی خۆمان ناگاتە یەك لە سەدی ئەو زانیاریانەی کە لەسەر داب و نەریتە کۆنەکانی نەتەوەی داگیرکەر هەمانە.

من کەیفم بەو ڕادەربڕینەی فرمێسك هات، بێجگە لەوەش دەمەوێست بەر لەوەی فرمێسك ئەو خاڵانە باس بکا، ئەو بابەتە نەتەوەییە بێنمە گۆڕێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نەمدەزانی فرمێسك هەڵگری چ بیروباوەڕێکە، خۆم لەو خاڵە گێل کرد، چونکە بە کردەوە بۆم دەرکەوتبوو کە هیچکام لەو ڕێکخراوانە کە خۆیان بە گشتی (سەرانسەری) چەپ و نوێنەری خەڵکیش دەزانیی، ئامادە نەبوون دان بە مافەکانی کورداندا بنێن. لەوەش خراپتر ئەوە بوو کە تاوانی داردەست بوونی بێگانە و سیخوری کردنیشیان دەخستە ئەستۆمان!

فرمێسك لە کۆتایی دا گوتی:

- ژیانی ئێمە بۆ خۆی لە بنەڕەتدا تاڵە، بەڵام نابێ دەرفەتی زیندووبوونەوە بەو نەریتە کۆنانە بدەین کە کۆمەڵگاکەمانی تاساندووە داهاتووشمان لێ تاڵتر بکا.

پاش قسەکانی فرمێسك، ناڕاستەوخۆ تێمگەیاند کە لێی حاڵی بووم.

با ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگریش بۆ یەکەمین جار بدرکێنم و بڵێم کە ڕوحم چووبووە سەر فرمێسك و بە تێپەڕبوونی کاتەکان، هەستی خۆشەویستی فرمێسك باڵی بەسەر شێوەی بیرکردنەوەم دا دەکێشا، بێجگە

لەوەش گوشارەکانی شاسوار بۆ بە سەر فرمێسك بۆ بە مێرد دانی زۆرەملی، هۆکارێکی دیکە بوو کە نەدەکرا بایەخی پێ نەدرێ. بێگومان لەوە دڵنیابووم کە ئەم خۆشەویستییە کە لە دڵ و دەروونمدا سەبارەت بە فرمێسك هەوێنی گرتبوو، تا ڕادەیەکیش پێوەندی بە جوانی و لار و لەنجەی ئەوەوە هەبوو. دیارە تەنیا ئەویندارییم مەبەست نەبوو، بەڵام بەبێ ئەوینیش ژیان مانا نابەخشێ. جا ئەو ئەوینە بە مرۆڤ بێ، یان گەل و وڵات و ژینگە، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ. هەڵبەت هەم چنار و هەم کەژاڵیش هیچیان لە فرمێسك کەمتر نەبوو، بەڵام بیرم لە گەلێك لایەنی دیکەش دەکردەوە. یەك لەوانە پێم وابوو کە ئەگەر فرمێسك بێت و نابەدڵی شاسوار بکا، ئەو کات چ ڕوو دەدا؟ خۆ ئەوە هات و فرمێسك سەری خۆی هەڵگرت و دەرەی گرتبا بەر و دەیان ئەگەری دیکە. لە کۆتاییدا هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە هەموو ئەو ئەگەرانە ئیمکانیان هەیە، بێجگە لە یەکێکیان، کە خۆکوشتن یان گیان لە خۆئەستاندن بێ. بەڵگەشم بۆ ئەوە ژیری ئەو بوو سەبارەت بە بیر کردنەوەی لە ئاستێکی بەرزی کۆمەلایەتیدا، کە لە ڕادەربرینەکانی فرمێسك دا خۆی دەردەخست، بێجگە لەوەش ئەو لەمێژ بوو کە خۆی بۆ ململانێ لەگەڵ نایەکسانی، دیاردە و نەریتە کۆن و دواکەوتووەکانی کۆمەلایەتی تەیار کردبوو. کەوابێ خۆکوشتن لای ئەو بێجگە لە نەنگیی، نەزانیی، بەزیویی، باوەڕ بە خۆ نەبوون ، هیچی دیکە نەبوو.

شەوگارمان شەق کردبوو و لەسەر زۆر بابەت بە تێر و تەسەلی دوابووین، بە بێنەوەی گەلاڵەیەکمان لەبەر دەستدا بووبێ. لە نەکاو و بەبێ

ئەوەی کەسمان بیرمان لێکردبێتەوە، کەوتینە سەر بابەتێکدا کە چ پێوەندیەکی بە باسەکەمانەوە نەبوو. ئەویش ئەوە بوو کە لە پڕا فرمێسك گوتی:

ـ لام سەیرە کە شوان و کەژاڵ دانیشتووی ڕۆژهەڵاتی گوندن. من و شێرکۆ هی باکوور و چناریش لە باشوور، بەڵام کەسی خۆرئاوای گوندمان لەگەڵ نییە.

لە چرکەیەکدا بە خۆمدا هاتمەوە و لە خۆمم پرسی، تۆ بڵێی خۆر لای ئێمە قەت ئاوا نەبێ؟ هەڵبەت مام نەسۆر بۆی گێڕابووینەوە کە لە وڵاتی ئێمە خۆرئاواییەکان ناسنامەیان پێنادرێ، بەڵام نەمدەزانی باکووری وڵاتی کوردان، باشووری خۆرهەڵاتی وڵاتێکی دیکەیە. لەوەش بە ئاگا نەبووم کە باشووریشمان باکوری وڵاتێکی دیکەیە. تازە خەریك بوو تێبگەم کە ڕۆژهەڵاتیشمان خۆرئاوای وڵاتێکی دیکەیە. هەر چی تێکۆشام بیرەکانم کۆکەمەوە و وەسەریەکیان خەمەوە بۆ پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو نەهامەتیە، بەڵام زۆر لەوە ماندووتر بووم کە بتوانم بە ئاکامێك بگەم.

چنار سوپاسی ماڵی دادە خاسپەری و کەژاڵی کرد و گوتی:

ـ کاتی نووستن هاتووە و من دەبێ بچمەوە و درێژەی باسەکانمان هەڵدەگرین بۆ جارێکی دیکە.

فرمێسك لە بارودۆخێکی گەلێك نالەباردا بوو، چونکە لەوانە بوو شاسوار لەپڕ هاتبا و گرفتێکی بۆ دروست کردبایە. لە کۆتاییدا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتین کە من و شێرکۆ لەپێش دا تاکو لای ماڵی خۆیان چنار بەڕێ بکەین. بە هاتنەوەمان دایکم و شێرکۆ بچنەوە بۆ ماڵی خۆمان. من

و داده خاسپەریش پێکەوە فرمێسك ببەینەوە بۆ ماڵی خۆیان. لەگەڵ شێرکۆدا هاوڕێیەتی چنارمان کرد تاکو دەرکی ماڵی خۆیان، وادەهاتە بەرچاوم کە شێرکۆ دەیەویست لەگەڵ چنار بە تایبەتی بدوێ، بەڵام هەستم دەکرد لە لایەکەوە لە من شەرمی دەکرد و لە لایەکی دیکەشەوە هێشتا زوو بوو.

ئێمە گەڕاینەوە دواوە و لە ڕێگادا شێرکۆ لێی پرسیم:

ـ شوانە! مامۆستا جوامێر چۆن ڕێگای داوە کە چنار بە تەنێ بێتە شەونشینی، وەك ئەوەیە بەرد لە ئاسمان هاتبێتە خوارێ، وانییە؟

ـ شێرکۆ گیان! بەرد لە ئاسمان دێتە خوار و زۆریش سروشتییە، بەڵام مامۆستا مرۆڤێکی گەلێك پێشکەوتووخواز و زانایە. ئەوەی من لەم ماوەیەدا پێوەندی نیزیکم لەگەڵ خۆی و بنەماڵەیان دا هەبووە، بۆم دەرکەوتووە کە ئەو مرۆڤێکی نەتەوەییە و لەو هاوڕێیە خوێندەوارەکانی خۆشمان تێگەیشتووترە.

شێرکۆ ئافەرینێکی بۆ نارد و هیوای خواست تەمەن درێژ بێ.

بە گەڕانەوەی ئێمە، شێرکۆ لەگەڵ دایکم چوونەوە بۆ ماڵی خۆمان و من و داده خاسپەریش لەگەڵ فرمێسك کەوتین. هێشتا لە حەوشەکە وەدەر نەکەوتبووین کە فرمێسك گوتی:

ـ ئێوە بیرتان لەوە کردۆتەوە کە بەو درەنگانەی شەو و بە گەیشتنم بە ماڵ، شاسوار فەرتەنەیەك دروست ناکا و بەم شەوە بە خۆڵ و دۆ وەسەر کراوی، بە نێو گوند دا نامگێڕێ؟ هەڵبەت ئەوەش دەزانم کە ئەو دەتوانێ

ئەم فەرتەنەیە لێرەش دروست بکا، بەڵام هیچ نەبێ لێرە سوچێکم دەست دەکەوێ پەنای بۆ بەرم.

بە بیستنی ئەو وشانە کە لە زاری فرمێسك هاتنە دەر، هەستم کرد کە لە هەورازێکی هەزار گەزی بەر بوومەوە. ئەو ترسەی کە لەشی فرمێسکی داگرتبوو، لاشەی منیشی تەنییەوە، بەڵام بەرلەوەی من بمەوێ شتێك بڵێم، دادە خاسپەری گوتی:

- ڕۆڵە گیان! کەژاڵ و کاروانم بمرن، ئەگەر جیاوازیتان لەنێوان دانێم، بەڵام ئەگەر من خوو وخەدەی شاسوار بزانم، ئەو لە هەر کوێ پێی‌خۆشبێ و لە هەر جێگایەك بیەوێ، کاری خۆی هەر دەکا. ئەی چیت لێ بکەم ڕۆڵە گیان! خۆ بیری کورتی من لەوە زیاتر ناگاتە جێگایەك کە چارە ساز بێت و دەسەڵاتی شاسواریشم نییە تاکو لغاوی بکەم. بریا لەگەڵ چناردا چووبای بۆ ماڵی مامۆستا جوامێر، چونکە لەوانە بوو شاسوار هێندێك لاقان لەبەر جوامێر هەڵکێشێ.

دادە خاسپەری هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی:

- کوێرایی چاوەکانمە بۆ کۆچی نابەوەختی کاکە شابازم. ئەگەر ئەو لە کۆڵکێشی دا نەکوژرابا، گۆڕەپان بۆ ڕمبازێنی کاکە شاسوارم وا ئاواڵە نەدەبوو.

ئێمە هەرسێکمان لەسەر جێگای خۆمان سارد بووینەوە و لاقمان ببوو بە هەپك. نە بەرمان پێ دەکرا و نە دوا. من لەوە تێگەیشتم کە ئەو ڕادەربڕینەی دادە خاسپەری جواب کردنێکی ناڕاستەوخۆی فرمێسك بوو. بەو حاڵەش نەمدەویست دەستپێشخەری بکەم و لە فرمێسك بگێڕمەوە

تاکو له ماڵی ئێمه بمێنێتەوه. هەرچی دەهات ڕادەی نیگەرانیی و دڵەخورپەم سەبارەت بە گرفتەکانی سەر ڕێگای ژیانی فرمێسك ڕووی له زێده بوون دەکرد. لەبەر ئەوەی نەبمە بەشێك له گرفتەکه، گوتم:

ـ بەباشی دەزانم که فرمێسك بۆ خۆی بڕیاری چوونەوه یان مانەوەی لێره بدا، بەڵام له هەمانکاتیشدا ئەگەر بڕیاری مانەوه لای ئێمه بدەی، نەك هەر بە تەنێت ناهێڵین، بەڵکو ئەوەی له دەستمان بێ له بۆ یارمەتی کردنت درێغی ناکەین.

داده خاسپەریش گورج هەلەکەی قۆستەوه و گوتی:

ـ ئەمن بەرگەی هەوێڵ و چەقەی شاسوار ناگرم. مادام شێرکۆ لێره له ماڵی وەنەوشه، ئەتۆش دەتوانی لەگەڵ شوان بچیتەوه بۆ ئەوێ و لەوێ بمێنیتەوه.

فرمێسك که له چەند لاوه گوشاری لەسەر بوو، بە جۆرێك که دڵی هەر دڵدارێکی بۆ دەبووه بریان، گوتی:

ـ منیش لای داده وەنەوش دەمێنمەوه و ئەمەش بڕیارێکه که بۆ خۆم دەیدەم.

ئێمه ماڵئاواییمان له داده خاسپەری کرد و گەڕاینەوه بەره و ماڵی خۆمان. که هاتینه ژوورەوه دایکم نوستبوو، بەڵام شێرکۆ کتێبێکی هێنابوو و دەسپێکی کتێبەکەی دەخوێندەوه. سەرەتا پێی وابوو که تەنیا منم، بەڵام که چاوی بە فرمێسك کەوت، خەریك بوو تێك بچێ. پرسی:

ـ شاسوار نەیهێشت بچیته ماڵەوه؟

ـ نا، هەر نەموێراوە بچمەوە ماڵ و بەباشم زانیوە لای ئێوە بێنمەوە تاکو بەیانی.

دەستبەجێ جێگام لای خۆمان بۆ ڕاخست، چونکە دەمزانیی لەبەر پرخەی دایکم خەوی لێناکەوێ.

بە دەیان پرسیاری بێ وڵامەوە چوومە نێو جێ، بەڵام ئەوەی خەو بێ نەچووە چاوانم. فرمێسکیش هەروەك من گلو پلی بور و نەیدەتوانی بنوێ. ئەو شەوەم بە ساڵێك لێ تێپەڕ بوو. لەگەڵ سپێدەی بەیانی کە هێشتا کەس لە خەو هەڵنەستابوو، تەقەی دەرگای حەوشەکەمان هات. بە جارێ کۆمەڵێك پرسیار ڕووی تێکردم. نەمدەزانی بیر لە کامەیان بکەمەوە. جارێکی دیکە درا لە دەرگا و ئیتر دەرفەتی بیرکردنەوەم بۆ ناما. لەسەر ئەوە ساغ بوومەوە کە شاسوارە و بە دوای فرمێسکدا چووەتە دەرکی ماڵی دادە خاسپەری و ئەویش پێی گوتوە لە ماڵی ئێمەیە. هەر بەو بۆنەوە دەرگای ماڵی لێگرتووین و دەبێ خۆمان بۆ فەرتەنەیەك ئامادە بکەین. لە سەرەخۆ شێرکۆم لە خەو هەستاند و پێمگوت:

ـ نەفەرێك لە دەرگای حەوشەکەمان دەدا و لەوانەیە شاسوار بێ. وشیار بە تاکو بزانم سەرمان لە کوێوە دەردەچێ.

گورج خۆمم کۆ کردەوە و قەنناسەکەم هەڵگرت و چوومە دەرگای حەوشە. کە دەرگام لێکردەوە، دەبینم مامۆستا جوامێرە و ئەویش وەك من تا ڕادەیەك شپرزەیە.

ـ خێرە مامۆستا، بەم شاخی شەوەقە؟

ـ نیگەران مەبە کوڕم. ژیان بۆ خۆی کورتە، بەڵام ژیانی ئێمە لەوەش کە هەیە، کورتترە. بابی بابم! چەند ڕۆژێك بوو کە هەواڵێك لە شامار نەبوو، بەڵام کاتژمێرێك پێش ئێستا ئاگاداریان کردمەوە کە عومری درێژی بۆ ئێوە بە جێهێشتووە. ئەوەتا هەشت نۆ کەسم ئامادە کردوون و ئەتۆش لەگەڵیان بکەوە بۆ گۆڕستان و سەرپەرشتییان بکە با گۆڕێکی بۆ هەڵکەنن.

بە بیستنی هەواڵی مەرگی خاڵە شامار، بێجگە لەوەی کە لە قووڵایی دڵمەوە ناڕەحەت بووم، گوتم:

ـ مام شاماری بێکەس و بێدەر! پلانەکەی منیشت لەگەڵ خۆت بردە گۆڕ. ئاخر بەتەما بووم کە بەڵکو دەستی دایکم و خاڵە شامار بگەیەنمە یەك و بۆ ماوەیەکی کورتیش بووە، لەو تەنیاییە ڕزگاریان بێ.

سوپاسی مامۆستام کرد و گوتم:

ـ هەر ئێستا وەرێ دەکەوم.

مامۆستا گەڕایەوە و منیش شێرکۆ و فرمێسکم لە کۆچی دوایی خاڵە شامار ئاگادار کرد، بەڵام لە بیرم چووبوو کە هۆی مردنی خاڵە شاماری لێ بپرسم.

دەستبەجێ دایکم لە خەو کرد و خەبەری ماڵئاوایی یەکجاریی خاڵە شامارم پێدا. ئەو لەپێشدا حەپەسا و پاشان پرسی:

ـ چۆنت زانی؟

ـ هەر ئێستا مامۆستا جوامێر هەواڵەکەی پێ داین و من دەبێ بچمە گۆڕهەڵکەندن.

تاکو من خۆم ساز کرد، شێرکۆ و فرمێسکیش هەستان و خۆیان کۆکردەوە. پێم گوتن:

ـ ئێوە پێویست ناکا هەستن. دەتوانن لە سەرەخۆ قاوەڵتی بکەن و پاشان لەگەڵ مەیتەکە بێن بۆ بە خاکسپاردنی.

خاڵە شامار بێکەس و بێدەربوو. نەکەسی هەبوو کە سەرەخۆشی لێ بکەین. نە ماڵ و موڵکیشی هەبوو کە بەسەر کەس دابەش بکرێ. ئەو لە تەواوی ژیانی دا، پێمەڕەی تاوداشتنەکەی هەبوو، کە ئەویش کەس خوازیاری نەبوو.

خەریك بوو لە ماڵ وەدەر بکەوم، کە فرمێسك گوتی:

ـ ڕاوەستە شوان، منیش دێم.

ـ بۆ کوێ، لای خۆمان نەریت وایە کە ئافرەتان لە کاتی گۆڕهەڵکەندن و بە خاکسپاردنی مردووەکاندا ناچنە سەرقەبران. ئەرکی ئافرەتان لەم ڕێورەسمانەدا تاکو ئێستا ئەوە بووە کە هەڵوا دروست بکەن بۆ خێراتی سەر قەبران و پاشانیش شیوەن بکەن و سەروڕووی خۆیان داڕنن. ئەگەر گەنجێك بمرێ یان بکوژرێ، پێدا بچڕن و بەو بۆنەوە داخ و دەردە دڵی خۆیان دەربڕن و هونەری شاراوەی لە گەروو دا خنکاویان نیشان بدەن.

ـ لێت تێگەیشتم شوان، بەڵام دەکرێ گۆڕانکاریی لێرەوە دەست پێبکا.

ـ هیوادارم لێم زویر نەبی فرمێسك، چونکە من لێرە پیاوان و ئافرەتانم لێك جوێکردۆتەوە، بێجگە لەوەش پێم باشە ئەوەشت پێبڵێم کە لەم کۆمەڵە زۆرەملییە دا، گۆرانیی گوتن و هونەرمەند بوونی پیاوانیش لۆمە

دەكرێ و بەوانیش دەگوترێ، لۆتی و چاوەش ودەیان نێو و ناتۆرەی دیكەیان پێوە دەلكێندرێ!

من و فرمێسك و شێركۆ وەڕێ كەوتین بۆ گۆڕستان. بە گەیشتنی ئێمە كۆمەڵێك خەڵكی دیكە هاتن. جێگایەكمان هەڵبژارد و دەستبەكار بووین. سێ شەشی بەهارێ بوو زەویی هەناسەیەكی گەرمی هەڵكێشابوو، هەربۆیە زۆری پێنەچوو قەبرەكەمان ئامادە كرد.

تاكو ئێمە وچانێكمان دەركرد، تەرمەكەیان هێنا. لام گەلێك سەیر بوو چونكە پازدە تا بیست كەسێك زیاتر نەبوون كە لەگەڵ تەرمەكەدا هاتبوون. ئێمە كە زۆربەمان گەنج بووین و كەم ئەزموون، بەتایبەتی لە بە خاكسپاردنی مردوودا، بۆمان گرینگ نەبوو چۆنی بە خاك دەسپێرین. بەبێ گۆڕیچە و بەبێ ئەحەد تەرمەكەمان لەنێو گۆڕەكە نا و لە ماوەی كەمتر لە چارەكێك دا، دامان پۆشی. كاتێك هەموو كارەكان تەواو بوون، یەكێك لەو كەسانەی كە لەگەڵمان بوو، هاتە لای من و پێی گوتم:

ـ شوانە! دەزانی ڕووی مەیتەكە لە قوڵە دا نییە و بە پێچەوانەوە ناشتوومانە؟

منیش گەلێك لە سەرەخۆ پێم گوت:

ـ برام چیت داوە لە قوڵە. قوڵە هی ئەو كەسانەیە كە بە گەلاڵەی داڕێژراو بۆ پاساوی دواڕۆژیی كردەوە ناحەز و خراپەكانی داگیركاری و زەبروزەنگ لەم ناوچانەدا دروست كراوە.

دیسان خۆم پێ ڕانەگیراو پێم گوت:

ـ قەتت لە خۆت پرسیوە ئەم هەموو ئیمام و ئەسحابە کێن لەم دەڤەرە کە ئێمە دەچین و کڕنوشیان بۆ دەبەین؟ ئەوەت زانیوە کە هەر ئەمانەی کە ئێمە سوێندیان پێدەخۆین، لەسەر داگیرکاری بە دەستی باوك و باپیری ئێمە کوژراون؟ قۆڵە و ئەم هەموو گومبەز و بارەگا و تەکیە ڕەنگینانە، بەرهەم و کاڵای داگیرکارییە، کە بە باڵای ئێمەدا بڕاوە.

وادیار بوو کە فرمێسك گوێی لە ڕا دەربڕینەکەی من بوو. هەربۆیە هاتە پێش و پرسی:

ـ شوانە! بۆ دەبێ لە کاتی مردنیش ڕوو لە قوبلە بنێژرێن؟

ـ ئەو پرسیارە گەلێك لێکدانەوەی دوور و درێژی دەوێ فرمێسك، بەڵام چونکە پرسیارەکەت ئاڕاستەی من کردووە، بە پێویستی دەزانم وەڵامێکی کورتت پێ بدەمەوە. بێ ئەوەی بمەوێ هەبوونی نەتەوەیەکی دیکە ببەمە ژێری پرسیار، پێموایە کە نەتەوە هێرشکار و داگیرکەرەکان هەموو کاتێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، دەبا شتێکیان بۆ پاساوی کوشت و بڕەکان، تاڵان وداگیرکاریەکان، شوشتنەوە و لەنێوبردنی کولتور و کەلەپوری نەتەوەکانی دی هەبایە. هەتا دوێنێ ئەم داگیرکارییە بە دەستی ئایین و ئاییندارەکان دەکرا، چونکە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیی تازە کەوتبووە سەرپێ و پێویستی بە پێخۆر بوو. نەخوێندەوارییش یەکێك لە هۆکاری سەرەکی ئەم نەهامەتیە بووە. ئەو داگیرکاریە جێ پێی خۆی لە تان و پۆی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵی ئێمەدا کردۆتەوە و ڕیشەی داکوتاوە. با بە کورتی بیڵێم، کۆمەڵی ئێمە لاسای کولتوری بێگانە دەکاتەوە کە بەرهەمی داگیرکارییە و هیچی دیکە. ئەگینا بە ملیۆن مرۆڤ گیانیان لەدەست داوە

که لاشەکانیان بوونەتە پێخۆری مەل و مۆر و مەزاریشیان نییە تا ڕوویان لە قیبلە یان هەر جێگایەکی دیکە دا بێ. کەوابێ، قوبلە هی ئەو گەل و نەتەوەیە کە بە داگیرکاری گەیشتووەتە ئێرە، نەك هی ئێمە.

وادیار بوو فرمێسك بەو وەڵامە کورتە قەناعەتی هێنابێ و ئێمە بە تێکڕا بەرەو دێ وەڕێ کەوتین.

خاڵە شامار مردنەکەشی هەروەك ژیانە ناکامەکەی، جیاوازی هەبوو لەگەڵ زۆربەی مردووەکانی دیکەدا. نە شیوەن و نە باوکەڕۆ، نەخێر و خێرات، نە یەخەدادڕین و نە لابڕین و نە کەسوکارێکیش کە سەرەخۆشی لێبکرێ.

هەرکەسە و بەرومالّی خۆی ڕێگای گرتەبەر. ئێمەش بە ڕێگاوە بووین بۆ مالّی خۆمان، کە لە پڕ چنارمان پێ گەیشت. هەوالّپرسی لەگەڵ کردین و گوتی:

- بابم ناردوومی بە شوێنتانە.

سوپاسمان کرد و لەگەڵ چنار گەڕاینەوە بۆ مالّی خۆیان.

بە گەیشتنمان بەوێ، مامۆستا و دادە جەیران بەرەو پیرمان هاتن و ماندوو نەبوونیان لێ کردین. لەگەڵ دانیشتنمان، شێوەی بە خاکسپاردنی خاڵە شامار بوو بە دەستپێکی باسەکەمان. مامۆستا بەشیك لە ژیاننامەی خاڵە شاماری بۆ گێڕاینەوە، پاشان ئێمەش چۆنیەتی بە خاکسپاردنیمان بۆیان باس کرد و گوتمان کە گۆڕی خاڵە شامار ڕوو لە قوبلە هەڵنەکندراوە و هەر بۆیە ڕوو لە قوبلەش نەنێژراوە.

مامۆستا لە وەڵامدا گوتی:

ـ مرۆڤ کە مرد کەس هیچ باس و خواسێکی لێناکا و گرینگیش نییە ڕووی لە باکوور بێ یان باشوور، بێجگە لەوەش جێگایەك کە لە بەشی زۆری وەرزەکانی ساڵ دا گەرمای سەردەکەوێ بۆ پەنجا پلەی "سانتیگراد" و بە دایم تۆز و خۆڵ و گەردەلوولە و ئاوی خواردنەوەش بە ئاسانی دەست ناکەوێ، نە دەتوانێ و نە دەشکرێ قیبلەی ئێمە بێ، بەڵام لە هەمانکاتدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو جێگایە بە گەرما و تۆز و خۆڵەکەشیەوە، قیبلەیە بۆ ئەو نەتەوە و پێکهاتانە کە بەو بۆنەوە بوونەتە خاوەن یەکێك لە گەورەترین کولتورە ناسراوەکانی ئێستا و نابێ ئینکاری لەسەر بکەین، بەڵام ئێمە بەهەشتی خۆمان هەیە کە بە داخەوە بە هۆی داگیرکارییەوە، لێمان کراوە بە دۆزەخ. لە کۆتایی دا گوتی، ئێوە گەنجن و دەتوانن بە کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونەکانی جیلی ڕابردوو و لەبەر ڕووناکایی تیشکی زانست، داڕۆژێکی گەش بۆ خۆتان و جیلەکانی داهاتووش دابین بکەن. هەڵبەت دەبێ ئەوەشتان لە بیر بێ کە گەیشتن بەو ئامانجە، تێکۆشانی پێویستە و ئەو ئەرکانە نە بە لاساییکردنەوە دێنە دی و نە بە دروشم دانیش.

فرمێسك و شێرکۆ وا چووبوونە ناخی وتەکانی مامۆستاوە، کە چایەکانی بەردەمیان سارد ببوەوە و دادە جەیران بۆ دووەمین جار بۆی گۆڕیبوون، بە بێئەوەی لێویان پێوە نابێ.

پاشان مامۆستا چووە سەر دانیشتنەکەی خۆی لەگەڵ شاسوار و بەمجۆرە بۆمان دوا:

ـ شەوی ڕابردوو شاسوارم بانگ کردە ئێرە و ئاکامە خراپەکانی ئەو جۆرە داب و نەریتە کۆنانەم بۆ باس کرد. ئەوەشم پێگوت، کە منداڵەکان خوێندەوارن و مل نادەنە ئەو جۆرە داب و نەریتە کۆن و پڕ لە نایەکسانیی و دواکەوتووانە. بەتایبەتی ئەگەر بۆ خۆیان دڵیان پێوە نەبێ.

ـ ئەی وەڵام یان هەڵویستی شاسوار لەم پێوەندیەدا چۆن بوو؟ ئایا ئاسۆیەك دەبینرێ کە شاسوار لە هەڵویستەکانی پاشگەز بێتەوە؟

ـ نە بە داخەوە. ئەو دەیگوت کەژاڵ پێی خۆشبێ یا ناخۆش، هەر هی شێرکۆیە، نەغدی خۆم نادەم بە قەرز و کەژاڵ خوارزای خۆمە و پوورزای شێرکۆشە. پێشینیان گوتوویانە، چرایەك بە ماڵ ڕەوایە، بە مزگەوت حەرامە. سەبارەت بە فرمێسکیش، وابزانم حاجی هەمزە تەمایەکی زۆری وەبەر ناوە و شاسوار پێی گوتم کە لە ماوەی یەکساڵی ڕابردوودا، حاجی هەمزە بە سەد قات دەوڵەمەندتر بووە. دەسەڵاتی ئەوەندە جۆتە سەر، کە ئێستا بۆ خۆی ببڕ و بکوژە. کچەکەم دەبێتە خاوەن سەروەت و سامان و ژیانێك بۆ خۆی دەستەبەر دەکا کە دوور دەبێ لە هەرچەشنە نەداریی و چەرمەسەرییەك و ژیانی فرمێسك هەتا هەتایە دەستەبەر کراوە، هەر لەم پێوەندییەشدا بۆ خۆم دەبمە خاوەن سامان و هێشتاش هیچم بۆ حاجی هەمزە نەکردووە، سەد هەزار تمەنی وەك پێشەکی پێداوم بێجگە لەوانەش، ماشینێك و دووسەد هەزارتمەن، لەگەڵ دە تەخار زەویش لە جیاتی شیربایی بۆ بڕیوەتەوە. ئەم کارەش بە ئاگاداریی ئیمام جومعەی شار کراوە و دەستمان ماچ کردووە و بڕاوەتەوە. ئەو دەیگوت حاجی ناتوانێ بداتە ژێر قەولی خۆی و منیش شەرەف و ناموسی خۆم نانێمە گرێوی قسەی ئەم

و ئەو. هەڵبەت ئەوەشی گوت کە ئەو ماشێنەی داوای کردووە جیبی شابازە و بۆ شێرکۆیە، چونکە بۆ خۆی ناتوانێ لێیخوڕێ. لە کۆتاییشدا پێی گوتم، حاجی بەڵێنی داوە کە هەموو ساڵێك دە تەخارە زەوییەکەی بە تراکتۆری خۆی بۆ دەکێڵێ و بە کۆمپاینی خۆی بۆی دەدروێتەوە.

ڕۆڵە گیان!، ئەوەی بۆم گێڕانەوە، سەروبنی قسەکانی شاسوار بوون.

شێرکۆ کە لە داخان هەناسەی سوار ببوو، لە مامۆستای پرسی:

ـ واتە بابم لەسەر بڕیاری خۆی سوورە؟

ـ بەڵێ کوڕم، وایدەگوت و لاشم وایە کە شاسوار پاشگەز بوونەوەی بۆ نییە، بێجگە لەوانەش، وەك ئەرکێکی سەرشانم هەوڵم دا بەڵکو بە جۆرێك قەناعەتی پێبکەم کە ئەو جۆرە ئاکار داسەپاندنانە دەبنە هۆی لێکهەڵپچڕانی بنەماڵە و لە ڕادەیەکی گەورەتریشدا کۆمەڵ بەگشتی، بەڵام ئەوەی لای شاسوار بایەخی نەبێ، چۆنیەتی ژیان و دوارۆژی ئێوەیە.

فرمێسك و شێرکۆ سوپاسی مامۆستایان کرد بۆ ماندوو بوونی بەو گرفتەی ئەوانەوە.

ئێمە ڕاوێژی ئەوەمان دەکرد کە بەرەو لای ماڵ بچینەوە، کە دادە جەیران سوێندی لێ خواردین و گوتی:

ـ بە گیانی چنار و بەهارم، تاکو چێشتی نیوەڕۆمان لێ نەخۆن، پێتان لەم ماڵە وەدەر ناکەوێ.

ئێمە دانیشتین و نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. هەستم دەکرد شێرکۆ بە جۆرێك پێی خۆش نەبوو کە ماڵی مامۆستا بە جێ بێڵین. لام وایە چنار دڵی ڕفاندبوو، بەڵام هێشتا چنار وای نیشان نەدابوو کە وەك شێرکۆ

گیرۆدە بووبێ. نابێ ئەوەش بشارینەوە کە مردن و بەشداریکردن لە پرسە و سەرەخۆشیدا، دەرفەتێکی باشی دەڕەخساند بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانویست ئەوینداری بکەن، بە تایبەتی ئەگەر مرۆڤی کۆچکردوو تەمەنی لە سەرەوە بووایە. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتووی کۆمەلایەتی و بەرتەسك بوونی گۆڕەپان بۆ ئەوینداری لە کۆمەڵگا دا.

پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ و خواردنەوەی چا، گەڕاینەوە بەرەو ماڵی خۆمان. بە هاتنەوەمان دادە خاسپەری و کەژاڵ هاتن بۆ لامان. باسی بە خاکسپاردنی خاڵە شامار و دانیشتن لەگەڵ مامۆستا جۆامێر و هەڵوێستە نەگۆڕەکانی شاسوار و زۆر شتی دیکەمان کرد.

لای هەمووومان سەیر بوو کە داخوا چ ڕووی دابێ کە شاسوار پاش نەگەڕانەوەی دوێنێ شەوی فرمێسك بۆ ماڵی خۆیان، هێشتا لێی نەپرسیوەتەوە؟

هەر لەو باسانەدا بووین، کە ماشێنێك لە بەرانبەری گوند وەدەر کەوت. هەمووی چارەکێکی پێنەچوو، کە کوڕە ساجکەڵەیەك بەبێ ئەوەی لە دەرکی حەوشە بدا، خۆی کردە ژوورەوەی ماڵی ئێمە دا. هێشتا لە پلیکانەکان سەرنەکەوتبوو، بانگی کرد:

ـ دادە وەنەوش! کاکە شوان! شێرکۆ لێرەیە؟

چوومە دەمیەوە و پرسیم:

ـ کارێکی تایبەتیت بە شێرکۆیە؟

ـ بەڵێ، بەلام تەنیا بە خۆی دەڵێم.

خولّقم کرد که بێته ماڵ، بەڵام نەهات. شێرکۆم بانگ کرد و پێم گوت کاریان پێته.

شێرکۆ چوو بەرەو لای ئەو و پاش ئەوەی لەوێ دووری خستەوە، لە پشتی دەرکی حەوشە سرتەیەکی لەگەڵ کرد و بێ ئەوەی ئاوڕێك لە من بداتەوە، شێرکۆی بەجێهێشت وەك کولەبڕك بۆی دەرچوو.

شێرکۆ گەڕایەوە بەرەو لای من و گوتی:

ـ بە گیانی شوان بڕوام نییە.

ـ بڕوات بە چی نییە؟

ـ شتێك ڕوویداوە کە قەت ڕۆژێك لە ڕۆژان بیریشم لێ نەکردبۆوە.

ـ زۆر تایبەتییە؟

ـ نا، ڕووداوەکە بۆ خۆی تایبەتی نییە، بەڵام تایبەتمەندییەکان و بیرەوەرییە تاڵەکان هانم دەدەن تاکو بڕوا نەکەم. شێرکۆ هێندێك دەستەکانی هەڵگلۆفین و گوتی:

ـ دەبێ ئەم بەیانییە شاسوار سواری ماشێن بووبێ بۆ شار بچێ. لە ڕێگادا ماشێنەکە هەڵدێراوە و بابم دەست بەجێ گیانی لە دەست داوە.

بیستنی هەواڵەکە منی بردە دونیای خەیاڵەوە و دەمویست بەباشی لە شێرکۆ تێبگەم، بەڵام هەروا ئاسان نەبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو تایبەتمەندییانە دەبێ چی بن، کە شێرکۆیان ئاوا لە شاسوار حاسێ کردبێ، کە بڕوای بە مردنی بابی نەبێ! گوتم:

ـ برام کاکە شێرکۆ، هەر چیت لە دەست شاسوار کێشاوە لەبیرخۆتی بەرەوە. ئەو هەرچی بووبێ، بابت بووە و ناکرێ وا نیشان بدەی کە بە

مردنی خۆشحالّی. لە بیرت نەچێ کە شاسوار هەر چەندەش لەگەڵ ئێوە خراپ بووبێ، بەڵام برای دادە خاسپەریە و ڕەنگە ئەو ئاگای لەوە نەبێ کە باوکت چۆن لەگەڵ ئێوە هەڵسوکەوتی کردبێ. هەر بۆیە هێندێ یاسا و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی هەن کە پێوەندییان بە مرۆڤدۆستیەوە هەیە و دەبێ ڕەچاو بکرێن، ئەگەرچی بەشێکی ئەو داب و نەریتانەشمان بە دڵ نەبێ.

لە کۆتاییدا پێم گوت:

ـ تۆڵە لە مردوو ناکرێتەوە. ئەوانەش کە ئەجۆرە کارانە دەکەن، ئێستاشی لەگەڵ بێ، مرۆڤ و مرۆڤایەتی لایان نرخی نییە.

ئێمە خەریکی ڕاوێژکردن بووین کە چی بکەین و لە کوێوە دەست پێ بکەین، کە دایکم بە بۆنەی ئاوهێنانەوە هات بەرەو لای کونەلاّنی ئاوەکە. لێمی پرسی:

ـ ئەم ماشێنە بە ناوەخت هاتووە و ئەم بانگ کردنەی ئێوە بێ مەمەر نەبوو!

ـ دەکرێ بڵێن چی ڕوویداوە؟

ـ بەڵێ، ڕاستە بێ مەمەر نەبوو و هەواڵێکی ناخۆشی پێ بوو. وابزانم ئەم بەیانیە شاسوار چووە بۆ شار و لە ڕێگادا ماشێنەکەیان لەنێوان شارەکانی کرندی ڕۆژئاوا و هارونئاوا دا وەرگەڕاوە و شاسوار دەستبەجێ گیانی لەدەست داوە، بەڵام ئەوانی دیکە هیچیان لێ نەهاتووە. وابزانم ئێستاش دەبێ خۆ ئامادە بکەین بۆ پای پرسە رتن وخێراتکردن.

شێرکۆ کە گوێی لە قسەکانی من بوو، لێم هاتە پێش و خۆی پێڕانەگیرا و گوتی:

ـ شوانە! لە بیری شتی وادا مەبە. من نە پای پرسەی بۆ دەگرم و نە خێر و خێراتم هەیە کە بە کەسی بدەم.

ئەو کە چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، بەو پەڕی توڕەییەوە گوتی:

ـ شوانە! بە دەیان جار مەرگی خۆمم بە چاو دیتووە. بڕوات بێ کە زۆر جار داری لە بەردەستدا نەبووە کە لێم بدا، قاچمی گرتووە و لکاندوویە بە کوورەی ئاگرەکەدا. بە جۆریك کە پێستی پێم بە کوورەکەوە بەجێماوە.

شێرکۆ گۆرەوییەکانی لە پێ دەرهێنا و پێی پیشان دام. ئەوجار دۆخینەکەی کردەوە و سمت و لاقی خۆی پێشان دام کە جێگای بە دەیان جار داخ کردن و سووتاندنی پێوە دیار بوو! قەتم بڕوا نەدەکرد کە باوکێك ئەوەندە بێبەزەیی بێ، کە ئاوا لە منداڵی خۆی بکا.

شێرکۆ گوتی:

ـ هێشتا هیچت نەدیوە، با لەشی فرمێسکی خوشکم و دایکم ببینی، ئەوجار لە ڕادەی خۆشەویستی من و دایکم و فرمێسك، سەبارەت بە شاسوار تێدەگەی.

ئەمن کە بۆ خۆم بە مێرمنداڵیی بابم لەدەستدابوو و دایکیشم بە هەزاران کوێرەوەری و نازداریی پێی گەیاندبووم، لەگەڵ ئەو زەجرانەی کە شێرکۆ بە دەستی شاسوارەوە کێشابووی بێگانە بووم. لە گەرمەی تووڕەبوونی شێرکۆدا، وەبیری لێدوان و باسێك کەوتمەوە کە هاوینی ڕابردوو لە ماڵی یەکێك لە خاوەن ملکەکانی ناوچەی کرماشان هەمان بوو .

لەو میوانییەدا کە لە لایان کچ و کوڕی ئەو بنەماڵەوە کە پێکەوە هاوقوتابی بووین لێم گێڕدرابۆوە. دوو مەلا و کۆنە ژەنراڵێکی خانەنشینکراوی خەڵکی تارانیش بەشدار بوون. ئەو ڕۆژە تەلەفیزیۆنی ئێران ڕیپۆرتاژێکی لەسەر قات و قڕی لە وڵاتی ئەفریقایی-ئەتیوپیا- و مەرگی بە هەزاران کەس لە برسان دا بڵاو دەکردەوە. کاکی دەرەبەگ کە هەوا و پەتای هەبوو، پاش کۆتایی ڕیپۆرتاژەکە، بەمجۆرە لەسەر ئەو نەهامەتییە دوا:

ـ جا خۆ کەس دەستی نەگرتوون. با بچن کشتوکاڵ بکەن و ڕەنج بکێشن، تاکو لە برسان نەمرن!

ژەنراڵی خانەنشینکراویش بۆی سەندەوە و گوتی:

ـ ئەوەی خان دەیڵێ ڕاستە، باشتر وایە خۆیان بە کشتوکاڵەوە خەریك بکەن و دەست لە کوشت و بڕی یەکتریش هەڵگرن.

مەلاکان خەریکی میوە خواردنی خۆیان بوون و بۆشیان گرینگ نەبوو کە ئەو مرۆڤانە لە ئەتیوپیا چییان بەسەر دێ، منیش کە گەنج بووم و هێندێکیش سەرەپەڕ و خۆم بە ئامێژەنی هەموو کولاوێك دەزانی لێم پرسین:

ـ دەتوانم منیش ڕای خۆم دەربڕم؟

هەم مەلاکان و هەم ژەنراڵی خانەنشین ڕوویان لە خان کرد. وادیار بوو خان دەبا وەڵامی دابامەوە. ئەویش دەسرەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و هنگێکی ڕێك وپێکی تێکرد و پاش ئەوەی لوتی خاوێن کردەوە و دەسرەکەی تەپاندەوە گیرفانی، ئەوجار گوتی:

- فەرموو کوڕم، بزانم چ دەڵێی.

بە نیشانەی ڕێز لێنان سوپاسم کرد و گوتم:

- لە وڵاتێك کە ساڵانە لە دوو جار زیاتر بارانی لێنابارێت و بە دەست وشکەساڵییەوە دەناڵێنێ، لە وڵاتێك کە سەرچاوەی ئاوەکانیش هی دەرەبەگەکان، خانەکان، شێخەکان و سەرۆك هۆزەکانن، لە وڵاتێك کە هەژار و نەدارەکان تەنیا لە دوورەوە بۆیان هەیە چاو لە سەرچاوەی ئاوەکان و مەزراکان بکەن، دەکرێ چاوەڕوانی کار و کشتوکاڵی لێبکرێ؟ لە وڵاتێك کە ڕادەی خوێندەواریی خەڵکەکەی لە دە لەسەدیش کەمترە، دەکرێ ئاوا بە سانایی ئیدانەی بکرێن؟ بێجگە لەوەش ئەوە کەی گونجاوە بۆ ئێمە کە لەسەر سفرەی ڕەنگاوڕەنگ کە بە چەندین جۆر چێشت و میوە ڕازاوەتەوە، دادوەریی لەسەر وڵاتێك و میللەتێك بکەین کە هەزاران فەرسەخ لە ئێمەوە دوورە!؟

لە حەق دەرنەچین خان بە جوانی لە مەبەستەکەم تێگەیشت و هیچی نەگوت، بەڵام یەکێك لە مەلاکان وابزانم نێوی ئەشرەفی بوو، لێم هاتە جواب و گوتی:

- ئێوە هێشتا گەنجن و کەم ئەزموون، بەڵام ئێمە دونیامان دیوە و دەزانین دوارۆژێك، بەهەشت و دۆزەخێك هەیە. ئەوان نەدارن یان هەژار، یان دەمرن و دەکوژرێن، تاوانی کەس نییە. خودا ئەوانی بەو جۆرە خولقاندووە و ئێمەش بەجۆرە، کوڕی خۆم. ئێوە شوکر خوێندەوارن و ئەوەش دەزانن کە بەبێ ڕازیبوونی خودا، تەنیا گەڵایەکیش لە دار بەر نابێتەوە. ئەوانەی لەم دونیا خێر و خۆشی نابینن، لەو دونیا مافی خۆیان

وەردەگرنەوە. بە جۆرێك كە ڕابردووی تاڵیی ژیانی ئەم دونیایەیان لە بیر دەچێتەوە و بە بەهەشتی بەرین شاد دەبنەوە. کەوابێ، ئێمە بۆمان نییە دەست لە کاروباری خودا وەردەین، چونکە ئەگەر هات و وامانکرد، ئەوە دڵخوازی خودا نییە و ئەوەدەم دەبێ سێسەد هەزار ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دا بسووتێین!

من ئەو بیرەوەرییەم لەبەر ئەوە وەبیر هاتەوە کە خۆمم لە جیاتی شێرکۆ دانابوو. ئەمجۆرە بیرکردنەوەی من خۆی لە خۆیدا نادروست بوو، چونکە ئەو زەجرەی کە شێرکۆ بە دەست شاسوارەوە کێشابووی، لای من بوونی نەبووە. لە قووڵایی بیرۆکەی خۆمدا بینگم دەخواردەوە، بە جارێك مردنی شاسواریشم لە بیر چووبۆوە، کە شێرکۆ دەستی هاویشتە سەر شانم و گوتی:

ـ نیگەران مەبە شوانە! بە هەزاران شاسوار هاتوون و چوون، بەبێ ئەوەی بزانن بۆ چی هاتوون بۆ چی دەچن. شوانە، دڵنیات دەکەم کە تێبکۆشم ئەو هەموو جەورەی کە بە دەست شاسوارەوە کێشاومە، لە بیری خۆمی ببەمەوە، بەڵام ئەوەی ئەو بەسەر دایکم و فرمێسك دا هێناویەتی، قەت ناتوانم لە بیرمی بەرمەوە.

ئێمە گەڕاینەوە بۆ لای دادە خاسپەری و دایکم و چۆنیەتی هەواڵەکەمان بۆیان گێڕاوە. لە کاتی گێڕانەوەی هەواڵەکە لە لایان شێرکۆوە، هەر وات دەزانی هیچ ڕووی نەدابوو.

دادە خاسپەری بڕوای نەدەکرد. ئەو گوتی شاسوار نەدەبا بە ڕووداوێکی ئاوا بە جێی هێشتباین.

کەژاڵ دەیڕوانییە فرمێسك و بێدەنگ بوو.

دایکم گوتی:

ـ ڕووداوە و هاتووەتە پێش. باشتر وایە بەر لەوەی خەڵکمان لێکۆببنەوە، خۆمان ساز دەین بۆ پرسە و پێشوازیکردن لە خەڵك.

شێرکۆ کە توڕە دەهاتە بەرچاو گوتی:

ـ دایکم لەو بارەوە خاوەن بڕیارە و دەبێ هەرچی زووترە ئاگاداری یکەینەوە.

دایکم و دادە خاسپەری لەگەڵ شێرکۆ چوون بۆ ماڵی دادە گەرشە تاکو هەواڵەکەی پێڕابگەیەنن. من پێشنیارم کرد کە فرمێسك و کەژاڵ خۆیان ئامادە بکەن بۆ هێنانەوەی تەرمی شاسوار، بەڵام فرمێسك گورج بەرپەرچی دایەوە. ئەو کە کوڵی گریان گرتبووی، گوتی:

ـ وەرن چاو لە لەشی من بکەن با بە چاوی خۆتان جێگا دەستەکانی شاسوار ببینن.

پێم گوت:

ـ ئێستا کاتی ئەوە نییە و شێرکۆ بۆی گێڕاومەتەوە کە چیتان بەسەر هاتووە.

بەڵام فرمێسك قەناعەتی نەهێنا و گوتی:

ـ گێڕانەوەی بەسەرهاتێك، گەلێك جیاوازی هەیە لەگەڵ دیتنی. ئەو لەپێشدا پشتی پێشان داین کە ئاسەواری لێدان هەر لە تەمەنی منداڵییەوە پێوە دیار بوو، پاشان کلۆك وسمتی پێشان داین کە زیاتر لە نەخش و نیگاری سەرسینگ و شانی بە خاڵ کوتراوی پاڵەوانەکانی

کرماشان دەچوو" تاکو سمت و کلۆکی جوانە کچێکی وەك فرمێسكْ. لەگەڵ کەژاڵ دا بژاردمان کە لە سێزدە جێگاوە داخ کرابوو. ئەو جلەکانی لەبەر کرد و گوتی:

ـ ئەوەی بەزەیی بێ لە بۆ شاسوار، لە دڵی مندا بوونی نییە. هەربۆیە نە بە دوای تەرمیدا دەچم و نە لە پرسەکەشیدا بەشداری دەکەم.

بەو هەڵوێستەی فرمێسك، من و کەژاڵ دەستەوەستان ماین. بۆ خۆم نەمدەتوانی هاتووچۆی شار بکەم، چونکە لە مێژ بوو خرابورمە لیستەی "دژەشۆڕشەوە" و گیرانم بە مانای کۆتایی ژیانم بوو. ئێمە سێ کەسی بەرەولای کاکی دوکاندار وەڕێ کەوتین. گەیشتینە لای و پرسی هێنانەوەی تەرمی شاسوارمان خستە بەردەستی. بەبیستنی هەواڵەکە، دایبەسەردا و کڵاو و دەستماڵەکەی لەسەر داگرت و هەتا هێزی تێدا بوو، کوتای بە زەویدا و گوتی:

ـ دەك دونیا خوار و ژوور بی! بۆ بێ وەفاییت. تەنیا پیاو چاك و دین و ئاینداری گوندت لێ سەندین. کوێرایی چاوەکانمە بۆ شاسوار. بە ڕاستی هەر خۆی شاسوار بوو. لەو کاتەوەی من دەیناسم، بۆ تەنیا جارێکیش بێ، مێرولەیەکیش ئازاری لە دەستی نەدیوە و تەنیا کەسێکیش لێی نەڕەنجاوە. هێندە خوداپەرست و ئایین خۆشەویست بوو، کە سەری بچوا نوێژی نەدەچوو. ئای ڕۆژگار، ڕووت ڕەش بێ، ئاوا وەفا بە کەس ناکەی. هەر دوێنێ بوو کە باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەم هاوینە سەفەری ماڵی خودا دەکا و دەبێتە حاجی و دەبێتە هاوگەپی حاجی هەمزەش کە قەرار وایە فرمێسك بخوازێ.

ئینجا ڕووی لە فرمێسك كرد و گوتی:
ـ ڕۆڵە گیان شاسوار خراپی نەكێڵاوە، تاكو شەرمەزاری بكێشن. خێر و خێراتێكی باشی بۆ بكەن، با كەس گلەییتان لێنەكا. شاسوار لادەس نشینی ئیمام و ئەولیاكانە و پردی سیراتیش كە بە قەد موویەك باریكتر و لە ئەڵماس تیژترە، لە هەنای دەبێتە ڕێگایەك بە پانایی بەهەشت!؟
لە كاتی لێدوانی مام لەتیفی دوكانداردا، چاوم لە فرمێسك بوو كە خەریك بوو وەك چۆلەكە هەڵفڕێ! مام لەتیف بەبێ ڕاوەستان خۆی ئامادە كرد و گوتی:
ـ خەمتان نەبێ، ئەوە ئەركی منە و ئێوە خەریكی كارەكانی دیكە بن.
ئێمە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە و لە ڕێگادا ئەوەم بۆ ببوو بە پرسیار، كە باوكێكی ئاوا بێبەزەیی چۆن ڕێگای داوە ئەم كچە تا ڕادەی خوێندنی باڵا بچێتە پێش؟! خۆم پێ ڕانەگیرا و لێم پرسی:
ـ دەكرێ پێم بڵێی قۆناغەكانی خوێندنت چۆن تێپەڕاندووە؟
ـ ئەوە بەسەرهاتێكی دوور و درێژە و لە دەرفەتێكی لەباردا بۆت دەگێڕمەوە. ئێمە گەیشتینەوە ماڵی خۆمان و سەرو پاروو نانمان بە سەر پێوە خوارد، پاشان لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە كە مامۆستا جوامێر ئاگادار بكەینەوە. پێكەوە چووینە دەرگای ماڵی مامۆستا جوامێر و ئەومان لە مردنی شاسوار ئاگادار كردەوە. لەوێشەوە بەرەو ماڵی دادە گەرشە، كە هەتا ئەم بەیانیە ماڵی شاسوار بوو، وەڕێ كەوتین. لەوێ ژمارەیەك خەڵكی گوند دانیشتبوون. دوو دوو و سێ سێ سەریان كردبووە یەكدا و هەر دەستەیەك لە گرفتێك دەدوان. شێركۆ چای دەگێڕا. دادە گەرشە خەریكی

شێوی ئێواریێ بوو. منیش وەك نەریتی باو، کچەکانم بەجێهێشت و چوورمە نێو دەستەی پیاوان و دانیشتم. هێندەی پێنەچوو کە شێرکۆ هاتە لامان و دانیشت. هێندێك ملی خوار و بان کرد و پاشان سوپاسی هاودەردی پرسەگێڕانی کرد و گوتی:

- هیوادارین کە ئێمە بە شایی بێینە ماڵتان و پێمخۆشە ئەوەش ڕابگەیەنم کە ئێمە بڕیارمان داوە خێر و خێرات نەکەین. بەو بۆنەوە داوای لێبووردن لە سەرجەم خەڵکی دێ دەکەین.

- لەو ڕاگەیاندنەی شێرکۆ سەرم سووڕما، چونکە ئێمە مامۆستامان ئاگادار کردبوو و چاوەڕوانی هاتنی بووین. لام وابوو کە ئەگەر مامۆستا جوامێر بابەتی خێرات نەکردنی ڕاگەیاندبا، تا ڕادەیەك لای خەڵك ئاسایی دەبوو، بەڵام تازە کار لە خشتە ترازا بوو و شێرکۆش وتەکانی بۆ قوت نەدەدرانەوە. بۆ ئەوەی باسێك بکرێتەوە و هەموو سەیری زاری یەکتر نەکەن، باسی مردنی خاڵە شامارم کرد و گوتم:

- ئەم بەیانییە خاڵە شامارمان ژێر خاك کرد. مرۆڤێکی ڕەنجدەر، بەڵام ڕەنج بێوەر. نە پرسەیەك، نەسەرەخۆشییەك، نە هەڵوا بەشکردنێك و نە خێر و خێراتیش. نە شینکردن و قژداڕنین، نە یەقەدادڕین و نە لای خۆبڕین، نە قوڕ بە شاندا دان و نە باوکەڕۆش! کەسێك کە هەموو ژیانی پڕ لە مەینەتی خۆی، بە ئاوداشتنی باخ و بێستانەوە تێپەڕاند کە خزمەت بوو بەو سروشتە جوانەی دێیەکەمان، ئاوا بە بێنەوەی کەس پێبزانی سەری نایەوە!؟

شێرکۆ وتەکەی لە زارم گرت و گوتی:

- خێر و خێرات نەکردنی ئێمە بەو مانایە نییە کە ئێمە دەستکورت بین، یان نەمانەوێ ئەو کارە بکەین، بەڵکو ئێمە دەمانەوێ ئەم نەریتە کۆنە بگۆڕین کە باوی نەماوە. لەو پێناوەشدا هیوا دەردەبڕین کە لە داهاتووشدا ئەمە ببێتە ڕچەشکێنی بۆ گۆڕانکاریی لە نەریتە کۆنەکان.

شێرکۆ هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو، کە مامۆستا و دادە جەیران هاتن بۆ سەرەخۆشی. خەڵکەکە چاوەڕوان بوون کە مامۆستا فاتیحە دادا، بەڵام ئەو ئەم کارەی نەکرد. هۆی چی بوو نازانم. لەو نێوانەدا دەستە خەڵك دەهاتن و دەچوون، بەڵام مامۆستا لە هەواڵپرسییەکی ئاسایی نەبێ، وشەیەك لە زاری نەهاتە دەر.

زۆربەی کاتەکان من و شێرکۆ بەسەر پێوە بووین و بەخێرهاتنی خەڵکمان دەکرد. درەنگانێکی شەو، شام خورا و دەپازدە کەس پێکەوە هاتن. فرمێسك بەبێ لەچکە لە سوچێکیماڵەکەوە دانیشتبوو. پیاوێکی بەساڵ داچوو، بانگی فرمێسکی کرد و بەبێ لێکدانەوە پێی گوت:

- گورج بڕۆ ئەو سەر و ملەت داپۆشە. ئەتۆ بە لای خۆتەوە گەورە و خوێندەواری. داوەشێی بۆ ڕووی هەڵماڵاوت!

فرمێسك زۆر بوێرانە و بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك چرچ بخاتە نێوچاوانی، پێی گوت:

- ئەگەر ڕێزدار بوون و ڕێز دانان بە پیت و پەڕۆ لە خۆ هەڵواسین بێ، من ئەو ڕێز و حورمەتەم ناوێ، بێجگە لەوەش کاتی ئەوە هاتووە کە دەبێ فێر بین و هەروا لە خۆڕا خۆمان هەڵنەقورتێنینە نێو ژیانی تایبەتی

خەڵکەوە. ئەوەش کە ئەتۆ باسی دەکەی و پێت وایە شوورەییە، ژیانی تایبەتی منە و بۆ کەسیش نییە خۆی لێبکاتە کوێخا و دەمڕاست.

ئەو هەڵوێستەی فرمێسك لە بەرانبەر داوای ئەو پیاوەدا، بوو بە هۆی تووڕە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوەکان و هەر کەسە و بە جۆرێك بەبێ حورمەتیان زانی. مامۆستا جوامێر کە تا ئەودەم بێدەنگ بوو لێیان هاتە دەنگ و گوتی:

ـ ئەو هەڵوێستەی فرمێسك هیچ ڕەخنەیەکی لەسەر نییە. ئەوە ئێمەین کە خۆمان بە عەقڵی تەواو دەزانین و ئامادە نین سەربەستیی ئافرەت ببینین. ئەگینا چادر، چارشێو، پیتوپەڕۆ بەسەردادان کەسایەتیی ناهێنێ. بە پێچەوانەوە ئەگەر ئافرەتان سەربەست بن و بە ویست و خواستی خۆیان جلوبەرگ لەبەربکەن، باوەر بە خۆبوونیان دەچێتە سەر و دەبێتە هۆی بەشداری چالاکانەیان لە ڕاپەڕاندنی کار و ئەرکەکانی ڕۆژانە، هەم لە خێزان و هەم کۆمەڵ دا.

فرمێسك بەو هەڵوێستەی مامۆستا کەیفی کرد و خەریك بوو بزەیەك بکەوێتە سەر لێوی، بەڵام گورج دەستی گرت بەسەر زاریدا.

ڕاست بوو ئەم بەیانیە خاڵە شامارمان بە خاك ئەسپاردبوو و دوا نیوەڕۆیەش خەبەری مردنی شاسوار هاتبوو، بەڵام من هەستم جۆرێکی دیکە بوو. هەستم دەکرد کە ئێمە هاینە بەردەم گۆڕانکارییەك دا، با لە کۆمەڵێکی چووکەی گوندەکەی خۆمانیشدا بووبێ. ئەویش تەنیا من نەبووم کە لە گەرمەی ئاڵوگۆڕەکەدا بووم. مامۆستا مرۆڤێکی بڕوا پێکراو بوو. ئەو هەڵوێستێکی گرتبوو کە بە دەگمەن دەبینرا" هەرچەند

لەمێژ بوو کە بڕیاری خۆی دابوو کە بۆ نەتەوەکەی بژی و هەر بۆ ئەوانیش بمرێ. هاوەڵانی چەپی پێشووم یەك یەك و دوو دوو دەبوونە هەڵگری بیروباوەڕی نەتەوەیی. ئافرەتانیش لە ڕادەیەکی کەمتردا بۆ سەربەستی خۆیان هەڵوێستیان دەگرت. داب و نەریتە کۆن و لەگەڵ سەردەم نەگونجاوەکان، وردە وردە بەرەو لاوازی دەچوون. ئەمانە هەمووی هانی دەدام کە لەگەڵ ئەو کوڕ و کچە گەنجانە چالاکتر خۆ بنوێنین، بۆ لە قاودانی ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانە کە ڕێگر بوون لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەڵی ئێمەدا.

هێندەی پێ نەچوو کە شەوقی چرای ماشێنێك دای لە شاخی پشتی گوند. ئێمە هەستمان کرد کە ماشێنەکە هەڵگری مەیتی شاسوارە و لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە بەرەو گۆڕەپانی گوند وەڕێ کەوتین.

ماشێن گەیشت و ئێمە بە تێکڕا لە دەوری کۆبووینەوە. مام لەتیفی دوکاندار هاتە خوارێ و گوتی:

ـ شێرکۆ گیان خۆتان خۆش بن. باوك بۆ کەس نەماوە تاکو هی ئێوە بمێنێ. هیوادارم جێگای باوکت پڕکەیتەوە.

شێرکۆ سوپاسی زەحمەت و ماندووبوونی لێکردن و ئێمە تەرمەکەمان هەڵگرت و بردمانە دەرکی ماڵ. زۆربەی خەڵکی گوند لەوێ کۆ ببوونەوە. گەرمەشینی ئافرەتان دەستی پێکرد. پیاوانیش وەك داب و نەریت بە کۆ دانیشتن. لەپێشدا باسی بەخاکسپاردن و پاشانیش چۆنیەتی خێراتکردن هاتە گۆڕێ.

شێرکۆ هەستا و بەدەنگی بەرز وتەکەی پێشووی دووپات کردەوە. ئەو گوتی:

ـ خەڵکینە ئێمە سوپاسی هاودەردیتان دەکەین. هیوادارم لە شایی و شیوەندا، لە خۆشی و ناخۆشیدا یار و یاوەر و یارمەتیدەری یەکتر بین. ئێمە بڕیارمانداوە هیچ چەشنە خێر و خێراتێك نەکەین. ئەگەر گوناح بێ یان سەواو، بڕیارە و داومانە. ئێمە لە سەرمانە ڕێز لە مردووەکانی خۆمان بگرین، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەوەش بڵێین کە نابێ زیندوکوژیی، مردوو پەرست بین!

زۆربەی ئەو خەڵکە هەڵوێستەکەی شێرکۆیان جوامێرانە ناودێر کرد، بەشێکیش لۆمەیان کرد. بەدوای وتەکانی شێرکۆدا، سوارە سەرۆك ئەنجومەنی گوند هەستا سەرپێ و گوتی:

ـ ئەم هەڵوێستەی بنەماڵەی گەرشە جێگای پەسەندی ئەنجوومەنە. ئێمە لەمێژە بیرمان لەوە دەکردەوە، کە بەڵکو ڕێگا چارەیەك بۆ ئەم کۆسپە دەستنیشان بکەین، بەڵام نەمان دەزانی لە کوێوە دەست پێبکەین. هۆکاری جێبەجێ نەبوونی ئەم بیرۆکەیە زۆر بوون، بەڵام هۆیەك کە کەس ئامادە نەبوو خۆی لێبدا ئەوە بوو کە دەیانگوت، هەر مردوویەك خێراتی بۆ نەکرێ، ناچێتە بەهەشت!؟

کاك بەختیار ئەندامی دیکەی ئەنجومەنی دێ کە لەتەنیشت سوارەوە دانیشتبوو، هەستا سەر پێ و ڕایگەیاند:

ـ لام وایە ئەم تازە بە دەسەڵات گەیشتووانە پلانی زۆر مەترسیداریان بۆ ئێمە داڕشتووە. لەم قۆناغەدا ئەرکی قورس دەکەوێتە سەرشانی

ڕۆشنبیران وخوێندەواران، گەنجان و لاوانی کچ و کوڕ، کە دەبێ لە بیری ژیانی داهاتوویاندا بن. لە سەردەمی ئێستادا و لە کۆمەڵگاکانی پێشکەوتوودا، خەڵك بە دەستی خۆیان بەهەشتی ژیان دروست دەکەن و کەسیش کڕیاری بەهەشتی وادە دراو نییە.

بە کۆتایی هاتنی وتەکانی کاك بەختیار، من کە دەمدیت ڕەوتەکە ڕاست لە بوارێکدا دەچێتە پێش کە خوازیاری بووم، بە بێدەنگ دانیشتم و تەنیا گوێم دەگرت، بەڵام پێمخۆش بوو کە فرمێسك ئاگادار بکەمەوە کە بە پشتیوانی لە وتەکانی سوارە و بەختیاردا، شتێك بڵێ. دادە گەرشەش لە کونجێکی ژوورەکەوە کورژیلکەی کردبوو و بە تەواویش بێدەنگ بوو. ئەو نە دەگریا، نە شینی دەکرد و نە مردنی شاسواریشی لێ گرینگ بوو! پێم وایە ئەو بە مردنی شاسوار خۆشحاڵ نەبوو، چونکە بە خو و خدەی مێردەکەی ڕاهاتبوو، بێجگە لەوانەش دەیزانی کە ئیتر بۆ هەتا هەتایە بە تەنێ دەمێنێتەوە. ئەوە کولتوری ئێمە بوو کە ئەگەر ئافرەتێك مێردەکەی مردبا، بە دەگمەن هەڵدەکەوت کە جارێکی دیکە مێرد بکاتەوە. بۆ خۆی چاکی دەزانی کە لە کۆمەڵی ئێمەدا و بە بوونی دەیان داب و نەریتی کۆن و بەسەردا سەپاو دا، ئافرەتی چارەڕەش هێندەی دیکەش دەکەوێتە پەراوێزەوە و دەبێ ماڵئاوایی لە بەشێکی هەرە گرینگ لە ژیانی خۆی بکا.

بە دوای ئەوەدا، خەڵکەکە بە تاق و پۆل هەستان و بەرەو ماڵی خۆیان بڵاوەیان لێکرد. هەشت تا نۆ کەسێك ئەو شەوە لە ماڵی دادە گەرشە مانەوە.

لەگەڵ ڕووناکبوونەوەی هەوا دا، بیست کەسێك چووین بۆ قەبرستان بۆ هەڵکەندنی گۆڕ.

تا ئێمە گۆڕمان ئامادە کرد، ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکی ئاوایی تەرمەکەیان هاورد و لە چەند خولەکێکدا خاکی کرا، پاشان شێرکۆ سوپاسی یارمەتی و هاریکاری خەڵکەکەی کرد. بەدوای ئەوەدا هەڵواکە لە نانەتیری ناسکەوە پێچرابوو، بەسەرماندا بەشکرا، پاشان گەڕاینەوە گوند و لەپێشدا چووینە لای دادە گەرشە و سەرەخۆشیمان لێکرد و هەرکەسە چوو بە دوای ئیشوکاری خۆیدا. منیش گەڕامەوە بەرەو ماڵی خۆمان و لە ڕێگادا بیرم لەوە دەکردەوە کە ژیان بەبێ ئازادی و لێتێگەیشتن، چەندە بێ نرخە. یەکێك لە ئاواتە هەرە بەرز و وەدیی نەهاتووەکانی شاسوار ئەوە بوو کە ببێتە خەزووری حاجی هەمزە و لەو ڕێگایەوە سەروەت و سامان بە دەست بێنێ. واتە ئەوەی کە تەنیا ویستی خۆی بوو، بەڵام قەتی بیر لەوە نەکردبۆوە کە جەهەندەمێك بە دەستی خۆی بۆ کچەکەی کە بەندی جەرگی بوو، دروست دەکا. ئەوەش کە جارێك لە جاران بە مێشکیدا نەهاتبوو و بگرە، بۆ چرکەیەکیش بێ بە بیری خۆیدا نەهێنابوو، نووستنی هەتا هەتایی خۆی بوو، ئەویش لە ڕێگای هەڵدێرانی ترۆمبیلەوە. گەیشتمە ماڵ ماندوو بووم و خەریك بووم وەنوزێك بدەم، کە دایکیشم هاتەوە. لام دانیشت و گوتی:

- کەس بە حاڵی گەرشە نەبێ. ئەو چارەڕەشە هەر لە ناکاودا بەلاداهات و زمانی بەسترا!

منیش خاوخاوێك گوتم:

- پێموایە لە دوو حاڵ بەدەر نییە. یان لە داخی مردنی شاسواردا زمانی بەستراوە، یان لە خۆشیدا!.

ئەم ڕادەربڕینەی من لای دایکم سەرسوڕهێنەر بوو. ڕووی تێکردم و گوتی:

- من بیستوومە کە کەسێك لە داخان نەخۆشی کوتوپڕ لێیداوە و زمانی بەستراوە یان سەقەت و کەمئەندام بووە، بەڵام نەمبیستوە کە کەسێك لە خۆشیان تووشی ئەو جۆرە ڕووداوە ببێت.

ڕووم تێکرد و گوتم:

- دایکە گیان! گەلێك ئاساییە کە زۆر جار ڕووداوێکی ناخۆش دەتوانێ ببێتە هۆی ڕاوەستانی دڵ یان لەکارکەوتنی مێشك، بەڵام لات سەیر نەبێ کە هەر ئەو ڕووداوە تاڵ و ناخۆشە، ئاکامێکی خۆشی بۆ هێندێك کەس بەدواوە بێ، کە ببێتە هۆی ڕاوەستانی مێشك یان دڵ. بێشك لە وەها بارودۆخێکیش دا زمان لەگۆکەوتن، کەمئەندام بوون، و بگرە خواربوونی زار و خێل بوونی چاویشی بە دواوە دەبێ.

من گەلێك ماندوو بووم و پێم خۆش بوو چاوێك گەرم بکەم، بەڵام بەرلەوەی بنووم، بە دایکم گوت:

- باشتر وایە یارمەتی دادە گەرشە بکەی و بیگەیەنیتە دوکتۆر.

- پێشتر بیرم لێ کردۆتەوە، بەڵام چاوەڕێ بووم کە بۆ خۆیان پێشنیارم پێ بکەن.

- ئێمە ئێوارێ هەر دەبێ بچین بۆ ئەوێ و ئەوکات دەکرێ باسیان لەگەڵ بکەین.

به هەرجۆر بوو چاوێکم گەرم کرد و پاشان ئاوێکم بە خۆم داکرد. زۆر تێکۆشام بەڵکو کتێبێك هەڵگرم و هێندێ بخوێنمەوە، بەڵام مێشکم بە زۆر بابەتی دیکەوە خەریك بوو. ئێمە ئەو ڕۆژەشمان گەیاندە ئێوارێ و خۆمان خستە ڕێ بەرەو ماڵی دادە گەرشە. بەرلەوەی بەرەو ئەوێ بچین، چوونە دەرکی ماڵی دادە خاسپەری، بۆ ئەوەی هەواڵێکی کەژاڵ و کاروان بپرسین. لە دەرگای ماڵیانم دا و پاش ماوەیەکی کورت کەژاڵ دەرگای لێکردینەوە. دایکم بە کەژاڵی گوت:

ـ لەوانەیە بۆ خۆت بزانی کە خاسپەری تاکو حەوتووی خاڵت نەچێ، نایەتەوە بۆ ماڵ. هەرکات پێویستتان بە یارمەتی بوو، ئاگادارمان بکەنەوە. ئەویش سوپاسی کرد و گوتی: ئەگەر بەرەو ماڵی خاڵۆژنە گەرشەم دەچن، ئەوە ئێمەش پێمانخۆشە لەگەڵتان بێین.

ئەوان خۆیان ئامادە کرد و پێکەوە گەیشتینە ئەوێ. کاك سوارە و مامۆستا جوامێر لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە لەوێ بوون. ئەو شەوە باسی گەلێك گیروگرفتی سەر ڕێگای ژیان کرا. شەوگار وردە وردە تێپەڕ دەبوو. ئەو خەڵکەش یەك یەك و دوو دوو ماڵئاواییان دەکرد و دەچوونەوە. تەنیا من و دایکم لەگەڵ کەژاڵ مابووینەوە. ئێمەش کەوتبووینە جموجوڵ کە بچینەوە، کە شێرکۆ گوتی:

ـ ئەمڕۆ حاجی هەمزە هەواڵی ناردووە کە بۆ بەیانی بە سەد کەسەوە دێنە سەرەخۆشیمان.

لەپێشدا تا ڕادەیەك دەستەوەستان ماین، پاشان هاتینە سەر ئەو بڕوایە کە ئێمە هەر لە بنەڕەتدا تووشی هەڵەیەکی گەورە بووینە و نەمان توانیوە ئەم هەڵەیە ڕاست کەینەوە. دایکم پرسی:

ـ چ هەڵەیەك! خەڵك دەمرێ و پای پرسیش دەگێڕێت و سەرەخۆشی کەریش دەبێ بێن.

ـ دایکە گیان هەڵەکە لەوەدا نییە کە خەڵك دێن یان نایەن. گرفتی سەرەکی لەوەدایە کە ئێمە دەبا ڕۆژێکمان وەك ڕۆژی سەرەخۆشی دیاری کردبا و خەڵکیشمان لە کات و ڕۆژەکەی ئاگادار کردباوە بۆ ئەوەی هەمووان بە یەکجار هاتبانە سەرەخۆشی . هەڵبەت ئێستاش درەنگ نییە و لە داهاتوودا ئەو گرفتەش چارەسەر دەکەین.

بە دوای ئەوەدا لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە دوو کاوڕ لەگەڵ شەست کیلۆ برینجمان پێویستە، بێجگە لەوەش باسی ئەوەشمان کرد کە دەبێ دادە گەرشە بگەیەنینە دوکتۆر.

بەڵام پێشنیار کرا کە ئەم کارە بخرێتە پاش هاتنی لەشکری سەرەخۆشی کەری حاجی هەمزە. لە کۆتاییدا ئەرکەکانی بەیانیمان دابەش کردن. وامان دانا کە کەژاڵ لەگەڵ شێرکۆ یارمەتیی دایکم بکەن بۆ لێنانی برینج. من و فرمێسکیش شلەی گۆشت لەگەڵ پەتاتە و قەیسی دروست بکەین. بە دوای چناریش دابنێرین کە بێتە یارمەتیمان. ئێمە ئیتر نەچووینەوە و هەر لەوێ چەند کاتژمێرێك نووستین. بەیانی زوو شێرکۆم لە خەو هەستاند و پێکەوە چووین بۆ ماڵی مام لەتیفی خاوەن دوکان و قەساب. داوامان لێکرد کە دوو پەز مان بۆ بکوژێتەوە، پاشان دەستمان

کرد بە کۆکردنەوەی دەفر و دۆڵە لە ماڵان. تاکو ئێمە دەفر و دۆڵەکانمان کۆ کردنەوە، مام لەتیف دوو کاوڕی بۆ پەل و بن کردین. ئێمە بە یارمەتی چەند کەسێکی دیکە گۆشت و دەفر و دۆڵەکانمان هێناوە و قاوەڵتییەکی سەرپایشمان کرد. هەر بەیانی زوو مامۆستا چناری نارد بۆ یارمەتیمان. کاروانیش گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان تاکو مانگاکانیان بەرداتە نێوگاڕانێ. ئێمە بەتێکڕا دەستمانکرد بە بەرد کۆکردنەوە و چەندین کوانگی بەردینمان دروست کرد، پاشان تاومان کردە قەزگانەکان و لەسەر کوانگە بەردینەکان دامان مەزراندن. جێگامان بە سەر بانانەوە ڕاخستبوو و هەموو شتێك بۆ پێشوازیکردن لە سەد کەس ئامادە کرابوو. بە گشتی کارەکانمان وا ڕێك خستبوون کە کەموکوڕییەکی ئەوتۆی پێوە دیار نەبوو. کاتژمێر یازدە و بیست خولەکی بەر لە نیوەڕۆ، یەکەمین ترۆمبێل لە بەرانبەر گوندەوە وەدیار کەوت. گوندی ئێمە تا ئەو کاتە ڕۆژی وای بە خۆیەوە نەدیبوو. شەست و یەك ترۆمبێلمان بژاردن کە لەگەڵ حاجی هەمزە هاتبوون بۆ سەرەخۆشیکردن بە بۆنەی مردنی شاسوارەوە.

فرمێسك کە بە هۆی گوشاری چەند لایانەوە هیلاك و ماندوو بوو، هاتە لای من و پرسی:

- دەزانی چی؟

- نە! چووزانم چیت لە دڵدایە.

ئەو بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- وابزانم حاجی هەمزە پەرۆشی خەنجەرەکەی بەرزکییەتی و پێی وایە کاتی ئەوە هاتووە بیکاتە قەڵافە!

- مەبەستت چییە؟

- چاك دەزانی مەبەستم چییە، خۆتم لێ گێل مەکە.

گورج وشەکەم لە زاری وەرگرت و گوتم:

- خەمت نەبێ، خەنجەرەکەی حاجی تا ئەو ڕادەیە کول بووە کە تەنانەت داری تەڕ و ناسکیشی پێ ناتاشرێ.

فرمێسك بزەیەکی دیکەی هاتێ و نیوە چنگێکی لە قەتارەی ماشێنەکان گرت و گەڕایەوە بۆ لای دایکم و چنار. ئێمە بە تێکڕا چووینە پێشوازییان و بەخێرهاتنمان کردن. کە هاتینەوە لای ماڵ، هەر بیست کەسە و لە سەربانێك کە جێگایان بۆ داخرابوو دانیشتن. لەپێشدا سەر و چایی خوراوە، پاشان سفرە بەخڕ ڕاخرا و دوای نان خواردن، هەرکەس بە نۆرەی خۆی سەرەخۆشیان لە شێرکۆ دەکرد و هەواڵی دادە گەرشەیان دەپرسی. ماوەیەکی باش دانیشتن و پاشان پێیان خۆش بوو پیاسەیەك بە قەراخ گوند دا بکەن.

ڕۆژێکی هەتاویی بوو و ئاسمانی شین کەشوهەوایەکی تایبەتی بەخشیبووە ئەوێ، ئەگەرچی کزە بایەکی ساردیشی لەگەڵ بوو. مام لەتیفی دوکاندار بوو بە چاوساغ و چەند کەسێکی خەڵکی گوندیان لەگەڵ کەوت. حاجی بۆ خۆی نەچووە دەر و لەگەڵ شێرکۆدا پێکەوە دانیشتبوون. منیش وەك هاوڕێیەکی شێرکۆ چوومە لایان دانیشتم و بەخێرهاتنی دووبارەی حاجیم کرد. ئەو هێندێك باسی لە گەورەیی، دلۆڤانی، بەزەیی و دەسەڵاتی خودا کرد. زۆر جاریش دووپاتی دەکردەوە کە

شاسوار مرۆڤێکی بەخشندە و خۆشەویستی خودا بووە و مرۆڤی واش جێگای لە بەهەشتی بەریندایە.

من کە هێشتا حاجیم بە تەواوی نەناسیبوو گوتم:

ـ مرۆڤ دەبێ ئاکار و کردەوەی باش بێت و خۆشەویستی خەڵکیش بێت. لاشم وایە تەنیا خۆشەویستی خودا ناتوانێ مرۆڤ بکاتە جێگای ڕێز و متمانەی خەڵك.

حاجی ڕووی تێکردم و گوتی:

ـ هەڵبەتە دەبێ وابێ، بەڵام شاسوار هیچ کاتێك خودای لەبیر نەکردووە و خوداش قەد ئەو لەبیر ناکا.

پاشان هەواڵی دادە گەرشەی پرسی. شێرکۆ پێی گوت:

ـ دایکم پەتای گرتووە و لەبەر ئەوەی خەڵکی دیکە تووش نەبن، لە ژووری وەدەر نەکەوتووە.

لەو کاتەدا کە شێرکۆ و حاجی هەمزە بە دوو قوڵی دەدوان، لە دەرفەت کەڵکم وەرگرت و لە سەربان هاتمە خوارێ. داوام لە فرمێسك کرد بچێتە سەربان و داوای لێبوردن لە حاجی بکا، کە بە هۆی سەرقاڵییەوە نەیتوانیوە چاك و چۆنی لەگەڵدا بکا.

ـ بۆ ئەم کارە بکەم؟

ـ لەو پرسیارە گەڕێ جارێ، بەڵام کە دەچی بۆ لای زۆر بە لەنجەوە برۆ و لە گەڕانەوەشدا ڕێك و پێك خۆت بلەقێنە.

من گورج گەڕامەوە بۆ لای حاجی و شێرکۆ و لایان دانیشتمەوە. هێندەی پێ نەچوو کە فرمێسك بە پەیژەدا سەرکەوت و لەو سەری

بانەکەڕا تاکو لای ئێمە بە لەنجەیەکی جوان هاتە پێش. حاجی ڕوحی باریکرد و بە جارێك من و خودا و شێرکۆی لە بیر چوو. فرمێسك پاش بەخێرهاتن کردنی، داوای لێ بووردنی لێکرد و گوتی:

ـ سەرقاڵی پێشوازی لە پرسەگێڕان بوومە، بۆیە نەمتوانیوە بەخێرهاتننتان بکەم.

فرمێسك پاش وچانێکی کورت گوتی:

- دەبورن کە بەجێتان دێڵم و گەڕایەوە دواوە.

بە جوانی چاوم بڕیبووە حاجی، کە چۆن دەموچاوی لەگەڵ ئەملاو ئەولا کردن و بە لەنجە سوڕانی سمتی فرمێسك دا، وەك ڕەژەی سەرباز چەپ و ڕاستی دەکرد.

کاتی ئەوە هاتبوو کە حاجی و هاوڕێکانی بەرەو شار بگەڕێنەوە. بەرلەوەی لە سەربان بێینە خوارەوە، بە شێرکۆی گوت:

ـ دە تەخار زەویم پێشکەش بە شاسوار کردووە و ئێستاش کاتی زەوی کێڵانە. ئەوە لە نەبوونی شاسواردا هی خۆتە و کەسی لێ خاوەن نییە. هەرکات ڕێگات کەوتە شار پێکەوە دەچین و قەواڵەکەی بە ناوت دەکەین.

خەڵکەکە لە پیاسە هاتنەوە و ئێمەش بە تێکڕا تاکو گۆڕەپانی گوند بەڕێمان کردن. ئەوان چوونەوە و ئێمەش بەرەو ماڵ گەڕاینەوە، پاشان هەمووومان لە دەوری یەکتر کۆبووینەوە و هەرکەسە و بە جۆرێك لە ماندووبوونی خۆی دەدوا. هەر وات دەزانی لە بەرەی شەڕ گەڕابووینەوە. پاش کەمێك حەسانەوە، من و شێرکۆ لەگەڵ دادە گەرشە دانیشتین. ئەو بە ئیشارەی دەست و خوار و بانکردنی سەری، تێیگەیاندین کە حاڵی

باشه، ئێمەش تێمان گەیاند کە دەمانەوێ بیبەین بۆ نەخۆشخانە، بەڵام ئەو بە تێکدانی دەموچاوی دەریبڕی کە ڕازی نییە. پاش ئەوە پێشنیار کرا کە چەند ڕۆژێکی دیکە ڕاوەستین، بەڵکو ئالوگۆڕێکی بەسەر داد بێت.

بەدوای ئەوەدا دەفر و دۆڵە و کەلوپەلەکانی کە بە قەرز لە خەڵك وەرگیرابوون شۆران و درانەوە بە خاوەنەکانیان.

دەم دەمی ئێوارێ چایەکی خۆرەچەرخەمان خواردەوە و پاشان هەرکەسە و بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە، بێجگە لە دایکم و دادە خاسپەری کە بە چەند هۆ لای دادە گەرشە مانەوە.

بەرلەوەی من بگەڕێمەوە بۆ ماڵی خۆمان، فرمێسك بانگی کردم و پرسیارەکەی پێشووی دووپات کردەوە و پرسی:

- شوانە! لەبەر چی پێشنیارت پێکردم بچم بۆ لای حاجی هەمزە؟ بۆ دەبا بەلەنجە چووبام و هاتبامەوە؟

- ئێستا کاتی ئەوە نییە و بێگومان ڕۆژێکیان بە دووکەسی بین، پێت دەڵێم لەبەر چی بووە.

بە دوای ئەوەدا و تاکو حەوت ڕۆژەی شاسوار هات، خەڵکی ناسراو سەردانی دادە گەرشەیان دەکرد. منیش لەو ماوەیەدا چەند جارێك سەردانیانم کرد. بارودۆخی سلامەتی دادە گەرشە دەهات و باشتر دەبوو. ئەو زمانی کرابۆوە، بەڵام ڕابردووی لەبیر کردبوو، بە جۆرێك کە نەیدەزانی مانگێك پێشتر چ ڕوویداوە و خەڵکیشی نەدەناسییەوە. پاش تێپەڕبوونی حەوتووی شاسوار، دایکم گەڕایەوە بۆ ماڵ. بۆ بەیانی هەمان ڕۆژ دەنگۆ

هات که سوپای ئێرانی ئیسلامیی خەریکی خۆسازدانە بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکە، بەڵام کەنگێ و لە کوێوە ئاشکرا نەبوو.

ئێمە ئەو چەند کەسەی کە لێك نیزیك بووین، بەباشمان زانی کە دانیشتنێك بکەین و لەسەر هەڵوێستێك ساغ بینەوە.

من کە ئارادەیەك لەوانی دیکە هەڵسوڕتر بووم، بە مەبەستی کۆبوونەوەیەکی بەربلاو لەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو لە گەنجەکانی گوندەکانی دەوروبەر پێوەندیم گرت. بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆژی پێنجشەممە کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆمان دیاریکرد.

کاتی دیاریکراو هات و ئەو گەنجانەی کە ئاگادار کرابوون لەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاوی دیکەدا هاتبوون. بۆ خۆم چاوەڕوانیم نەدەکرد کە ژمارەیەکی ئاوا بەرچاو لە گەنجان و لاوان بەوشێوەیە بەشداری بکەن، بەڵام ڕاستییەکم لەبیر کردبوو. ئەویش ئەوە بوو کە هەر کەسە و چەندین هاوەڵ و هاوڕێیان هەبوو، کە لەگەڵ یەکتر دوابوون و گرتنی کۆبوونەوەیەکی ئاوایان بە قازانجی خەڵك زانیبوو.

لەو دانیشتنەدا زیاتر لە سەد و پەنجا کچ و کوڕی گەنج بەشدار بوون و ئێمەش نە گەڵاڵەیەکمان ئامادە کردبوو نە چاوەڕوانی ئەو بەشداریە زۆرە بووین، بێجگە لەوەش لە سیاسەتکردن دا نەك هەر قاڵ نەبووین، بەڵکو ئەوە هەست ویستەکان بوون کە بەرەو ئاسۆیەك هانیان دەداین، کە ئەویش نادیار بوو.

ئێمە بە کوڕ و کچەوە پێکەوە دانیشتبووین. هەموویان چاوەڕوانی کردنەوەی کۆبوونەوەکە بوون، کە لە پڕ وەنەوشی دایکم خۆی کرد بە

لاماندا. منیش ئەم کارەی دایکَمم بەباش نەزانی و بانگم کردە سوچێکەوە. پێم گوت:

ـ دایکە گیان! بۆ خۆت دەزانی ئەمە دانیشتنێکە کە تایبەت بە گەنجان و لاوانە. ئەتۆش تەمەنێکت لێ تێپەڕیوە و لەوانەیە بەشداریکردنت لە کۆبوونەوەیەکی وادا، لای هێندێکیان لەبار نەیەتە بەرچاو.

ئەو گوێبیستم نەبوو و پێی وابوو من لە هەڵەدام و گوتی:

ـ ئەگەر ئەم دانیشتنەی ئێوە سەبارەت بە تەنیا خۆتانە، ئەوە با پێشکەش بە خۆتان بێت و کەسیش بۆی نییە ڕێگرتان بێ، بەڵام ئەگەر سەبارەت بە چارەنووسی خەڵکێك بێ، ئەوە پێشنیار دەکەم خۆتان تووشی هەڵەکانی ڕابردوو مەکەنەوە. جا ئێستا ئەگەر ئەم دانیشتنە پێوەندی بە چارەنووسی خەڵکەوە هەیە، ئەوەدەم دەبێ، زۆر کەسی دیکەش بە ژن و پیاوەوە بەشدار بن. لەوانە سوارە سەرۆك ئەنجومەنی گوند، بەختیار، مامۆستا جوامێر و مام نەسۆر و چەند کەسێکی دیکەی خاوەن ئەزموون بەشدار بن.

ئەو بەوەشەوە ڕانەوەستاو گوتی:

ـ ئەوەت لەبیر نەچێ کە خەڵکی گوند ئامادە نابن چارەنووسی خۆیان بدەنە دەست کۆمەڵێك گەنجەوە کە دەیانەوێ بە دروشم و بەرزەفڕی کۆمەڵگایەکی هاوچەرخ دابمەزرێنن، چونکە لەوانەیە ئاکامێکی باشی بە دواوە نەبێ. هەربۆیەشە بەشدار بوونی ئەوانەی کە خاوەن ئەزموون و

ڕابردوویەکی خاوێنن، پێویستییەکی مێژووییە و نینکارکردنیشی سەری خۆ لەبەرد دانە.

من لە لایەکەوە غروری گەنجانە ڕێگای نەدەدام ئەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە قبووڵ بکەم، لە لایەکی دیکەوە ئەو هەموو گەنجە کۆ ببوونەوە و پاساوێکم بۆ نەبوو تاکو کۆبوونەوەکە وەدوا بخەم. هەربۆیەش پرسیم:

- ئەی چار چییە دایە؟

- ئەگەر دەرفەتم بدەنێ قسان بکەم، ڕێگا چارەم بۆی هەیە.

بەر لەوەی بەڵێنێکم بە دایکم دابێ، بانگی چنار، شێرکۆ، فرمێسك و کەژاڵم کرد، ڕا و سەرنج و پێشنیارەکانی دایکم بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش بە تێڕامانەوە گوتیان:

- با ڕێگای بدەین ئەو دەستپێکەری کۆبوونەوەکە بێ، چونکە لەوانەیە وانەیەکی بە کەڵکی پێبێ.

بە دوای ئەوەدا، چنار بەمجۆرە کۆبونەوەکەی کردەوە:

- بەشداربووانی بەڕێز! بەخێربێن بۆ ئەم دانیشتنە کە لە جۆری خۆیدا یەکەم دانیشتنی لاوان و گەنجانی دەڤەرەکەمانە. گەلێك خۆشحاڵ و بەکەیفین بۆ بەشداری بەرچاو و چالاکانەتان و سوپاستان دەکەین بۆ ئەو وەدەنگەوە هاتنەتان. ئێمە وەك دەستەی پێکهێنەری ئەم کۆبوونەوەیە، داوای لێبوردنتان لێدەکەین کە کۆبوونەوەکەمان هێندێك وەدوا کەوت. پێمخۆشە پێتان ڕابگەیەنم کە کۆمەڵێك پێشنیاری نوێمان بۆ هاتوون کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە کار و چالاکیی داهاتوومانەوە هەیە. لەم پێوەندییەدا، دادە وەنەوش کە ڕەنگە زۆربەتان بیناسن، چەند سەرنجێکی

هەیە کە دەیەوێ ئاماژەیان پێبکا. ڕاستە ئەو گەنج نییە، بەڵام بێگومان کۆمەڵێك ئەزموونی هەیە کە دەتوانن یارمەتیدەری ئێمە بن. بەجۆرە و بەو تێبینییە کە پێشکەشتان کرا، کۆبوونەوەکەمان بە وتەکانی دادە وەنەوش دەست پێ دەکا.

پاشان بە تێکڕا داوا کرا با دادە وەنەوش بفەرموێ. دایکم هاتە نێو ئاپۆرای ئێمە و بەجۆرە دەستی پێکرد:

ـ کوڕ و کچە لاوەکانم! بە دیدارتان گەلێك کەیف خۆشم. بڕوام پێ بکەن نازانم بە چ وشە و ڕستەیەك هەستەکانی لە گەروودا خنکێندراوم دەربڕم. ئێستا کە لێرەم و لەنێو ئاپۆرەی ئێوەدام، بیرەوەرییە تاڵەکانی دەیەکانی ڕابردووم دێنەوە بیر و تێکەڵ دەبن لەگەڵ ئەو هەستە بزوێنەر و ناسکەی کە دەروونمی داگرتووە. من نەهاتوومەتە ئێرە کە تاڵیی و ترشییەکانی ژیانی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە. بەو مەبەستەش نەهاتووم کە خۆم وەك زانا و بەئەزموون پێناسە بکەم. لەبەر ئەوەش نییە کە بناغەی مێژووی شۆڕشگێڕی بۆ خۆم تۆمار بکەم. بەشداری من چەند هۆی هەیە کە پەیوەندە بە ژیانی ئێوە و نەتەوەکەتان و وڵاتەکەتانەوە هەیە. ئێمە وەك کورد بەگشتی و گەنجان و لاوان بەتایبەتی، ڕووبەڕووی هەڕەشەیەکی ترسناك بووینەتەوە. دەسەڵاتێك کە ئێستا لەسەر حوکمە، بە چەکێك هاتووەتە گۆڕەپان، کە مەترسییە بۆ سەر بوونی ئێمە، چ وەك وڵات و کیانی نەتەوەیی و چ وەك گەل و پێکهاتە. ئەم چەکە گەلێك ژەنگاویترە لە چەکەکانی تر کە بە درێژایی مێژوو دا بە دژی ئێمە بە کار بردراون. ئەم چەکە نەك هەر حاشا لە بوونی گەل و نیشتمانمان دەکا، بەڵکو دەیەوێ

کولتور و کەلەپور و مێژووشمان بشواتەوە، بێجگە لەوانەش حاشای لە مرۆڤ بوونیشە وەك مرۆڤ و دەیەوێ مرۆڤەکان سەرلەنوێ دروست بکاتەوە، بەو جۆرەی کە بۆ خۆی دەیەوێ. ئەم سیستمە بەو ئایدۆلۆژیەوە کە هەیەتی، خوازیاری مردنە بۆ گەیشتن بە ژیانێکی خۆش. بۆ ئەم مەبەستەش مردوو پەرەستی و تازیە گرتن، ڕەشپۆشی و داسەپاندنی دواکەوتووترین نەریتەکانی سەدەکانی سەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵی دەرەبەگایەتی، کردۆتە پێشەنگی ئامانجەکانی. واتە موتەکەیەك کە بوونی خۆی لە نەمانی ئێمەماناندا دەبینیّ" بۆتە بنەمای یاسا بۆ پاساودانی هەموو چەشنە دڕندەیی و کاولکارێك. جێی ئاماژەیە کە نابێ بە هەڵە لێم تێبگەن. ئێمە دەبێ ڕێز لە گیان بەخت کردووەکان و مردووەکانی خۆمان بگرین، بەڵام نابێ مردوو پەرەستی بکەین. ئەرکی سەرشانی ئێوەیە کە بە ڕەچاوکردنی ڕێ و شوێن و ڕێبازی گونجاو لەگەڵ زانستی کۆمەڵایەتی، هەڵگری ڕێبازێك بن کە وەڵامدەرەوەی خواستەکانی ئەوڕۆی کۆمەڵی ئێمە بێ. ئێوە دەبێ بزانن کە سەرەڕۆیی و پاوانخوازی داگیرکەران گەیشتۆتە ڕادەیەکی ترسێنەر و ئەمەش بۆ خۆی گەلێك جێی مەترسییە. هەربۆیە پێتان دەڵێم کە بە دەستی خۆتان پەتی خنکاندنتان هەڵمەخەن. پێشنیاری دیکەشم ئەوەیە کە بەرزەفڕی مەکەن و بەمشووربن لەسەر ناکۆکییەکانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری. لە بیرتان نەچێ کە ئێمە زۆر جار گورزی پشتنەستور بوون بە بێگانەمان خواردووە. جا ئەوە چەپ و ڕاستیان وەك یەکە و بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان ئێمەیان دواندووە. هەڵگرتنی دروشمی بریقەدار و بێنێوەرۆك زامێك لە زامەکانی وەناسۆر کەوتووی ئێمە

سارێژ ناكات. هەر بۆیەشە هاتوومەتە ئێرە كە پێتان بڵێم، خەبات بۆ ڕزگاری تەنیا بە لایەنیك، چینێك یان توێژێكی تایبەتی ناكرێ و دەبێ گۆڕەپان بۆ تێكۆشانێكی جەماوەری لەبار بكرێ و ڕێز لە تاكەكان و بیروڕای جیاواز بگیرێ.

خۆشەویستەكانم! من لەوە زیاتر كاتتان لێناگرم. هیوام ئەوەیە كە ڕێگا و ڕێبازێك هەڵبژێرن كە ڕێگای گەل بێ و ڕزگاریی نەتەوەكەمانی لێبكەوێتەوە.

دایكم وتەكانی خۆی كۆتایی پێ هێنا و ملی ڕێگای بەرەو ماڵەوە گرتە پێش. وادیار بوو ئاخافتنەكەی ئەو، شوێنێكی قوڵی لەسەر بەشداربووانی كۆبوونەوەكە دانابوو. ئێمە كە بیرۆكەی سازدانی ئەو كۆبوونەوەمان دارشتبوو، پێشنیارمان كرد كە بەشداربووان بیروڕای خۆیان سەبارەت بە بەشداری باقی چین و توێژەكانی نێو كۆمەڵ بۆ دانیشتنەكانی داهاتوودا دەربڕن. چەند كەسێك دەستیان هەڵبڕیی، كە ناوەكانیان بۆ قسەكردن نووسران.

فرمێسك یەكەم كەس بوو لە ناوی نووسرابوو. ئەو هەستایە سەرپێ و بەمجۆرە ڕای خۆی دەربڕی:

ـ ئازیزان! لام وایە زۆربەمان كەم یان زۆر، یەكتر دەناسین و بە گرفتەكانی سەر ڕێگای ژیانیشمان دەزانین. ئەو تەوژم و گوشارە نەتەوەیی، كۆمەڵایەتی، ڕامیاری و ئابووریانە كە بە سەرشان و پیلمانەوەیە قورساییەكی لە كێشان نەهاتوون، كە ئێمە گەنجان تاكو ئێستا بەو جۆرەی كە هەیە هەستمان پێ نەكردووە. بێگومان كەس ئامادە نابێ تۆزقاڵێك

لەم قورساییەمان لەسەرشان کەم کاتەوە. ئەوە بۆ خۆمانین کە دەتوانین بە گژی نایەکسانیەکان دا بچینەوە. هیچکەس لە خۆمان دلسۆزتر نابینینەوە تاکو لە دەرد و ئازارەکانمان تێبگا. ئێمە نابێ هەڵەکانی ڕابردوو بە هێند نەگرین. مێژووی دوور و نیزیکی گەلەکەمان ئەوەی سەلماندووە، کە ئێمە لەڕادە بەدەر پشتمان بە دۆستایەتی بێگانە و زلهێزی سەردەم بەستووە. گەورەترین زەبرەکان بە دەستی خۆمان ویمان کەوتوون و گەورەکانی ئێمە نەیانتوانیوە پێشەڕۆژی بەسەرهاتی خۆیان و ئەو کۆمەڵەی کە تێدا ژیاون، هەڵسەنگێنن. هەربۆیە پێشنیار دەکەم، ئەگەر بڕیارە بمرین، با بۆ گەل و وڵاتی خۆمان و لە پێناو سەربەستی و سەربەخۆیی نیشتمانی خۆماندا بمرین. با ئەم کۆبوونەوە بکەین بە دەستپێکی تێکۆشانێك کە تەنیا پێوەندی بە نەهامەتی و بەش خوراوی خۆمانەوە هەبێ. هەروەك دادە وەنەوش لە وتەکانیدا ئاماژەی پێدان، دروشمدان و بە بەژن و باڵای ئەم و ئەودا هەڵگوتن، تۆزقاڵێك لە مەینەتیەکانی گەلی ئێمە چارەسەر ناکا. هیوادارم ئێمەش بە خۆماندا بچینەوە و دەرس لە ڕابردوو وەرگرین و چیدیکە لە بیری هێما و ئیلیت دروستکردن دا نەبین.

پاشان نۆرەی گەنجێك هات کە نێوی خۆی نووسیبوو. ئەو هەستا و بەجۆرە خۆی ناساند:

ـ من ناوم شەپۆلە و خەڵکی هیچ کوێش نیم. لەوانەیە لاتان سەیر بێ، بەڵام بە ڕاستی خەڵکی هیچ کوێ نیم. پێمخۆشە ئاگادارتان بکەم کە چوار ناسنامەم هەیە، کە لە چوار جێگای جیاواز و لە چوار وڵات دەرچوونە، کە بۆ خۆی یەك وڵاتە. بەشێك لەمانەی کە لەسەریان دەدوێم

بۆ خۆم نەمدیتووە تەنیا بیرەوەریەکانی دایك و بابمن. باوکم لە خۆرئاوای کوردستان لەدایکبووە و مرۆڤێکی کرێکار بووە. ئەو گەلێك شوێن گەڕاوە بە دوای ئیشوکاردا، تەنیا بۆ بژیوی ڕۆژانە. لەبەر ئەوەی کە کورد بووە، ناسنامەی پێ نەدراوە و تەنیا وەك هاوڵاتی عەرەب، لە "سوریا"، پێناسە کراوە. ئەو دانیشتووی شاری قامیشلییە و بە شوێن ئیشوکاردا پەڕیوەی باشور بووە و لەوێش ناسنامەی عێراقی لە شاری کەرکوك وەرگرتووە، چونکە ئەگەر نەبووایە بە عەرەب، ناسنامەیان پێ نەدەدا. پاش چەند ساڵێك چووەتە باکوور و لە شاری باتمان گیرساوەتەوە. دیسان لەوێش ناسنامەی تورکی وەرگرتووە، بەڵام مافی ئەوەشی نەبووە کە بە زمانی زگماکی بدوێ. لەو نەهامەتیانە کە بەرەوڕووی بوونەتەوە، دیسان سەری خۆی هەڵگرتووە و هاتۆتە ڕۆژهەڵات و لێرەش وەك دانیشتووی شاری کرماشان، ناسنامەی ئێرانی بڕاوەتە بەری. ئەو ئێستا بینایی خۆی لەدەست داوە و زۆریش بە گلەیی نییە لە گەلانی عەرەب و تورك و فارس. ئەو دەڵێ: گەلێك یان وڵاتێك کە لەلایان داگیرکەرانەوە حاشای لێ دەکرێ، ناسنامەی زۆرەملیشی بەسەردا دەبڕن و ئەمە لە گەلێك وڵاتی بەڵا لێدراوی دیکەش ڕەوتێکی باوە. ئەو زیاتر لەوە تورە و بە گلەییە کە براو خوشکە کوردەکانی لە باشووری وڵات پێیان گوتووە سورییەیی. لە باکور پێیان وتووە عێراقی، لە ڕۆژهەڵاتیش پێی دەڵێن تورکیایی و لێرەش ئێرانیە. بێشك ئەمە گەورەترین ستەمە کە لە ئێمە دەکرێ. ئەگینا ئێمەش وڵاتێکمان هەیە کە ناوی کوردستانە و بۆ خۆشمان کوردین. هیوادارم خوشك و برایانم لە مەبەستەکانم تێگەیشتبن. من پێمخۆشە

ڕاشکاوانەتر بدوێم و بڵێم، کە بە نەتەوە کوردم و خەڵکی وڵاتی کوردستانم. لەوەش ناترسم بە جیایی خواز و داردەستی بێگانە تاوانبارم بکەن. نەیارانی ئێمە سەدان ساڵە لیتکە و پیتکەمان بۆ هەڵ دەبەستن. ئەوان بە هەر هەموویانەوە، تاوانی ناڕەوامان دەدەنە پاڵ. بە جیایی خواز و شەڕخواز، کێوی و ڕام نەبوو بە دونیامان دەناسێنن، بەڵام قەت ئامادە نەبوونە و ئامادەش نابن بە خۆیان بڵێن چەندە پاوانخواز و شۆڤێنیستن. ئێستا کە خۆم لەنێو کۆڕی ئێوەدا دەبینم، گەلێک کەیف خۆش و سەربەستم.

ـ ئەوەی کە داگیرکەران و نەیارانی ئێمە پێی تاوانبارمان دەکەن و وەك خەیانەت لە یاسای گشتیی وڵاتەکانیان گۆنجاندوویانە، مافی ڕەوا و بێ ئەملاو ئەولای ئێمەیە.

ڕادەربڕینەکان گەلێك بەرز و هەست بزوێن بوون، بەڵام لام وابوو کە دایکم بوێرانە لەشینەکەی بەقەددا کردبوو و لەسەرەتادا کەش وهەوایەکی ئاوای بە کۆبونەوەکەمان بەخشی، ئەگەر چی تێکڕای بەشدار بووان ڕادەی خۆێندەوارییان لەسەر بوو و هەستیان بەو گوشارە لە ڕادە بەدەرە دەکرد کە لەلایان زۆردارانەوە لێیان کرابوو و دەکرا.

شەپۆل لێدوانەکەی بەم چەند وشەیە تەواو کرد:

ـ ئێستا کۆمەڵی ئێمە بەرەو ڕووی حاستەمێکە کە لە دوو ڕێگا زیاتری لەبەردەم نەماوەتەوە. یان دەبێ بەرخودان بکەین و خۆمان ڕزگار بکەین، کە ئەمە ویستی زۆربەمانە، یان دەبێ سەرشۆڕ بکەین و بەو جۆرە بژین کە داگیرکەر دەیەوێ.

بەدوای وتەکانی شەپۆل دا، کچێك هەستا و بەمجۆرە خۆی ناساند:

ـ من ناوم چیمەنە، خەڵکی شاری سەهەنەم کە دەکەوێتە سەرووی کرماشان. خوێندکاری ساڵی دووەمی زانستگەم لە بەشی زانستی کۆمەڵایەتی. من هاوڕێی فرمێسکم و بە بۆنەی کۆچی دوایی بابیەوە بۆ سەرەخۆشی هاتوومە ئێرە. خۆشحاڵ و سەربەرزم بە دیتنی ئەو پۆلە کچ و کوڕە گەنجانە و شانازی دەکەم بەو هەستە بەرزانەیان. من بە نەتەوە کوردم و بە ئایین سەربە یارسان. دەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئێمەش وەك کورد لەو ناوچانە، بە چەندین هۆ زەختی دووقاتمان لە سەرە. یەکەم ئەوەی کە کوردین وەك هەموو کوردێك کەوتووینەتە بەر پاکتاوی نەتەوەیی. دووەم ئەوەی کە چونکە موسوڵمان نین، نە ڕێگای خوێندنمان پێ دەدرێ و نە ڕێگای ئیشوکاریش. واتە بە پێی یاسای مەلاکان ئێمەمانان ناتوانین وەك موچەخۆری دەوڵەت ئیش بکەین، بێجگە لەوانەش ئێمە لە لایان خوشك و برا کوردەکانی موسوڵمانی خۆشمانەوە دەکەوینە بەر گازندە و زۆرجار بە کافر و خودانەناسیش ناودێرمان دەکەن و دەکەوینە بەر غەزەب و لۆمەی ئەوانیش. لە حاڵێکدا ئێمە وەك کورد، ئایینەکەمان کوردییە، کتێبە ئایینیەکەمان بە کوردییە، ڕاز و نیزەکانمان بە کوردییە و خوداکەشمان کوردە و لە کورستانیشە.

چیمەن وتەکانی خۆی بەم ڕستانەی خوارەوە تەواو کردن:

ـ هاوڕێیان! ئەگەرچی ئێستا کاتی ئەوە نییە کە من دەستنیشانی خاڵێك بکەم کە بۆتە هۆی دوورەپەرێزیمان لە یەکتر، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هێنانە گۆڕی بە پێویست دەزانم. ئەوەش ئەوەیە کە نەیارانی ئێمە

توانیویانه ڕیزەکانی ئێمه وەك نەتەوەیەك تێك بدەن. ئەوان به گرینگیدان به ئایین، هەستی نەتەوەیی ئێمەیان خستۆتە پەراوێزەوە و بەجۆرە ئێمەیان لەبەرانبەر یەکتردا ڕاگرتووە. ئێستاش ئەرکە نەتەوەیی و نیشتمانیەکانمان ئەوەمان پێ دەڵێن که به هەستکردن به بەرپرسایەتییەوە لەگەڵ ئەم دیاردەیه هەڵسوکەوت بکەین و نەهێڵین نەیاران چی دیکه له ئاوی لیڵ ماسی بگرن و ڕیزەکانمان لەوە زیاتر تێك بدەن. ئێمه هەڕەشه نین بۆ سەر هیچ وڵات و نەتەوە و ئایینێك و نابێ ئیزنیش بدەین کەس هەڕەشه له ژیان و وڵاتمان بکا. کەوابێ نابێ و ناشکرێ چی دیکه خۆمان به بەشێك له هاوڵاتی ئەم یان ئەو نەتەوەی داگیرکار بزانین. با ڕوون و ئاشکرا بڵێم، ئێمه نه خەڵکی ئێران و تورکیاین و نه ئێراق و سوریاش. ئێمه کوردین و خەڵکی کوردستان و دەبێ واش پێناسەی خۆمان بکەین. جا ئەوە چ له ژوورەوە له نێوخۆی وڵات بێ یان له هەر شوێنیکی دیکه. ئەوە ئەرکی نەتەوەییمانه که بەو جۆرەی که هەین، خۆمان پێناسه بکەین. کاتێك ئێمه به خۆماندا نەچینەوە و خۆمان بەو جۆرەی که هەین نەناسێنین، ناتوانین گلەییش له خەڵکانی دیکه بکەین که بۆ ئاوا پێناسەمان دەکەن. کەوابێ ئێمه کوردین و کوردستانی، نه وشەیەك کەم و نه زیاد.

پاش وتەکانی چیمەن، تا دەهات کۆڕەکەمان گەرمتر دەبوو. من دەبا به جۆرێك کۆتاییم به کۆبوونەوەکە هێنابا، چونکه پێشنیارەکەی دایکم لەمەڕ بەشدارکردنی زۆربەی خەڵکم له بیر بوو. زۆر کەسی دیکه دەیانویست ڕا و بۆچوونی خۆیان دەربڕن، بەڵام به پێشکەشکردنی ئەم پێشنیارە، کۆتاییم به کۆبوونەوەکە هێنا:

ـ خۆشەویستان! بەشداریکردنی چالاکانەتان جێگای پێزانینە. بۆ ئەوەی نەکەوینە بەر ڕەخنە و باشتریش خۆمان ڕێکخەین، دەبێ کۆبوونەوەکەمان بۆ ماوەیەك وەدواخەین. مەبەست لەو وەدواخستنەش هەر وەك لە ڕادەربڕینەکانی خۆشتاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەیە کە بوارێك بڕەخسێنین بۆ هەرچی زیاتر بەشداریکردنی هاوڵاتیان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، بێجگە لەوەش ئێمە ناتوانین کایە بە چارەنووسی نەتەوەکەمان و وڵاتەکەمان بکەین. ناکرێ ئێمە بیر و بۆچوونەکانی خۆمان بکەینە پەیمانەی هەموو ئاڵوگۆڕێك، بەتایبەت کێشە ڕامیاریی و کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام لەسەر کورد و کوردستانی بوونمان، هیچ چەشنە دڕدۆنگی و دوودڵییەکمان لەگەڵ هیچ لایەنێك لەو لایەنانە نابێ، نە ئێستا و نە هیچ کاتێکی دیکەش.

لە کۆتاییدا جێگا و کاتی کۆبوونەوەی داهاتوومان دیاری کرد و بەشداربووان هەرکەس بە لایەکدا بڵاوەیان لێ کرد. بەدوای ئەوەدا لە شێرکۆ، فرمێسك، چنار، چیمەن، کەژاڵ و شەپۆلم گێڕاوە تاکو بۆ ئێوارێ میوانی ئێمە بن. ئەوان بە تێکڕا قبوڵیان کرد و هەموومان پێکەوە هاتینەوە بۆ ماڵێ. بە گەیشتنەوەمان بۆ ماڵ، چنار و شێرکۆ شێوێکیان بۆ ئێوارێ لێنا. پاش خواردنی شام، دایکم پێشنیاری کرد کە بنێرین بە دوای سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەنی دێ، واتا سوارە، بەختیار و کامەران دا، بێجگە لەوان، دەبێ بانگهێشتی مامۆستا جوامێر، مامۆستا هێدی و مامۆستا ساماڵ، مامۆستای قوتابخانە، و مام نەسۆر کە یەکێك لە بە ئەزموونترین دانیشتووانی گوند بوو بکەین. لە ماوەیەکی کورتدا

هەموویانمان ئاگادار کردەوە کە بۆ کاتژمێر هەشتی ئێواریێ لە ماڵی وەنەوش چاوەڕوانیان دەبین.

بۆ کاتی دیاریکراو هەموو ئەو کەسانە کە بانگهێشت کرابوون کۆ بوونەوە. لەپێشدا سەر و پیاڵە چایی خوراوە و پاشان باسەکانمان دەست پێکرد.

لەو دانیشتنەی ئەو شەوەدا و پاش زیاتر لە پێنج کاتژمێر ئاخافتن و ئاڵوگۆڕی بیروڕا، لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێك کەوتین:

ئەلف ـ کۆبوونەوەیەکی بەرین پێك بێنین کە نوێنەری هەموو چین و توێژەکانی نێو کۆمەڵگای ئێمەی تێدا بەشدار بێ.

ب ـ لەو کۆبوونەوە بەرینەدا، هیچ کەس بۆی نەبێ بیروڕای خۆی بەسەر کەس دا بسەپێنێ.

پ ـ بەشداربووان بتوانن بیروڕای خۆیان دەربڕن بەبێ ئەوەی بکەونە بەر تانە و توانج، یان بخرێنە پەراوێزەوە.

ت ـ کێشەی کورد و دراوسێیەکانی وەك کێشەیەکی گشتی پێناسە بکرێ، نەك بە جیاجیا و تایبەتی. مەبەست لەم پێناسە گشتیە ئەوە بوو کە کێشەی کورد یەکە و دابەش نەکرێتە سەر چەندین بەش دا.

ج ـ بۆ ناودێرکردنی بەشەکانی کوردستان، لە وشەکانی باکوور، باشوور، ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کەڵك وەربگیرێ.

مام نەسۆر ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لەو دانیشتەنەدا، چونکە ئەو گەلێك دەربەدەریی و چەرمەسەریی کێشابوو، بێجگە لەوەش خاوەنی ئەزموونێکی بەنرخ بوو کە بە قیمەتی ژیانی بە هەزاران هەزار مرۆڤی

کورد تەواو ببوو، یەکێك لەوان بنەماڵەی خۆی بوو. لە کۆتاییدا مام نەسۆر بە دەربڕینی ڕای خۆی لەسەر چۆنیەتی ژیانی بە سەربەستی ئاوا دوا:

ـ خەڵکینە! بە باوەڕی من ژیان بە تەواوی شێوەکانییەوە خەباتە. بەرخۆدان بۆ وەدەستهێنانی بژێوی، کە خۆی لە ئیشوکاردا دەبینێتەوە. خەبات لەگەڵ نەداری و هەژاری، لەگەڵ ساردی زستان و توڕەیی سروشت، بەگژداچوونەوەی زۆرداری و ملهوری بۆ وەدەستهێنانی مافی زەوتکراو. بۆ چاکسازی و گوزەرانی باش، بۆ سەربەستی و ڕزگاری. مرۆڤ لەو کاتەوەی کە بوونی هەبووە تێکۆشاوە بۆ ئەوەی بژی وبە ئاسودەش بژی. مرۆڤەکان لە زۆر قۆناغدا بۆ ئەوەی خۆیان بژین، ژیانیان لە هاوڕەگەزەکانی خۆیان تاڵ کردووە و ژیان و گیانیان لێ ئەستاندون. گیانلەبەرەکانی دیکەیش هەر ئەم کارە دەکەن، بەڵام جیاوازییەك کە لێرە بەزەقی دیارە ئەوەیە کە گیانلەبەرەکانی دیکە بۆ تێرکردنی زگی خۆیان ئەم کارە دەکەن. لە حاڵێکدا ئێمە کە خۆمان بە مرۆڤ ناودێر دەکەین، لەو پەڕی تێر و تەسەلیش دا ، هەر برسین و کارەسات دەخولقێنین.

مام نەسۆر درێژەی داو گوتی:

ـ پێکهاتنی سروشت بۆ خۆی نایەکسانە. نایەکسانی لە سروشت دا هێندە زەق و بەرچاوە کە لە گێڕانەوە نایە. هەر لە گۆی ئەم زەوییە کە ئێمەی لێ دەژین، کەش و هەوا لە هەموو جێگایەکی وەك یەك نین. لە هەندێك وڵات خەڵك لە گەرما دەمرن و لە وڵاتێکی دیکە لە سەرمادا ڕەقیان دەباتەوە. لە هەندێك وڵات بە ساڵێ جارێ بارانێك نابارێ، بەڵام لە

گۆشەیەکیتر چوار وەرزی ساڵ باران و بەفرە و سێڵاو گیان لە هەزاران کەس دەستێنێ. چواردەوری گەلێك لە وڵاتان بە ئاو گیراوە، لە پارچەیەکی دیکە ئاوی خواردنەوە دەکڕن. هەر لەبەر ئەوەشە کە کاتێك مرۆڤەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ئایینیان دروست کردووە" خەڵکیان دابەش کردۆتە سەر چەندین دەستەدا. لە سەرەوەی هەمووان خودا دادەنیشێ و خاوەنی هەموو بڕیارێك دەبێ. پاش خوداش ناردراوەکانی دەبنە بڕ و بکوژی سەر ئەم گۆڕەپانە. ئەوجار هەر بە پێی ئەو نایەکسانییە، قەشە و کاردینالەکان، شێخ ومەلاکان، کاکی و سۆفی و سەیدەکان، گێرەکە دەگێڕن. ئیتر با ئاغا و دەرەبەگ و میریش بەو بانەوە بمێنێ. ئێستاش مادام ئاخافتنەکەم لەسەر خەباتە، دەبێ ئەوەش ڕوونکەمەوە کە خەباتی ئێمە گەلێك دژوارە. دژوارە چونکە دەبێ هاوکات لە چەندین بەرەدا بەربەرەکانی بکەین. لەوانە، خەبات لەگەڵ زۆرداری و داگیرکاری، لەگەڵ سەرەڕۆیی و نایەکسانی، لەگەڵ کۆنەپارێزی و نەزانی، لەگەڵ نەخوێندەواری و دیاردە نامرۆڤایەتی و دواکەوتووییەکانی کۆمەڵایەتی، بێجگە لەمانەش خەبات بۆ وەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانی نەتەوەیی کە لە چەندین لاوە کەوتۆتە بەر هێرشی ڕەگەزپەرستانەی سێ کولتوری بە تەواوی لێك جیاواز، بێجگە لەوانەی کە باسم کردن و بەراتی بێگانەن، دیاردەیەکی دیکەش کە کۆمەڵی ئێمەی بەرەوهەڵدێر بردووە و خۆمانمان لێ گێل کردووە، دیاردەی خێڵایەتییە. ئەم مۆتەکەیە گەورەترین زەبری لە بزاڤی نەتەوایەتی ئێمە وەشاندووە. هەرچەند ئەم دیاردەیە بەرەو لاوازی چووە، بەڵام هێشتاش مەترسییە بۆ سەر کیانی ئێمە. هەربۆیە داواتان

لێدەکەم بە پێداچوونەوەیەك بە مێژوودا و بە هەڵسەنگاندنی ڕووداوکانی سەدەی ڕابردوودا، ئەوجار لەسەر بنەمای زانستی سەردەم و ویستی گەل هەڵویست بگرن و دروشم هەڵگرن. بۆ وەبیرهێنانەوە پێمخۆشە ئەوەش بڵێم کە بەبێ بەشداری چالاکانەی ئافرەتان، گەنجان، ڕۆشنبیران، کاسبکاران و هەموو چین وتوێژەکانی نێو جەرگەی کۆمەڵگا، سەرکەوتن دەستەبەر نابێت و هەر خەبات و تێکۆشانێکیش ئافرەت خۆی تێدا نەبینێتەوە و چالاکانە بەشدار نەبێ، لە بنەڕەتدا هەوڵ دان بۆ یەکسانی دەبێتە وشەیەکی بێ ناوەرۆك و هەوڵێکی نەزۆك.

پاش کۆتایی هاتنی وتەکانی مام نەسۆر، مامۆستا جوامێر سوپاسی مام نەسۆری کرد و ڕای خۆی بەمجۆرە دەربڕیی:

- بەڕێزان! من نامەوێ وتار بخوێنم و ناشمەوێ خەڵك فێری دینداری بکەم، بەڵام مادام ناوی ئایین هات و وەك بەشێك لە گرفتەکانی کۆمەڵی ئێمە قامکی لەسەردانرا، پێویستە ئەوە بزانین کە هەموو ئایینەکان چ چووکە و چ گەورە، دروستکراوی دەستی مرۆڤن. ئەوانەی کە ئەمڕۆکە ئێمە لێیان دەپاڕێینەوە و داوای شەفا و چاك بوونەوەیان لێ دەکەین، مرۆڤێك بوونە وەك ئێمە. ئەوان توانیویانە بە بلیمەتیی و لێهاتوویی خۆیان، کەڵك لە ساویلکە بوون و دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی خەڵکان و تەما وەبەر نان لە بۆ ژیانی خۆشتر، سیاسەتی داگیرکاری پەرە پێبدەن. ئێستا داگیرکاریی بۆتە پیشەیان و کێشی کەسایەتی خۆیان داوە تاکو لێواری پەرستن و کڕنۆش بۆ بردن. تاقیکردنەوە دەریخستووە کە مرۆڤەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان و درێژەدان بە ژیان، هەلومەرجیان

هەڵسەنگاندووە و بۆ ئەم مەبەستەش لە هەموو پیلانێك کەلکیان وەرگرتووە. نەیاران بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش لە قەڵاچۆکردن و کوشت و بڕەوە بگرە تا پاکتاوی ڕەگەزی و داسەپاندنی کولتوری خۆیان لە ڕێگای توندوتیژییەوە، کە یەکێك لە شێوەکانی بەچۆك داهێنانی گەلانی دیکە بووە، لە هیچ چەشنە تاوانێك خۆیان نەپاراستووە. کەوابێ هەموو نووسراوەیەکی مێژوویی، مێژوو نییە و ناکرێ هەمووشی جێگای باوەڕ پێکردن بێ. کاتێك داگیرکەران بە لەشکرکێشی هێرشیان کردە سەر وڵاتی ئێمە و داگیریان کرد، بەهۆی خۆڕاگری باب و باپیرانمانەوە بە سەدان و هەزاران کەسیان لێ کوژراوە. لە سەردەمی ئەو داگیرکارییەدا، زۆرن داگیرکەرانێك کە لێرە و لە شەڕدا، بە دەست باب و باپیرانی ئێمە کوژراون. کە چی ئێستا مەزاری ئەو داگیرکارانە بۆ ئێمەمانان بوونەتە ئیمام و دەیانپەرستین و سوجدەیان بۆ دەبەین!؟ وێنەی لەم گومبەز و بارەگانە لە کوردستان دا زۆرن کە ناوهێنانی هەموویان لە توانای من دا نییە. کورت و کورمانجی، ئێمە لە بێگانە پەرستی و لاساییکردنەوەی کولتوری بێگانەدا، سەرسواری گۆڕەپانین. تا عەرەبان بوون کوژراوەکانیان بوونەتە ئیمامان. تا تورکان بوون پێشقەراوڵی لەشکریان بووین لە بۆ قەڵاچۆی بێدەستکەوت. تا فارسانن بە دەهۆڵ و زوڕنای کوورش و داریووش و سەفەوییان هەڵدەپەڕین. ئەوانەی مام نەسۆر باسی کردن ڕاست و ڕەوان وایە، بەڵام ئەوەی من دەمەوێ ئاماژەی پێ بدەم و لاشم زۆر گرینگە، ئەوەیە کە ئێمە دەبێ بەر لە هەموو شتێك لاوازیەکانی خۆمان دەستنیشان بکەین، تاکو بتوانین لە ڕابردووی نوشستەکان و

سەرثەکەوتنەکانی خۆمان ئەزموون وەربگرین. گەر هاتوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییانەدا کە لەگەڵیان بەرەوڕووین، نەتوانین بە خۆماندا بچینەوە، هەوڵەکانمان بۆ خۆڕێکخستن و گەیشتن بە مافەکانمان بێ ئاکام دەمێننەوە. هەرکات بە بیانووی پڕ و پووچ هەڵنەپرژاینە یەکتردا و ئامادە بین پێکەوە دانیشین و گوێ لە ڕا و بۆچوونەکانی یەکتر بگرین، ئەوە قۆناغی حاستەمی خەباتمان تێپەڕاندووە. هەرکات ڕادەربڕینەکانمان زمان حاڵی زۆربەی خەڵکەکەمان بێ، ئەوە قۆناغی دووەمی تێکۆشانمان بڕیوە. هەرکات هەستی نەتەوەیی زاڵ بوو بە سەر دەمارگرژیی ئایینی، ئایدیۆلۆژی، خێڵایەتی، بەرژەوەندی تەسکی ڕێکخراوەیی و خۆبەزلزانی دا، ئەوە گەیشتۆینەتە لوتکەی بەرزی شارستانی و سەرکەوتنیش نەك هەر مسۆگەر دەبێ، بەڵکو پێناسەیەکی کۆمەڵی نێودەوڵەتیش لەگەڵ خۆی دێنێ. ئەو دەم دەتوانین داوا بکەین کە سەروەری نەتەوەیی ئامانجی ئێمەیە و کەلێنێکی دیکە نامێنێتەوە کە نەیاران خۆی تێ خزێنن. من چی دیکە سەرتان نایەشێنم و سەرکەوتنتان لە ڕێگای خزمەت بە گەل و نیشتمان دا بۆ بە ئاوات دەخوازم.

بەدوای وتەکانی مامۆستا جوامێردا، کاك سوارە سەرۆك ئەنجومەنی دێ، لێدوانێکی کورتی بەجۆرە دەست پێکرد:

ـ لام وایە هەموومان لەوە تێگەیشتین کە لەمەو دوا چۆن هەڵوێست بگرین، بەڵام ئەوانەی کە ئەمشەو باسیان لێوە کرا، هێشتا نەبوونەتە هزر و بیر لەنێو کۆمەڵانی خەڵك دا. هەر بۆیە، پێشنیار دەکەم کە ئەم باس و لێکدانەوانەی ئەمشەو بکرێن بە کتێبێك بۆ بڵاوکردنەوە. لەو کتێبە دا

زیاتر جەخت لەسەر مافەکانی گەلی ئێمە وەك نەتەوە و نیشتمان بکرێتەوە و ئامانجیش ئەوە بێ کە هزر و بیری کوردان بۆ باوەڕ بەخۆ بوون و پێکهێنانی کیانی سەربەخۆ بەرێتە سەر. من وەك خۆم ئامادەم تەواوی خەرجی زەحمەت و چاپکردنەکەی وەئەستۆ بگرم.

پێشنیارەکەی سوارە پشتیوانی باشی لێکرا و مامۆستا جوامێر بەڵێنی دا ئەرکی نووسینی وەئەستۆ بگرێت و مام نەسۆریش ئامادە بوو تەواوی ئەو زانیاریانەی کە وەك توێشوو لە پشتی بوون، بۆ مامۆستا جوامێر بگێڕێتەوە، تاکو ئەویش بیانهێنێتە سەر لاپەڕە.

بەدوای سوارەدا، مامۆستا کامەران بە نوێنەرایەتیی لە لایان مامۆستاکانی قوتابخانەوە بەڵێنی دا کە ئەوانیش لە قوتابخانەکانەوە دەست پێ بکەن و لە جیاتی فێرکردنی قوتابیان بە مێژووی سەفەوی، عوسمانی و قوڕەیشییەکان، مێژووی کوردستان و کوردیان بۆ بکەنە وانە. ئێمە زۆربەمان ماندوو بووین و بە گشتی سەرقاڵی پلانێك بووین کە چ بکەین تاکو وەك ڕابردوو ڕەنجمان بە فیڕۆ نەچێ.

دایکم کە دیار بوو زەختی خوێنی چووبووە سەر، وشەکانی لە زاری مامۆستا کامەران گرت و گوتی:

ـ من سەربەستم بەو هەستە خاوێن و بێگەردانەتان. ڕێگام بدەن منیش بە بەشی خۆم ئاماژە بە بابەتێك بکەم کە زۆربەی کۆمەڵگاکانی ئەم سەر گۆی زەوییە هەریەکە و بە جورێك گیرۆدەی بوونە. ئەگەر جوانم لە بیر بێت و بە هەڵەدا نەچووبم، مامۆستا جوامێر ئیشارەتی پێدا، بەڵام نەچووە نێو ناخی بابەتەکەوە. لام وایە کۆمەڵگا لە هێندێك بواردا

گەشەی کردووە و پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە، بەڵام لە هێندێ بوار دا بۆ دواوە گەڕاوەتەوە. بەتایبەتی لە بواری کولتوری و کەلەپوریدا. من کە هێشتا تەمەنیشم زۆر نییە، بەڵام لەبیرمە کە لە دوو سێ دەیەی ڕابردوودا کچان و کوڕان پێکەوە دەمەتەقەیان دەکرد" بەبێ ئەوەی لە لایەن کەسوکار و بنەماڵەکانیانەوە تووشی گرفت ببنەوە. لە ڕەشبەڵەکەکاندا پێکەوە دەستیان دەگرت و شاییان دەگێڕا. لە شەونشینیەکاندا کچ و کوڕ پێکەوە گەپیان دەدا و لە ژیانی خۆش دەدران و بگرە کار دەگەیشتە گاڵتە و جەفەنگ. کەچی ئێستا جیاوازی لەنێوان ئافرەتان و پیاوان دا، گەیشتۆتە لوتکە، بەرد و دار و دیوار پەرستین کە بە سەدان ساڵ لە مەوبەر باو بوو، بە شێوازێکی نوێ جێگای پڕکراوەتەوە و بە ئاستێکی ترسناکدا دەچێتە پێش. سەردەمانێك مرۆڤەکان بۆ خۆیان لە دار و لە قوڕ خودایان دروست دەکرد و کڕنۆشیان بۆ دەبرد، بەڵام ئێستا بێجگە لە کڕنۆشبردن بۆ دار و دیوار، گومبەز و بارەگا، پەڕۆی سەوز و کاغەزی ڕەش کراوە، دەسەڵات پەرستی و گۆڕ پەرستیش بوونەتە پێخۆری ڕۆژانە. کەسایەتیی بەشێك لە مرۆڤەکان وا بەرز کراوەتەوە کە لە مرۆڤایەتی باش تێناگەن و توسقاڵێکیش خۆیان بە ئەندامی ئەو کۆمەڵە نازانن. هەر ئەم کۆمەڵە هێندە خۆی لە بەرانبەر ئەم دەسەڵاتدارە سەرەڕۆ، بەڵام لە هەموو شتێك بێخەبەرانە بە سووك و بێبایەخ دەبینێ، کە هەر وابزانە زانستی کۆمەلایەتی هەر ئەمرۆ و بە دەستی ئەوان بەردی بناغەی دانراوە. ئێمە وەك نەتەوەیەك دەبێ بۆ پاراستنی مافەکانی بێ ئەملا و ئەولای خۆمان لەو جۆرە کڕنۆشبردنانە خۆ بپارێزین. ئەو جۆرە

کڕنۆشبردنانەی تا ڕادەی پەرستنی مرۆڤ، دەبێ لە کۆمەڵی ئێمەدا خۆی نەبینێتەوە. گەلێك هاسانە ڕێبەری نەتەوەی خۆتت خۆش بوێ، بێ ئەوەی بگاتە ڕادەی پەرستن. زۆر سانایە هەڵکەوتوویەك، بلیمەتێك، هونەرمەندێك، داهێنەرێك، خەباتکارێکی نەتەوەکەت و نەتەوەکانی دیکەت خۆش بوێ، بێ ئەوەی بیپەرستی و کوڕنۆشی بۆ بەری. تا لەم سەردەمەدا کە گەل و وڵاتی ئێمە ڕووبەڕووی سێ دیاردەی مەترسی دارن. ئەم دیاردانە ستراتیژین و پلان و گەلاڵەی لەپێشدا داڕێژراوی بۆ دانراوە. یەکەمیان پاوانخوازی نەتەوەی دەسەڵاتدارە، کە لەژێر دروشم و پڕوپاگەندەی پاراستنی تەواوییەتی خاکی وڵاتدا، مافەکانی نەتەوەیی ئێمە وەك بەشێك لە ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان پێناسە دەکەن. ئەوان بەجۆرە بۆ سڕینەوەی مافەکانی ئێمە، تیۆری دادەتاشن و بە پلان و گەلاڵەی لەپێشدا ئامادە کراو حاشا لە هەبوونمان دەکەن. دووەم: تیۆری هێزەکانی بەناو چەپن کە گوێی خەڵکیان بە دروشمی زریقە و بریقە داری یەکسانیی و یەکڕەنگیی کەڕ کردووە. ئەوانیش مافە نەتەوەییەکانی ئێمە هێندەی دیکە دەبەنە ژێر پرسیارەوە و دەیانەوێ هەموو کێشە نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، ڕامیاری، کولتوریو... هتد، لە ژێر هێژموونی خەباتی چینایەتیدا چارەسەر بکەن. واتە کرێکارانی دونیا ڕێکخەن و هەموو دونیاش لە ژێر ڕکێفی ئەواندا بە هەموو مافەکانی خۆیان بگەیەنن. لە حاڵێکدا هیچ گەلاڵەیەکیان بۆ چارەسەری کێشە نەتەوایەتییەکان و یەك لەوان نەتەوەی ئێمە نییە. ئەم دوو شێوازە کە باسم کردن تەنیا لە شێوەی تاکتیکی دا جیاوازییان هەیە. ئەگینا وەك ستراتیژی، هەردووکیان دوو

ڕووی دراوێکن. یەکەمیان ڕەگەزپەرست و تەواوێخوازە، دووەمیشیان پاوانخواز و تەواوێخوازە. ئەو دوو ئایدۆلۆژییە نە باوەڕیان بە ڕزگاریی گەلان هەیە و نە بە مافی تاك و كۆمەڵیش. دیاردەی سێیەم: هەڵگرانی بیر و باوەڕی ئایینی بە ناو ئاسمانیی خودان. ئەوان دەیانەوێ هەموو موسوڵمانانی دونیا ئاشت بکەنەوە و یەکسانییەك دروست بکەن کە وێنەی لەسەر زەویی نەبێ. بە بیر و بۆچوونی ئەوان، مرۆڤ هەر لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونییەوە، بۆی دیاریکراوە کە چۆن بژی. واتە باسکردن لەسەر مافی نەتەوەیی دەبێ لە خشتەی ئایین دەرنەچێ. دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم کە دەستی دیاردەی سێیەم گەلێك ئاواڵەترە بۆ قەڵاچۆکردن و لەنێوبردنی هەر داوایەکی ڕەوا. ئەوان زۆر بە سانایی تاوانی کردەوە دڕندانەکانیشیان وەپاڵ خودا و نێردراوکانی دەدەن و بەجارێك خۆیان دەگەیەننە پاڵێوی پێغەمبەرەکانیان. ئەوەی ماوەتەوە بڵێیم ئەوەیە کە ئەم سێ ئایدۆلۆژییە یەك پەیام و یەك ڕاسپاردەیان بۆ ئێمەی کورد پێیە، ئەویش درێژەی داگیرکاری و ئینکارکردنی ماف و ویستەکانی گەلی ئێمەیە. هەر بۆیە دەبێ ئێمەش لە تەواوی قەرزە کۆنەکانی یەکتر خۆش بین و بە یەکگرتوویی و یەك هەڵوێستی پێیان بسەلمێنین، کە ماف وەردەگیرێ، نە دەبەخشرێت و نە دەشدرێ.

بەدوای وتەکانی دایکم دا، سوارە پێشنیاری کرد کە بانگەواز لە خەڵك بکرێ بۆ ئەوەی خەڵکانی زیاتر لە کۆبوونەوەی داهاتوودا بەشداریی بکەن. ئێمە لە ئێوارەوە دانیشتبووین و بەگشتی ماندوو بووین و پێویستمان بە حەسانەوە بوو. مامۆستا سامان و سوارە، مام نەسۆریان بردەوە بۆ

کەلاوەکەی خۆی و ئەوانی دیکەیش ماڵئاواییان لێکردین. ئێمەش هەرکەسە و سەر و لێفە و مەوجمان بە خۆماندا داو نووستین. کاتێك لە خەو هەستاین ڕۆژگار دامەزرابوو. سەر و پاروو نانمان خوارد و پاشان پیاسەیەکمان بە قەراخی دێدا کرد. ئەوجار لەسەر کانییەکەی پشتی ئاوایی دانیشتین و سەر و گۆمەل ناومان خواردەوە. لەو دەرفەتە کەڵکمان وەرگرت و لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە دوو کەس دیاری بکەین بۆ بەڕێوەبەری کۆبوونەوە گشتییەکەی داهاتوو. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکە فرمێسك و شەپۆل پێشنیار کران، کە بە تێکڕای دەنگ پەسەند کران، بێجگە لەوەش رامان دانا کە چوارچێوەیەك بۆ لێدوان و وتە پێشکەشکردن دابنرێ، واتە هەر کەسە بتوانێ لە کەمتر لە چارەکە سەعاتێکدا بیروڕا و پێشنیارەکانی پێشکەش بکا. لەسەر ئەوەش ساغ بووینەوە کە سوارە، سەرۆك ئەنجوومەنی دێ، کۆبوونەوەکە بکاتەوە.

چیمەن کە بۆ یەکەمجار بوو سەردانی ئەم ناوچەیەی دەکرد، حەزی لەدەکرد بەرەو ماڵەوە، واتە بۆ نێو گوند بگەڕێینەوە. پێشنیاری کرد کە دوو کەس بچن لە دوکانی دێ شت و مەکی خواردەمەنی بکڕن و لەسەر سەراوی کانییەکە چایەك دەم بکەین.

پێشنیارەکەی پێشوازی لێکرا و چنار و شێرکۆ ئەو ئەرکەیان وەئەستۆ گرت. ئێمەش دەستمان کرد بە دار کۆکردنەوە و کوانوویەکمان دروست کرد کە لە سێ بەرد پێکهاتبوو. چیمەن دوورتر لە ئێمە لەسەر بەردێك دانیشتبوو، چووبووە ناخی سرۆشتی دڵڕفێنی ناوچەکەوە، پاشان هەستا و هات بەرەو لای ئێمە و چاوێکی لە کوانووەکە کرد. بەبێ ئەوە هیچ بڵێ،

بەردێکی هێناو کوانووەکەی کرد بە چوار بەردی. من کە ئەزموونی ئاگرکردنەوە و کوانوو دروستکردنم لەوانی دیکە زیاتر بوو، پێم گوت:

ـ تا ئێستا کوانگی چوار بەردیم ساز نەکردووە.

چیمەن کە گەلێك لەسەر دڵان بوو زۆر بە هێمنی، گوتی:

ـ تا ئێستا سازت نەکردووە، بەڵام ئێستا دەتوانی بیبینی.

ئەو کە دیار بوو بە مەبەستەوە دەدوا، هاتە جواب و گوتی:

ـ کاکی برا! کوانوویەك کە لە چوار بەرد پێك بێ، لە چوار لاوە داری پێوە دەنرێ و ئاگرەکەی بەتینتر دەبێ، بەڵام لە کوانووی سێ بەردیدا دەرفەتی بەتینتر بوونی ئاگرەکە کەمترە، بێجگە لەوەش ئەم کوانووە چوار بەردیە مانایەکی دیکەیشی بۆ من تێدایە. ئێوە ڕۆژێك لە ڕۆژان دانیشتوون و بیرتان لەوە کردۆتەوە کە لە زۆربەی کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا و بگرە ئەوانەش کە خەباتکارن، تەنیا باس لەسەر باکوور، باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکەن. ئیتر بە من ناڵێن ئەی ئەم وڵاتە خۆر ئاوای نییە؟ لام وایە ئێمە بۆ خۆمان و بە دەستی خۆمان بەشێك لە لەشمان جوێ دەکەینەوە و تاوانەکەشی دەخەینە ئەستۆی نەیارانمان!

بەو وڵام و لێکدانەوەیەی چیمەن گەز گەز باڵام دەکرد و لە هەمانکاتیش دا لە خوتوورەی درەنگ گەڕانەوەی چنار و شێرکۆ دا بووم، چونکە مەودای چوون و هاتنەوەی نێوان کانیی و ئاوەکە بۆ نێو گوند، کەمتر لە نیو کاتژمێر بوو.

هاژەی ئاوی سەراوەکان و چریکەی مەل و زریکزاکی بە دەیان جۆر گیانلەبەری دیکە، حاڵ و هەوایەکی تایبەتی دابووە سروشتی ئەو بنارە.

ئێمە کە لە دەوری ئاگەرەکە کۆ ببووینەوە، لەپڕ بوو بەبێ سی شێرکۆ و چنار. یەك گوتی شێرکۆ حەزی لە چنارە. ئەویدی گوتی چناریش حەزی لە شێرکۆیە. یەکێ گوتی خۆشەویستی و ئەوین، مردنی بابیش لە بیر دەباتەوە. ئاخر شێرکۆ هێشتا حەوتوویەك لە کۆچی دوایی باوکی تێپەڕیبوو. منیش گوتم ئەگەر بڕیار وابێ کە هەر کەس بابی بمرێت و ئیتر دڵداری نەکا، ئەوە سەروبنی دونیا ویکدێ و ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتیش لە بن دێتە دەرێ.

فرمێسك ڕووی لە من کرد و گوتی:

ـ بەخیلی بەشێکی گرینگ لە ژیانی مرۆڤەکان پێك دێنێ و ئەم خوو و خدەیە لەنێو خوێن و دەمارەکانی ئێمەدا دەسوڕێنەوە، بێجگە لەوەش ئێمە وەك مرۆڤی کورد ڕادەی بڕوا بە خۆ بوونمان تێدا لاوازە. لەوانەیە هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە زۆر بن، بەڵام لام وایە هۆکاری سەرەکی هەر ئەوە بێ کە ئێمە کیانێکی سەربەخۆمان نەبووە تاکو بتوانێ بنەما کۆمەڵایەتیەکانی ژیانی کوردەواری لەسەر ئەساسی ژیان بە واتای ژیانێکی زانستیانە و ڕاستەقینە دابمەزرێنێ. هەر بۆیەش بەردێك دەکەینە شاخێك و بە هاتنە پێشی چووکەترین ناکۆکییەك، هەموو کویزە و کۆچەڵەکان بەسەر یەکتریدا دەشکێنین. ئێمە کە دەمانەوێ ئاڵوگۆڕ لە کۆمەڵدا پێك بێنین، دەبێ لە خۆمانەوە دەست پێبکەین. ئەوە هات و چنار و شێرکۆ لە یەکتر هەڵاوەسان و دەستەملانیش بوون، ئەو کات ڕووداوێکی گەلێك ئاسایی ڕوویداوە. واتە دوو دڵ بە یەك گەیشتوون، بەبێ بڕیاری برا و باب و خاڵ و مام و عێڵ و عەشیرە. ئەوە بە مانای بێ حورمەتی بە

کەسوکار و بنەماڵەی کچ یان کوڕ نییە. بە پێچەوانەوە، ئەوە نیشانەی تێگەیشتن و هەستی بەرزی مرۆڤایەتییە کە خۆی لە خۆشەویستی دا دەبینێتەوە. ئێمە دەبێ بە گژ ئەو داب و نەریتە کۆنانەدا بچینەوە کە کۆمەڵی ئێمەیان بەچۆك داهێناوە. ئەو سەردەمە دەبێ گۆڕ بکرێ کە کچ هێشتا لە زگی دایکی دا بوو، مەرجی لەسەر دەکرا، یان دەدرا بە مێرد. هەیە لەوەش شورەییتر کە ژن بەژنە بکەی، یان بەبێ ئاگاداریی و ڕازیی بوونی کچ و کوڕ، ژیانی هاوبەشیان بوو پێك بێنی. زوڵم و زۆر و چەوساندنەوە هەر ئەوە نییە کە داگیرکەران دەیکەن. کۆمەڵی ئێمە بە دەست گەلێك داب و نەریتی کۆنەوە گیرۆدەیە کە وەك کۆت و زنجیر کراوەتە ئەستۆی و خەریکە چۆکی پێ دادەدا. بە داخەوە دەبێ بڵێم کە لەم بوارەدا تاوانباری یەکەم بۆ خۆمانین و نەخشی داگیرکەران لەم بوارەدا هێندە بەرچاو نییە. داگیرکەران تێکۆشاون کە کۆمەڵی ئێمە لە نەخوێندەواری و دواکەوتوویی دا ڕاگرن، تاکو درێژەپێدانی داگیرکارییان بۆ ساکارتر بێ. بۆ ئەم مەبەستەش پاساوی یاسایی بە پشتیوانی ئایین و ئایینزاکان دادەتاشن تاکو بتوانن لە لایەکەوە کۆمەڵ لە دواکەوتوویی و نەزانیی دا ڕابگرن و لە لایەکی دیکەوە بە پاڵپشتی یاسا داتاشراوەکان، هەم بەرەنگاری شۆڕشگێران و خەباتکاران ببنەوە و هەمیش نایەکسانی بکەنە ئەرکێکی ئاسمانی، کە کۆمەڵ وەك ئەرکی سەرشانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکا.

کاتەکان دەهات و تێدەپەڕین، بەڵام هەواڵێك لە چنار و شێرکۆ نەبوو. ئێمە کە بە سەرنجەوە گوێمان لە لێدوانەکەی فرمێسك دەگرت، بە جارێك چووبووینە ناخی ئەو گرفتە کۆمەڵایەتیانەوە کە کۆمەڵگای ئێمەیان

بەچۆك داهینابوو. لە کۆتایی لێدوانەکەی فرمێسك دا کە درێژەی کێشابووە نێو دابەش بوونی مرۆڤەکان بە سەر چەندین دەستە و پێك هاتبوون لە، میر و دەرەبەگ، ڕایەت و سەید، شێخ و مەلا، ئاغا و خان، خەلیفە و کاکی، دەروێش و دێوانە، مورید و تالۆ دا، بەڵام ئافرەت چووکترین نەخشێکیان لەم دەستە بەندی و دەسەڵاتدارییە دا نەبوو. واتە نە دەیانتوانی خوتبە و یاسین بخوێنن، نە مارە ببڕن و نە تەڵاقیش بدەن، نە پێش نوێژی بکەن و نە سیغە بنووسن، نە بانگ بدەن و نە فتواش. نە لە جەمع دا دانیشن و نە نەزر و نیازیش دوعا بدەن، بەڵام جل و دەفر شوشتن، بەخێوکردنی منداڵ، چەپۆکەسەری و دابەزاندنی کەسایەتی ئافرەت تا ڕادەی زەعیفە، نەك هەر دژایەتی لەگەڵ نەدەکرا، بگرە ببووە کارێکی سیستێماتیك و بە بەژن و باڵایان بڕابوو!

ئا لەو کاتەدا بوو کە کوڕێکی گەنج کە تازە تیغی دابوو، خۆی گەیاندە لای ئێمە. هەرکە لێمان نیزیك کەوتەوە، بانگی منی کرد و گوتی:

ـ کاك شوان! کارم پێتە.

منیش هەستام و چووم بەلایەوە. پاش ڕۆژباش کردن، گوتی:

ـ میوانتان هاتووە و لەماڵەوە ئیشیان پێتە.

ـ کێ کاری پێمە؟

- خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەتەوە لە ماڵتان، بەڵام نازانم بۆ چی و لەبەر ئەوەش منیان ناردووە بە دواتدا.

ئەوەی لەو کاتەدا بە بیرمدا دەهات ئەوە بوو کە ڕەنگە هاوڕێکانی دێرین و شارستانیم دەنگۆی دانیشتنەکانی ئەم چەند ڕۆژەی دوایی ئێمەیان بیستبێت و هاتبن بۆ سەردانمان.

گەڕامەوە لای هاوڕێیان و پێم گوتن:

ـ وابزانم میوانمان هاتووە و دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ماڵ و سەیرانەکەمان دەهێڵینەوە بۆ کاتێکی دیکە.

ئێمە بە تێکڕا بەرەو لای ماڵ وەڕێ کەوتین. کە گەیشتینە بەرانبەری ماڵەوە، چاومان بە ئاپۆرای خەڵك کەوت کە لەسەربان و دەور و بەری ماڵی ئێمە کۆ ببوونەوە. دەستبەجێ هەستم کرد کە شتێکمان بۆ هاتۆتە پێش، بەڵام ئەوەی قەت بە بیرمدا نەدەهات ئەوە بوو کە ڕووی دابوو. ئێمە گەیشتینە ماڵ و یەکەم کەس کە پێیگەیشتین سوارە بوو. ئەو لێمان هاتە پێش و گوتی:

ـ شوانە! خەم مەخۆ. ڕاستە ئەتۆ گەنجی، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە پێویستت بە دڵدانەوە نییە. دایکت زۆر بانگی کردی. ئەو پێی خۆش بوو کە دوایین هەناسەکانی لەتەنیشت تۆدا هەڵکێشێ، بەڵام مەرگ دەرفەتی پێنەدا و کەمتر لە دە خولەك دا گیانی سپارد. ڕاستە دادە وەنەوش هەم بابت بووە و هەم دایکت، هەم برات و هەم خوشك و بە گشتی هەموو کەسێکی تۆ بوو، بەڵام لە بیرت نەچێ کە شوێن دەستی ناوخاسی بابت و وەنەوشی دایکت بە سەر مێژووی گەل و نیشتمانەکەماندا دیارە و هەر دەشمێنێتەوە. دڵنیابە کە گەلی ئێمە ئەمەگناسە و درەنگ یان زوو بە ئامانجەکانی خۆی دەگا و هەرگیزاو هەرگیزیش ڕەنج و زەحمەتی

خەباتگێڕانی خۆی لە بیر ناکا. ئەوەی ماوەتەوە بیڵێم ئەوەیە کە دەبێ لەسەر پرۆگرامی خۆمان بەردەوام بین. نابێ مردنی دادە وەنەوش دەستە وەستانمان بکا و چاوەڕوانی هات و نەهات بین.

بە دوای قسەکانی سوارەدا، هاوڕێکانم لەگەڵ خەڵکی دێ، لە باوەشیان دەگرتم و دڵیان دەدامەوە. منیش سوپاسم دەکردن و دەمگوت:

ـ ئەو ڕێز و حورمەتەی ئێوە جێگای شانازییە بۆ ئێمە و هەتا هەتایە لە بیر ناچێتەوە. هەرئێوارەی ئەو ڕۆژە دایکم بە خاك سپێردرا و ماڵئاوایی ئێکجاریمان لێکرد. با نەیشارمەوە و ڕاست و ڕەوان بڵێم، ڕاست بوو لە لێدوان و هەستان و دانیشتنەکانم دا لەگەڵ خەڵك و هاوڕێکانم دا وورەم دەدایە خۆم و هەموو خەڵکی کوردستانم بە کەسوکاری خۆم دەزانی، بەڵام ئەوەشم دەزانی کە لەدەستدانی دایکم کەلێنێکی گەورەی بۆ دروست دەکردم.

بۆ ئێوارێ خەڵکێکی زۆر لە ماڵمان بوون. دادە خاسپەری و کەژاڵ لە ماڵی خۆیان شێویان لێ نابوو. خەڵکی گوند هەر بنەماڵەیەك بە جۆرێك یارمەتیان دەکردین. تا درەنگانێکی شەو دانیشتین و هەر کەس زاری دەکردەوە باسی نەهامەتی و بێ بەختی و ڕۆژ ڕەشی خۆی دەکرد" بەبێ ئەوەی ڕاستەو خۆ ناوی کەسێك یان دەوڵەتێك ببا. من کە دڵم لەو جۆرە گلەیی و گازندانە پڕ ببوو گوتم:

ـ ئێمە ناتوانین تەنیا گلەیی و گازندە بکەین و دڵی خۆمان بەوە خۆش کەین کە بەڵکو داهاتوویەکی باشترمان هەبێ. ئێمە بە تێکڕا دەبێ ئەو گلەیی و گازندانە بکەینە هەوێنی تێکۆشان بۆ بە گژداچوونەوەی

زۆرداریی و داگیرکاریی. ئەگینا چارەنووسی ئێمەش لە هی باب و باپیرانمان چاکتر نابێ.

پاش مالئاوایی خەلك و چوونەوەیان، جێگاکانمان بۆ نووستن ڕاخستن، بەلام من نەمدەتوانی بنووم و کات لەگەل کات شێوازی تیرِوانین و یادگارەکانم لەگەل دایکم دەگۆڕان. بە جارێك قەلای دلم گیرا و گەلێك تێکۆشام کە بوغز و ڕقەکانم لە دلی خۆمدا ڕاگرم، بەلام هەولەکانم بێتاکام بوون. تەنیا کارێك کە لەو چرکەدا دەیتوانی بوغز و دلتەنگییەکانم کە دەروونی داگرتبووم کەم بکاتەوە، گریان بوو. ئەمن قەد بۆ باوکم نەگریابووم، چونکە کاتێك ئەو لە سێدارە درابوو من مێرمندالێکی چووکە بووم. نەمدەتوانی نەگریم بۆ دایکێك کە دلی لەت لەت کرابوو و قەتیش خۆشیی بە خۆیەوە نەدیبوو.

بۆ ئەوەی هاوڕێیەکانم بە دەنگی گریان و هەنیسك دانم لە خەو نەکەم، چوومە دەرەوەی مال و لە سوچی تەلارەکەدا، بەکول دەستم بە گریان کرد. دلم پڕ بوو لە داخ و بەو جۆرە ویستم کولی دلم دامرکێنم. لە گەرمەی هەنیسکدان دا بووم، کە دەستێك لە پشتەوە نرایە سەر شانم و ئەوجار دەستسرِێکی کودەری درا بە دەستمەوە. فرمێسکی چاوەکانم پاك کردنەوە و لەپێشدا لەبەر تاریکی نەمزانی کێیە. کاتێك لە لامەوە دانیشت و بە دەنگێکی ناسك و بێهێز دەستی بە گریان کرد، زانیم فرمێسکە.

ئەو بە دەم گریانەوە گوتی:

ـ شوانە! دادە وەنەوش بە تەنێ دایکی تۆ نەبوو. ئەو دایکی هەموو ئەو کەسانەشە کە دەمرن بۆ ژیان.

من هەستم کرد کە بوومەتە هۆی دڵتەنگیی فرمێسك و پێمخۆش نەبوو ئەوانی دیکەش لەخەو هەستن، بۆیە پێمگوت:

ـ ڕاستت دەوێ نەمدەتوانی نەگریم بۆ دایکم. هەر بۆیە بڕیارمدا کفت و کوڵی دڵم بەجۆرە دامرکێنم، بێجگە لەوەش زۆر شتی شاراوە لە دڵی دایکم دا بوون، کە دەبا بۆی گێڕابامەوە، بەڵام داخەکەم تازە ئیتر درەنگە.

سوپاسی هەستی خاوێنیم کرد و هەستام گڵێمیکم هێنا و لە بەر هەیوان ڕاخست و دوو کەسیی لە سەری دانیشتین، پاشان هێندێك لەسەر ڕووداوە سیاسیی، کۆمەڵایەتییەکان و نەهامەتییەکانی خەڵك دواین. وردە وردە ڕۆژمان کردەوە و پاشان کوورەی ئاگرەکەم هەڵکرد: کترییەکەم پڕ لە ئاو کرد و لە سەرم دانا. ئاو کوڵی و پوختێك چام بەستە سەر قۆرییەکە و لەتەنیشت ئاگرەکە دامنا. چایی دەمی کێشا و سەر و پیاڵەمان خواردەوە. لەوکاتەدا بوو کە بۆ یەکەمجار هەستم کرد کە ئیتر بەرپرسایەتیی ڕاستەوخۆ لە ئەستۆی خۆمە و کەسی دیکە نییە تاکو نازم بکێشێ. ئاخر پاش لەسێدارە درانی بابم، دایکم ژیانی تەنیایی هەڵبژاردبوو. ئەمەش بە نۆرەی خۆی ئاسەوارێکی خراپی لەسەر دانابوو، بەڵام لە مێژبوو پێی دەگوتم کە ئەو دەمرێ بۆ ژیان و ناژی بۆ مردن. ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە هەم بابم و هەم دایکم، هەردووکیان مردن بۆ ژیان.

لە درێژەی باسەکانماندا لە فرمێسکم پرسی:

ـ چۆن دەڕوانیتە داهاتوو و دەتەوێ چ بکەی؟

ـ بەو جۆرەی کە ئێستا دەچێتە پێش، ڕۆژگارێکی باش چاوەڕوانمان ناکا. وا هەست پێدەکەم کە بارودۆخەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خراپی و

نالەباریی دەچێ. هەربۆیە بڕیارم داوە تا ئەو جێگایەی دەرفەت هەبێ و بوارم بۆ بڕەخسێ، بۆخۆم بڕیاری چۆنیەتی ژیانم بدەم و چارەنووسی خۆم نەدەمە دەست داب و نەریتە کۆن و پۆترکاوەکانەوە، بێجگە لەوەش بە دوای مردنی خاڵم و خاڵۆژنم دا، کەسێکی دیکە شك نابەم تاکو بگەڕێمەوە بۆ شار و ناشمەوێ سووچی چێشتخانە ببێتە جێگای هەتا هەتاییم. بێگۆمان بڕیارێکە و داومە، بەڵام چۆن دەتوانم بڕیارەکەم بەجێ بگەیەنم، پرسیارێکە کە مێشکم توانای تاوتوێکردنی نییە.

من کە بە تەواویی وەڵامی پرسیارەکەمم وەرگرتبوو، پێم گوت:

ـ دڵنیا بە کە بە تەنێ نابیت و بە هەمووومان یارمەتیت دەکەین.

لەو باس و لێکدانانەوەدا بووین، کە هاوڕێیانمان یەك یەك لە خەو هەستان، پاشان قاوەڵتیمان کرد و خۆمان بۆ پێشوازیکردن لە پرسە گێڕان ڕێکخست. بە گەرمەدا هاتنی خزر و بان، پۆل پۆل خەڵك دەهاتن و سەرەخۆشیان دەکرد و پاش ماوەیەك بە جێیان دەهێشتین. ئیتر دابی خێر و خێراتکردنیش هەڵگیرابوو، ئەمەش بۆلاخۆی قورساییەکی زۆری لەسەرشانمان کەمکردبۆوە. ئەو ڕۆژەشمان گەیاندە خۆرئاوا و دیسان شەومان لێداهاتەوە. درەنگانێکی شەو کە دەمانویست پۆشەنەکان ڕاخەین، کتێبێکم دیت کە لە سووچی ژوورەکەدا کەوتبوو. کتێبەکەم هەڵگرت و خەریکبووم لەسەر جێگای خۆی دانێمەوە، چاوم بە چەند لاپەڕە کاغەز کەوت کە لە سەرەوەی کتێبەکەوە وەدەرکەوتبوون. دەرفەتی خوێندنەوەی نووسراوەکەم نەبوو. هەربۆیە هەڵم گرتن تاکو لە دەرفەتێکی لەباردا چاویان لێ بکەم.

ئێمە هەر کەسە و لەلایەک ڕاکشاین. پاش ئەوەی هەموران نووستن"
چراکەم هەڵگرت و چوومە بەر تەلاری ماڵ. گڕی چراکەم هەڵدا و دەستم
کرد بە خوێندنەوەی نووسراوەکە:

«ڕۆڵە گیان، شوانە! مەبەستم لە نووسینی ئەم دوو لاپەڕە کاغەزە نە وەسیەتکردنە و نە خۆهەڵکێشانە بە سەر کەس دا. پێمخۆش بوو وەك ملیۆنان مرۆڤی سەر ئەم گۆی زەوییە، بە سەربەستی نەتەوەیی و ئازادی ژیابام، بەڵام نەیانهێشت دەستی زۆرداری و داگیرکاری ئەم دەرفەتەی بۆ نەڕەخساندم. ئەوەی کە زیاتر و بە ئێشتر ئازاری دەدام، نە سەرەڕۆیی داگیرکەران بوو و نە بێبەشی لە سامانی وڵات و نە نەداریی و هەژاریی. بەڵکو بەشی هەرە گرینگی ئێش و ئازارێك کە بڕستی لێ بڕیبووم، دواکەوتوویی و لاساییکردنەوەی کولتوری بێگانە بوو، کە تۆزقاڵێکی لێتێنەدەگیشتین. زۆرداران و چەپاوکەران دەیانزانی چۆن پیلانەکانیان جێبەجێ بکەن، بەڵام جێی داخ ئەوە بوو کە باوك و باپیرانی ئێمەش لە گەلێك ڕووداوی تاڵ و مێژوویی‌دا دەبوونە هاوبەشی داگیرکەران بۆ داپلۆساندنی نەیارانیان.

ڕۆڵە گیان! ئاوخاسی بابت بە تاوانی جیایی خوازی لە سێدارەدرا. ئەوە نەك هەر تاوان نییە، بەڵکو مافێکی ڕەوایە و بۆ کەسیش نییە لێمانی زەوت بکا.

کوڕی خۆم! وابیر نەکەیەوە کە بێکەسی. ئەو هەموو خوشك و برا تێکۆشەرانەی کە لە هەر چوار بەشی کوردستان بەرخۆدان دەکەن، کەسی تۆن. ئێوە گەنجان و لاوانی کچ و کوڕ، پێویستتان بە زانست و زانیاری

لەسەر مێژووی گەلەکەتان هەیە. هەر بۆیە سەرنجت ڕادەکێشم بۆ لای ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە:

ڕۆڵە گیان! بەر لە هەموو شتێك ڕادەسپێرم کە نووسراوەکان و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی مێژوویی لەسەر ئەم ئیمپراتۆریانەی خوارەوە وەدەست بهێنە و ئاکار و کردەوەکانیان بە درێژایی مێژوو لەسەر نەتەوەکەت، بخوێنەوە.

یەکەم/ ئیمپراتوری عەرەب و چۆنیەتی ـ ڕوستبوونی ئایینی ئیسلام و تاکتیك و ستراتیژییەکانیان بۆ داگیرکردنی ناوچە و داسەپاندنی ئایدۆلۆژی خۆیان.

دووەم/ ئیمپراتۆری تورکەکانی عوسمانی و پاشان ڕەگەزپەرستەکانی کەمالیسم و درێژەدەرانی هەمان بیرۆکەی کۆلونیالی.

سێیەم/ ئیمپراتۆریەکانی فارس و تورك لە ئێران، بە تایبەت سەفەوییەکان و ڕۆڵی ئەوان لە دابەزاندنی کۆنەپارێزی و نەخشی داپڵۆسێنەری میراتگرەکانیان تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

ئەوجار ئاورێك لە مێژووی بزووتنەوەکانی گەلی کورد لە هەموو پارچەکان دا بدەوە و هۆکاری سەرنەکەوتنی ئەو هەموو خەبات و بەرخۆدانانە لێکبدەوە. بێگومان پاش پێداچوونەوە بە مێژووی بزووتنەوکانی ئەم سەدەیە و سەدەکانی ڕابردووش، بۆت دەردەکەوێ کە هۆکارە سەرەکییەکانی درێژە کێشانی نەگەیشتن بە ڕزگاریی و سەربەخۆیی گەل و وڵاتی ئێمە لەم خاڵانەی خوارەوە خۆیان دەبیننەوە. ئەگەر هات و

بیروڕات بە جۆرێکی دیکە بوو، ئەوە دەبێ بە لێکدانەوە و بەڵگە هێنانەوە، پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەی من بە خۆت بسەلمێنی.

ئەو هۆیانە بریتین لە:

- یەك گرتوویی و هاوەدەنگ بوونی نەیارانی دۆزی گەلی ئێمە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان بۆ خۆیان بە دەیان گرفت و ناکۆکیی نەتەوەیی و نێونەتەوەییان هەبووە و هەیە.

- نەبوونی یەکگرتوویی و ستراتیژی نەتەوەیی و دژبەرەکی کردنی خۆماڵی ئێمە لە پێناو بەرژەوەندییە خێڵەکی، ڕێکخراوەیی و تاکە کەسییەکان دا.

- نادروست بوونی بنەمای خوێندن و فێرکردن لە قوتابخانە سەرەتاییەکانەوە تاکو دوا قۆناغەکان.

- بێگانەپەرستی و خۆ بەچووکە زانین لە بەرانبەر نەتەوەکانی باڵادەست دا.

- خێڵەکی بوونی بنەما کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵی کوردەواری وشارەزا نەبوون لە مامەڵەکاریی ڕامیاری و متمانەی لە ڕادە بەدەر بە نەیاران و بێگانەکان.

- چوونە ژێر تەوژمی تایینەکان، ئایدۆلۆژییەکان و خستنە پەراوێزی ویستەکانی نەتەوەیی.

- نەبوونی هۆشیاری نەتەوەیی و بە فیڕۆدانی تواناییەکانی کۆمەڵگا بە پرسە لاوەکییەکانەوە.

- بەکەم گرتنی دوورژمن و نەقۆستنەوەی هەلەکان لەو کاتانەی کە هەلمان بۆ ڕەخساوە و بە ئیستاشەوە.

- ململانێی ناسەردەمیانە و بەهێند نەگرتنی بەرژەوەندی گشتی گەل و ولات.

- پشتنەستور نەبوون بە هێزی خۆمالیی و خۆبەستنەوە بە چوارچێوەکانی داتاشراو و دەستکردەوە.

- لاوازبوونی ڕێکخراوی سیاسیی و کۆمەلایەتی سەردەمیانە و بە پلان، بۆ ڕێکخستنی خەباتی هارچەرخ بۆ گەیشتن بە سەروەریی نەتەوەیی بە بیر و بە هزری ڕزگاریخوازی.

- چالاك نەبوون لە کۆڕ و کۆمەلە نیونەتەوییەکان و بە هێند نەگرتنی شێوەکاری دیپلۆماسی.

ڕۆلەی خۆشەویستم! پێمخۆشە هێندێك لە دەردە دلەکانمت بۆ بخەمە سەر ئەم لاپەڕانە، تاکو بزانی چەندە قرچەم لە دلّ هەستاوە و لەت لەت لە جەرگم کراوەتەوە، بەبێ ئەوەی لاوازیم لە خۆ نیشان دابێ.

کوڕی خۆم! لەبیرت نەچێ کە دەستی ئاشتیمان بۆ لای هەرکام لە داگیرکەرانی ولاتەکەمان درێژ کردووە، دەستیان بڕیوین.

بۆ وتووێژ و دیالۆگ بانگیان کردووین، بەلام بە پیلانی ناجوامێرانە تیرۆریان کردووین و لە دلّی پاك و مەبەستی خاوێنمان کەلکی خراپیان وەرگرتووە و تا ئێستاش لەژێر ناوی جۆرواجۆردا قەلاچۆمان دەکەن.

ئەوەی بۆ خۆیان ڕەوایە، بۆ ئێمە وەك تاوان دێتە ئەژماردن. نار و ناتۆرەی جۆراجۆرمان وەپاڵ دەدەن و لەسەر دەستی خۆیان ناردێرمان دەکەن.

ناوە مێژووییەکانی سەر شار و گوند، شاخ و ڕووبارەکانمان دەگۆڕن و ناوی دڵخوازی خۆیانی لەسەر دادەنێن، بێجگە لەمانەش بە دەیان مێرخاس و بلیمەت و هەڵکەوتووی گەلەکەمانیان، یان تیرۆر کردووە و یان لە سێدارەیان داون و یان شوێن بزریان کردوون. زۆر جاریش بە "چەتە و ڕێگر، جەزدە و نامۆ لە خەڵك" پێناسەیان کردووین.

کوڕە شۆخەکەم! من بە هۆی ئەوەی کە هێندێك خوێندەواریم هەبوو، تا ڕادەیەك زانیاریم لەسەر شۆڕشەکانی وڵاتە پارچەپارچە کراوەکەم هەبوو. ناوخاسی بابت تەنیا لەسەر مافخوازی و نەچوونە ژێرباری سەرەڕۆیی، لە سێدارە درا. ئەو وەك پێشمەرگە لە پاراستنی کۆمارە ساواکەی کوردستاندا بەشدار بوو. من لەسەر ڕاپەڕینەکانی کوردستان، هەر لە شێخ سەعیدی پیرانەوە بگرە تاکو شێخ ڕەزا، سمایل خانی شکاك (سمکۆ)، شۆڕشی خۆیبوون، شێخ مەحموودی حەفید لە سولەیمانی، شێخ عەبدولسەلام و شێخ ئەحمەدی بارزان، یارمامەدخان و قەدەخێر و زۆر تێکۆشەری دیکەی کورد و کوردستانی، زانیاریم هەبوو. سەرەڕای ئەو هەموو کەندو کۆسپانەش، ڕۆژێك لە ڕۆژان خەبات و بەرخۆدانی ئەوانم لە بیر نەکردووە، بەڵام کۆمارە گەلەکۆمە لێکراوەکەی کوردستان لە بەشی دابڕاوی ڕۆژهەڵات دا بە سەرۆك کۆماریی پێشەوا قازی موحەممەد و شۆڕشە مەزنەکەی باشوورم بە ڕێبەرایەتی بارزانی بە جوانی لە بیرە. کوڕە

دڵسۆزەکەم! ئەو ڕووداوانە هەر هەموویان شوێنی خۆیان بەباش و بە خراپ لەسەرداناوم. بەو بۆنانەوە نە بەسەرکەوتنەکان هەڵ چووموو لەخۆبایی بووم و نە بە شکست و هەرەسهێنانەکان هەراسان و بێ هیوا. ئەوە لەبەر ئەوەش نەبوو کە ناسیونالیستی کوێر و دڵڕەق، یان خۆشباوەڕ و بە دوای دروشمی زریقە و بریقەدار کەوتبم. بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە هەستم بە مەترسییەکانی سەر ڕێگای دوارۆژی گەلەکەم کردبوو. من قەت نەمویستووە ڕاستییەکان بە چەواشە ببینم و یان لێکیاندەمەوە. ئەوەی ڕاست بێ ئەم دێڕانەی خوارەوە بنەمای بیرکردنەوە و باوەڕی قووڵی من بەدوارۆژ و چارەنووسی گەلەکەم بووە. هیوادارم کە ئێوە کچان و کوڕانی گەنج و لاوی نەتەوەکەمان، قازانجی گشتی گەل و وڵاتتان لێ مەبەست بێ. نەك ململانێی ناسەردەمیانە و تەسك بیر کردنەوەی ڕێکخراوەیی و ناوچەیی تایبەت بە خۆتان.

ڕۆڵە تاقانەکەم! من لە ژیانمدا جیایی خوازیم بە تاوان نەزانیوە و بگرە شانازیشم پێوە کردووە. قەت پارچەکانی کوردستانم بە بەشێك لە وڵاتانی ئێران، عێراق، تورکیا یان سووریا نەزانیوە و هەتا هەتایەش ئەم پێناسەیە ناکەم. کوردستان وڵاتێکە و هەبووە و دەمێنێتەوە و منیش خەڵکی کوردستانم.

هەموو کاتێك وام بیرکردۆتەوە کە کۆشکەکانی داگیرکەران درەنگ یان زوو دەبێ بڕووخێن و سەرکەوتنی بێ ئەملاو ئەولاش بۆ ئێمەیە.

شوانەی خۆشەویستم! من سەرەتایەکم بۆ ئەم نووسراوەیە نەبوو، تاکو کۆتایی بۆ دانێم، چونکە لام وایە کە مرۆڤ کاتێك دێتە دونیا و چاوی

دەکاتەوە، خەباتی بۆ ژیان دەست پێدەکا. بە واتایەکی دیکە ژیان لە یەکەمین چرکەوە تا دوایین چرکە، خەباتە. دڵنیاش بە تا ئەو کاتەی گۆی زەوی بسووڕێ و مرۆڤایەتی هەبێ، خەبات بۆ ڕزگاریی و ژیانێکی باشتر کۆتایی پێ نایە. ئێستاش ڕزگاریی کوردستان لە پانتاییەکدا دەبینم کە دوور بێ لە ململانێی حیزبی، ئایدۆلۆژی، ئاینی، خێڵەکی بوون، کە ئەویش بەرینایی نەتەوەیی و نیشتمانیی کوردە بە تێکڕا. وا من دوا قسەکانی خۆمم کرد و ئەتۆش بۆ خۆتی کە بڕیاری خۆت دەدەی. ئەگەر درەنگیش لەم ڕاستیانە تێمگەیاندووی، گەردنم ئازاد کە.

پاش خوێندنەوەی نووسراوەکەی دایکم کە بۆ خۆی جۆرە وەسیەتێك بوو، لەبەر کەم ئەزموونی و نەچێشانی سەخڵەتی ڕۆژگار، نەمدەتوانی لە بەشێك لە نووسراوەکە بە جوانی تێبگەم، بێجگە لەوەش نەمدەتوانی هەموو نووسراوەیەکی کوردیش بە سانایی بخوێنمەوە. هەر بۆیە دووجارم خوێندەوە و بۆ دوایین جار و لە کاتی خوێندنەوەی دوایین دێڕەکاندا، خەوم لێکەوتبوو. لە خەومدا، خەونم دەدی کە ساوڵێك کە جلی ئافرەتانەی لەبەردا بوو بە جەستەیەکی گەلێك لاوازەوە، لێم دێتە پێش. زۆر تێکۆشام لەبەر پێی هەستم، بەڵام نەمتوانی. ئەو لێم نیزیك بووەوە و گوتی:

ـ چاو لە جەستەی کز و لاوازم مەکە. پێت وانەبێ لاوازیم هی نەخۆشی یان لەبەر برسییەتی و ئیشوکاری ڕۆژانە بێ. دەستکورتیش نیم و سەروەت و سامانی زۆریشم لە پشتدایە.

- ویستم لەو خەونەدا پرسیارێکی لێ بکەم، بەڵام زمانم لە ئاست لێدوانەکەی ئەو بەسترابوو. ئەو دیسان هاتە دوان و پرسی:

ـ زانیوته که له هەر شەو و ڕۆژێکدا به سەدان هەزار لیتر خوێن له لەشم دەگرن و بەشێکی دەکەنە جەستەی خۆیان و بەشەکەی دیکەش خۆمی پێ دەسووتێنن؟

ئەو خەریك بوو درێژە بدا که دەستێك وەخەبەری هێنام. چاوم کردەوە دەبینم فرمێسك له تەنیشتمەوە دانیشتووە. پرسیم:

ـ له بەرچی نەنووستووی؟

ـ زۆر تێکۆشام بەڵکو بنووم، بەڵام خوتوورە و بیرۆکەکان دەمبەنە نێو دونیایەکی بێسەر و بنەوە و دەست هەڵگرم نین.

ڕێك لەو کاتەدا وەبیرم هاتەوە که پرسیارێکم لەسەر چۆنییەتی خوێندنی باڵای لێی هەبوو، بەڵام وڵامم وەرنەگرتبۆوە. لەو دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و پرسیم:

ـ شاسوار بەو تۆخسییە که هەیبوو، چۆن دەرفەتی پێدابووی که تا ڕادەی خوێندنی باڵا درێژە به خوێندن بدەی؟

ئەو که ماندوو دەهاتە بەرچاو گوتی:

ـ ئەگەر له بیرت مابێ، هەر دوێنێ و پێرێ بوو که لاشەی داخکراو و هەنجن هەنجنکراوی خۆمم به دەستی شاسوار، پێشان دای. جارێکیان خاڵە میرانم که ماڵیان له شارە، هاتبوو بۆ سەردانمان. ئەودەم له پۆلی شەشمی سەرەتاییم دەخوێند و سێزدە ساڵان بووم. بەیانی که هەستاین هەموومان له دەوری یەکتر کۆ ببووینەوە. شاسواری بابم به خاڵمی گوت: پێی خۆشە ئاگاداری کاتەوە که منی داوە به مێرد به حاجی هەمزە. منیش به دەرفەتم زانی تاکو خاڵم لەوێ بوو، دژایەتی خۆم دەربڕم، چونکه نه دەمزانی

مێردکردن بۆ چییه و نه دەشمزانی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بەری چ دارێکه. ئیتر ماڵداری با بەو بانەوە بێنێ. هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو، که شاسوار هەتا هێزی تێدابوو، بە کەوگێری بەری کوانگەکە، کێشای بە باڵی چەپم دا. من یەکڕاست چریکاندم و قیژەم گەیشتە عەرش. ویستم تەکانێك بە دەستم بدەم، بەڵام دەستم نەچووە سەر. خاڵم کە مرۆڤیکی لەسەرەخۆ و بە تاقەت بوو، گورج هاتە پێش و دەستی گرتم. ئەو گوتی دەستی شکاوە و دەبێ بیبەین بۆ دوکتۆر!.

بابم هەستاو گوتی: نابێ فرمێسك لەم ماڵە بچێتە دەر، تاکو ئەو دەستەی فەرەق فەرەق دانەوەشێ و لەت لەت لێی نەبێتەوە.

دایکم گوتی: شاسوار قۆڵی کچەکەت شکاندووە، لێیگەڕێ با میران لەگەڵ خۆی بیباتە دوکتۆر.

شاسوار کەوگێرێکیشی هاویشتە دایکم، بەڵام لە بەر تورەیی خۆی بە هەڵە وەبەر شێرکۆ کەوت و دوو پەراسوی شێرکۆشی شکاند و کۆستمان بوو بە دوو.

لەوانەشە هەر بۆ شێرکۆی هاویشتبێ، بەڵام بە ڕواڵەت بۆ گەرشەی دایکمی هاویشت. خاڵم نەیدەزانی چ بکا. ئەو ئالیخانیەکەی دەوری سەری کردەوە و قۆڵی شکاوی منی بەستە ملم. بە هەر جۆر بوو، بە ترۆمبیلی ئاوایی، ئێمەی گەیاندە بانتاق کە دەکەوێتە سەر جادەی کرماشان و قەسری شیرین. لەوێشەوە بە مینی بووس گەیشتینە شاری کرماشان و لەوێش بە تاکسی ئێمەی گەیاندە نەخۆشخانە و زۆری پێنەچوو کە بانگیان کردینە ژووری دوکتۆر. دەستبەجێ وێنەگرتن بە تیشکیان بۆ

ئەنجام داین و منیان بردە دیوی نەشتەرگەریی. ئیتر کاتێك وەهۆش هاتمەوە، شەو بوو. قۆڵم لە گەچ گیرابوو. شێرکۆش پێویستی بە نەشتەرگەری نەکردبوو و تەنیا دوو چەسپی ئەستوریان لە پەراسووی دابوو. من داخی خۆمم نەبوو، چونکە دەمتوانی هەڵسوڕێم و بە دەستەکەی دیکەم هەموو کارێك بکەم، بەڵام بۆ شێرکۆ ئاگرم تێ بەربوو ئۆقرەم نەدەگرت. ئەو نەیدەتوانی هەناسە بدات و نەشیدەتوانی بەسەر پێیەوە ڕاوەستێ.

ئێمە بەتێکڕا هاتینەوە بۆ ماڵی خاڵم و بۆ بەیانی خەبەری ناردەوە بۆ شاسوار کە ئیتر ڕێگا نادات ئێمە بگەڕێینەوە بۆ لای و وەك منداڵی خۆی بەخێومان دەکا، پاشان کە هێندێ چاك بووینەوە، خاڵم بردینیە قوتابخانە و درێژەمان بە خوێندن دا.

خاڵم و خاڵۆژنم، منداڵیان نەبوو. ئەوان گەلێك تێکۆشابوون کە منداڵیان بێ، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان بێ ئاکام مابوو. لەو ماوەیەدا تاکو چاك بووینەوە، دایکم دوو جار سەردانی کردین، بەڵام شاسوار قەت هەواڵی نەپرسین.

شێرکۆ پاش چەند ساڵێك لە کاتی پشووی هاوین دا و بۆ سەردان دەگەڕایەوە گوندی خۆمان و منیش ساڵی جارێك. هەم خاڵم و هەم خاڵۆژنم، منیان زۆر خۆشدەویست. ئەوان کە بۆ خۆیان منداڵیان نەبوو، ئێمە بووینە منداڵیان.

ئیتر بەمجۆرە ئێمە لە کرماشان ماینەوە و درێژەمان بە خوێندن دا، تاکو لە نەهامەتییەکەی ئێمە و چەند مانگ لەمەوبەر، خاڵم و خاڵۆژنم

لە سەفەرێکدا کە بۆ شاری ئیلام کردیان، لە وەرگەڕانی ترۆمبێل دا هەردووکیان تێداچوون. خاڵم بۆ خۆی جلوبەرگ دروویی دەکرد و خاڵۆژنیشم لە نەخۆشخانە کاری دەکرد. خەرجی تەواوی خوێندنم تا زانستگا، لەلایەن ئەوانەوە دەدرا. بۆ شێرکۆش هەروا بوو. شاسوار هیچ کاتێك نە بۆ من و نە بۆ شێرکۆ، دراوێکی خەرج نەکردووە. ئێمە بە هەردووکمانەوە، قەرزداری خاڵم و خاڵۆژنمین، بێجگە لەوانەش ماوەیەك لەمەو پێش لەلایەن مەلایەکەوە بانگ کرامە پرسگەی زانکۆ و پێی ڕاگەیاندم کە "دژە شۆڕش" و "ناموسوڵمانم" و بۆم نییە درێژە بە خوێندن بدەم!؟ خۆ ئێستاش بۆ خۆت دەزانی، شاسوار بۆ خۆی فرۆشتبوومی بە کابرایەك کە لە خۆی بە تەمەنتر بوو، چ بگاتە من!

دەبێ ببووری شوانە کە ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، بەڵام وابزانم بۆ خۆت خوازیاری بووی. ئێستاش هەرداخی خۆم ناخۆم و نازانم چارەنووسی ئێمە بەرەو کوێوە دەچێ؟

من نەم وێرا سەبارەت بەو بەسەرهاتەی فرمێسك هیچ بڵێم، چونکە دەمزانی بێجگە لە کولاندنەوەی برینەکانی و وەبیر هێنانەوەی دەرد و ڕەنجەکانی، هیچ قازانجێکی دیکەی بە دواوە نابێ، بۆیە پێم گوت:

ـ ئێستا شاسوار کۆچی دوایی کردووە و کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو بەسەر هاتانە لە بیر خۆت بەریەوە.

فرمێسك کە زۆر لەسەرەخۆ بوو، بە جارێك دەنگی بەرز کردوە و گوتی:

ـ نا، شوانه وانییه. له بیرکردنی ڕابردوو بێجگه لەخۆ فریودان، کڵاو لەسەر خۆنانیشه. ئەگەر بێت و ڕووداوەکانی مێژوویی لەبیر بکەین، ئاکامەکانی هەر ئەوە دەبێ کە ئێستا بەدەستیەوە دەناڵێنین.

ـ فرمێسك گیان، هەموو ڕووداوێك وەك یەك نییە و ناشکرێ ناوی مێژوو لەسەر هەر هەموویان دابنێین. ئێمە دەبێ جیاوازی دانێین له نێوان ڕووداوێکی مێژوویی که به سەر نەتەوەیەك دا هاتووه و تێکەڵی نەکەین لەگەڵ گرفتێکی خێزانی و بنەماڵەیی که له دواکەوتوویی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەوە دوو بابەتی به تەواوی لێك جیاوازن و ناشکرێ تێکەڵیان کەین، بێجگه لەوەش، مەبەستی من بۆ له بیرکردنی ڕابردوو ئەوە نییه که هەموو ڕابردوو لەبیر بکەین. بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو که ئێمه مرۆڤین و مرۆڤەکانیش زۆرجار لەسەر بابەتی جۆراوجۆر نێوانیان تێکدەچێ. ئەوەی که من گرینگی پێدەدەم ئەوەیه که ئێمه دەبێ ئەو ناکۆکیانەمان وەلانین و لەسەر خاڵی هاوبەش پێکەوە هاوڕێ و هاوکار بین. من تێدەگەم که شاسوار زوڵمێکی گەورەی له ئێوه کردووە، بەڵام کاتی ئەوە هاتووه که لەبیری خۆتانی بەرنەوە، چونکه ئەو بۆ هەمیشه نووستووه و قەتیش لەو خەوە هەڵناستێ.

هەر ئەو کات و له بەرز قسەکردنی من و فرمێسك دا، چیمەنیش له خەو هەستا. پەتوویەکی بەخۆیەوە پچابوو و هات لەلامان دانیشت. چیمەن که هێشتا هەر خەواڵوو بوو، پرسی:

ـ ئەوە ڕاوێژی کۆبوونەوەکە دەکەن؟ ئەگەر وابێ منیش پێشنیارم هەیە.

بەر لەوەی چیمەن شتێکی دیکە بڵێ، فرمێسک داوای لێبووردنی لێکرد کە بەرز قسەمان کردووە و لە خەومان کرد.

فرمێسک درێژەی داو گوتی:

ـ من بابم کۆچی دواییکردووە و شوانیش دایکی. هەردووکمان هاودەردین، بەڵام ئەو بە جۆرێك و منیش بە جۆرێکی دیکە. ئەوەی لە شوان بێ، باس لە چاکە و لێهاتوویی دادە وەنەوشە، کە چۆن لێبڕاوانە و بەوپەڕی لێهاتووییەوە لە خەمی نەتەوەکەی دا دەسووتا و هەرگیزیش کۆڵی نەدا. سەبارەت بەمنش، شاسواری بابم، تەنیا باس لە زەبر و زەنگەکان و لاساییکردنەوەی فەرهەنگ و کولتوری بێگانەیە و هیچی دیکە.

چیمەن کە مرۆڤێکی لەسەردڵان بوو، گوتی:

ـ بەڵێ، ڕاستە هەموو مردنێك وەك یەك نییە. هەروەك هەموو کەسیش ناتوانن وەك یەك بن و وەك یەکیش لەسەر گیروگرفتەکان بیر ناکەنەوە. مرۆڤی وامان هەن کە گیانیان لەپێناو گەل و وڵاتەکەیان دا بەخت کردووە و هەتاهەتایەش لە دڵی ئێمە و وەچەکانی داهاتووشدا یادیان زیندووە و دەمێنێتەوە. هی واشمان هەبووە و هەیە کە مرۆڤ شەرمی دێتێ باسیان بکا.



وام هەست پێدەکرد کە مردنی شاسوار بۆ بنەماڵەکەی وەك جێژن بووە. لەلایەکەوە دادە گەرشە بۆ هەتا هەتایە ڕزگاری بوو. شێرکۆ لە ژن هێنانی زۆرەملیی نەجاتی ببوو. کەژاڵ دەیتوانی بە دڵخوازی خۆی ژیان هەڵبژێرێ، بەڵام لە هەمان کات دا مردنی شاسوار کۆسپێکی گەورە بوو

بۆ حاجی هەمزە کە فرمێسکی جوان و بەلار و لەنجەی لەکیس دەچوو. ئەو دەبا یەك پاخەوا قوڕی ڕەشی بۆ خۆی گرتباوە و تێیدا دانیشتبا، چونکە لەمێژ بوو ژوورێکی تایبەتی لە داری حەیزەران ئامادە کردبوو بۆ شەوانی درێژی خەڵوەتی لەگەڵ فرمێسکی بەژنوباڵا جوان. بە دوای ئەوەدا بەباشم زانی بەر لەوەی هاوڕێکانی دیکەمان لە خەو هەستن، دەردە دڵەکانی خۆمان تەواو بکەین. بۆ ئەم مەبەستە، نووسراوەکەی دایکم کە بۆی بەجێ هێشتبووم، پێدان. لەپێش دا فرمێسك خوێندییەوە و پاشان بۆ چیمەنی گێڕاوە، چونکە چیمەن نەیدەتوانی کوردی بخوێنێتەوە. ئەوان هەردووکیان پێشنیاریان کرد کە با کۆبوونەوە گشتییەکەمان بە خوێندنەوەی ئەم وەسیەتنامەیە دەست پێبکا، چونکە نابێ لەبیرمان بچێ کە لەسەر پێشنیاری کۆچکردوو دادە وەنەوش بوو، کە کۆبوونەوەکەمان بە نیوەچڵی هێشتەوە و کاتەکەمان گۆڕی. ئێمە هێشتا خەریك بووین بە ئاڵوگۆڕی بیر و ڕاکانمان لەسەر چۆنیەتی کۆبوونەوە گشتییەکەی بەیانیمان، کە زرمەی یەکەمین تۆپ لە قەراخ ئاوایی هەستا. لە گرمەی تۆپ و شریخەی چەکی قورس و سووك دا، ئێمە و هەموو خەڵکی دێ هەراسان بووین. تاکو ئێمە خۆمان کۆ کردەوە، سپای ئیسلامی بێگەردی موحەممەدی بە دانی دروشمی: الله اکبر، الله اکبر. دەورەیان داین و بەرزاییەکانی ئاواییان لێگرتین. ئێمە بە پەلە خۆمان کۆ کردەوە و بەرەو نێو باخەکانی پشت دێ وەڕێ کەوتین و لەنێو دار و کون و کەڵەك دا خۆمان حەشار دا. لە هەموولایەکەوە گوێمان لە زرموهۆر و تەقەی تفەنگ بوو هەروەك بەرەی شەڕی نێوان دوو وڵات.

دڵەخورپە دایگرتبووین و نەماندەزانی چیمان بەسەر دێ. ڕۆژگار گەلیك درێژ دەهاتە بەرچاومان و رامان هەست دەکرد کە ساڵێکە خۆمان هەشار داوە. بۆ ئێوارێ کە لێڵە داهات، لە دەوری یەك کۆبووینەوە بۆ ڕاوێژکردن کە چ بکەین. چۆن بکەین تا نەکەوینە دەستی پارێزەرانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام!

هێشتا سەرەتای ڕاوێژ کردنمان دەست پێنەکردبوو، کە لەپڕ کوڕێکی هەرزەکار ملی پێدا کردین. سەرەتا پەشۆکا و خەریك بوو هەڵبێ، بەڵام گورج ئێمەی ناسییەوە و هات بەرەو لامانەوە. ئەو هەردووك دەستی لە پێشەوە بە تەلی ڕەق بەسترابۆوە.

شەپۆل قۆڵی بەستراوی سەرکەوت کە زچەی خوێنی دەهات کردەوە و لێیپرسی:

- دەتوانی بڵێی چیان بەسەر خەڵك هێناوە؟

- کاکە گیان! زۆربەی خەڵکی گوند بە دیل گیراون. ژمارەیەکی زۆریش کوژراون. منیش گیرام و قۆڵبەست کرام. کاتژمێر دووی پاش نیوەرۆ هەموو خەڵکیان لە گۆڕەپانی دێ کۆکردەوە. پێش هەموو شتێك جل شۆڕێکی گەنج چووە سەر زرێپۆشێك بۆ ئەوەی هەموو خەڵکەکە بیبینن. لەپێشدا هێندێك قورئانی خوێند و پاشانیش بە گوتنی «نصر من اللّه و فتح قریب» کۆتایی پێهێنا. لە درێژە دا گوتی:

- ئێوە هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە دژایەتیتان لەگەڵ ئەم شۆڕشە مەزنەی خودا دەست پێکردووە. هاوکاری دژە شۆڕشتان کردووە و بەجۆرە خەیانەتێکی گەورەتان بە ئیسلام و ئێرانی عەزیز کردوە. ئەوەی دەبووا

نەیکەن، کردووتانە، بەڵام ئێمە دەتانبەخشینە گەورەیی خودا و بەخشندەیی پێغەمبەری مەزنی موسوڵمانان.

سەرکەوت درێژەی دا و گوتی:

ـ لە هەمانکاتدا کە جل شۆڕ لەبەرەکە قسەی بۆ دەکردین، زیاتر لە چل پەڕۆ سەوز بەسەر، دەست بە چەك و قامك لەسەر پەلاپیتکە، دەوراندەوریان تەنیبووین و پەیتا پەیتا "الله اکبر، الله اکبر"یان دووپات دەکردەوە و سڵاواتیان دەنارد، پاشان مەلای گەنج، پەڕۆ ڕەش بەسەرێکی بانگ هێشت کردە سەر زرێپۆشەکە. ئەو نەفەرە پارچە کاغەزێکی لە گیرفانی درهێنا و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەم ناوانە: جوامێر مەڵکشایی سوارە مایەشتی، بەختیار کامیارانی، ساماڵ هەرسینی، کامەران یارسانی، وەنەوش دێلوڕانی، شوان ئەرکەوازی.

پاش خوێندنەوەی ئەو ناوانە ڕای گەیاند:

- ئەو حەوت کەسەی کە ناوەکانیان خوێندرایەوە، بێنە پێشەوە بۆ بەردەم زرێپۆشەکە. ئەوانەی کە لەوێ بوون چوونە پێش، بەڵام بۆ خۆتان دەزانن کە پورە وەنەوش پێرێ کۆچی دواییکرد و کاك شوانیش ئەمەتە لێرەیە.

پاشان مەلای جل شۆڕ پرسی:

- وەنەوش ئافرەتە یان پیاو؟

مامۆستا جوامێریش پێی گوت: ئەو ئافرەتە و لە ژیاندا نەماوە.

ئەوجار ئەو کابرایەی کە لەسەر زرێپۆشەکە و لە پاڵ مەلاکەدا ڕاوەستابوو گوتی:

- ئێمە دەزانین کە وەنەوش زیندووە و هەر دوێنێ و پێرێ، کولانەی دژە شۆڕشی بنەوا ناوە. باشتر وایە کە ڕاستمان لەگەڵدا بکەن و پێمان بڵێن لە کوێ خۆی حەشار داوە؟

ئەمجارەیان مام نەسۆر کە لە پێشی هەمووانەوە ڕاوەستابوو لێیان هاتە جواب و گوتی:

- ئێوە هێندە بێباوەڕ و خۆپەرستن، کە بە مردنیشمان باوەڕ ناکەن! ئەوەتا هێشتا زاری لە گۆڕەکەشدا سارد نەبۆتەوە. دەتوانن بڕۆن لە گۆڕی دەرهێنن بۆ ئەوەی دڵتان سوکنایی بگرێ! خۆ بە وتەی خۆشتان بێ، خودا ئەو دەسەڵاتەی پێداون کە بە گەزی خۆتان پێوانە بکەن.

بەڵام مام نەسۆر بە کوردی قسەی کرد، چونکە بۆ خۆتان دەزانن کە ئەو فارسی نازانێ. لەو کاتەدا سیخوڕێکی کورد کە لەگەڵیاندا بوو، قسەکانی مام نەسۆری بۆ مەلاکە وەردەگێڕاوە سەر فارسی. بە دوای وەرگێڕانی قسەکانی مام نەسۆردا، مەلای گەنج ڕایگەیاند:

- پیری ڕیشبڕاو، ئەتۆش وەرە ڕیزی ئەو پێنج کەسەی دیکەوە کە لە پێشەوە ڕاوەستاون. مام نەسۆر هێزی تێدا نەبوو تاکو گورج هەستێ، دوو کەس لە پارێزەرەکانی مەلاکە قۆڵی مام نەسۆریان گرت و لەتەنیشت ئەوانی دیکەیان دانا. بە دوای ئەوەدا مەلا ئەمری کردە چەند کەسێك لە پەرۆ بەسەرەکان و گوتی:

- نەفەرێك لەوانەی کە بە گۆڕی وەنەوش دەزانن لەگەڵ خۆتان بەرن بۆ گۆڕستان و وتەکانی ئەم پیرە پیاوەم بۆ بەتاقی بکەنەوە. ئەو لێپرسراوەی

که به سەر زرێپۆشەکەوە بوو، چاوێکی بە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا گێڕا و پرسی:

- کێ بە گۆڕستان و گۆڕەکان دەزانێ؟

منیش (سەرکەوت) کە قۆڵم زۆر توند بەسترابوو و ئازاریشی هەبوو، لە وڵام دا گوتم:

- من پێیان دەزانم.

ئاخر بۆ خۆم لە بەخاکسپاردنی دادە وەنەوشدا بەشدار بووم و دەمزانی کامە گۆڕ هی ئەو بوو، بەڵام بێجگە لەوەش لای خۆم وامدانابوو کە قۆڵم دەکەنەوە و هێندێك لە ئازارەکەم، کەم دەبێتەوە. هەر بۆیە گورج گوتم، گۆڕەکان پێدەزانم.

مەلا چەند کەسێکی لە پاسدارەکان هەڵبژارد و پاشان منیان وەبەر خۆیاندا و وەڕێ کەوتین بۆ گۆڕستان. ئەوەی ڕاستبێ، لە ترسان هەشەکە خستبوومی، نەمدەتوانی بە خێرایی بڕۆم بە ڕێگادا و زۆرجاران ڕشانەوەم دەهات. بە گەیشتنمان بۆ سەر گۆڕستان، لەبەر ترسی لە ڕادە بەدەر، گۆڕەکانی خاڵە شامار و خاڵە شاسوار و دادە وەنەوشم لێ تێکچوون، چونکە ئەوان هەرسێکیان لە کەمتر لە دوو حەوتوودا کۆچبار ببوون و بەردی مەزاریشیان بەسەرەوە نەبوو تاکو لە ڕووی ناوەکانیانەوە پییان بزانم. هەرچۆنێك بوو بە گۆترە دەستم لەسەر یەکێکیان دانا و گوتم ئەم قەبرەیان هی دادە وەنەوشە.

ئەوان بە دەزگای بێتەل لەگەڵ مەلای تۆخس قسەیان کرد و ئەویش پێی گوتن، هەرلەوێ بن تاکو یارمەتیدەرتان بۆ دەنێرم.

من که له دوێنێ شەوێوە ئاوم نەخواردبۆوە زۆرم تینوو بوو، خەریك بوو لێلاّییم دابێت بۆ قۆمێك ئاو. ئەوانیش بۆ ئەوەی دەقە دەقە و ئازاری دەروونیم بدەن، جار نە جارێك قومقومەکانیان دەر دێنا و مژیان پێوە دەنا. زۆری پێنەچوو که نیزیك به بیست پەڕۆ بەسەرێك بە پاچ و پێمەڕەوە گەیشتنە گۆڕستان. ئەوان له ماوەی کەمتر له نیوە کاتژمێریکدا، گۆڕەکەیان داوە و تەرمەکەیان هێنایە دەر. بۆنی تەرمەکە ئەو ناوەی داگرت، بە جۆرێك که خەریك بوو چاوەکانم له بلیاق بێنە دەرێ، بەلاّم ئەوان پەڕۆ سەوز و ڕەشەکانی سەریان کردەوە و زار و لوتی خۆیانیان پێ هەلّبەست. نەفەرێکیان که لەوانی دیکە دلّڕەقتر دەهاتە بەرچاو، بە سەرنێزەی چەکەکەی، لای سەرەوەی کفنەکەی هەلّدڕاند. ئەو چاوێکی لێکرد و پشتا و پشت بەرەولای من گەڕایەوە. هەر ئەوەندەم زانی که له نەکاو هەتا هێزی تێدا بوو، سێ چوار پێلاقەی سرەوانده پشت و پەراسووم، که هەناسەم لێبڕا، بە جۆرێك که چرکە ساتەکانی مردنم هاتنە بەرچاو. ئەو پێی گوتم:

- کەری کوڕی کەر! دەتوانی کلاّو لەسەر ئێمە بنێی، وەرە پێش و چاو لەم مەیتە بکە و بزانە هی پیاوە یا ئافرەت؟ لای ئێوە ئافرەت کیلۆیەك سمێلّی هەیە؟

منیان بردە سەر مەیتەکە و سەرەڕای ئەوە که هیچم له زگدا نەبوو، بەلاّم لەبەر بینینی مەیتەکە هێندە ڕشامەوە و هۆقم کرد، که خەریك بوو هەموو ڕێخۆلّەکانم له گەروومەوە بێنە دەرێ.

گورج وەخۆم هاتم و گوتم: بڕواتان بێ لە ترسان لێم تێکچووە کە کامە گۆڕ هی کێیە. ئەو گۆڕەی دیکەیان هی دادە وەنەوشە و ئەمەیان کە دەرتان هێناوە مەیتی خاڵە شامارە. خۆ ئێوە زۆرن و تازە شامارتان لە گۆڕ دەرهێناوە، بێگومان دەتوانن و لە تواناشتان دا هەیە ئەم گۆڕەش بدەنەوە و تەرمی دادە وەنەوشیش دەربێنن. بڕواتان بێ، سوێند بێ بە هەرچی ئێوە بڕواتان پێیە، کە تۆزقاڵێك گومانم نەماوە کە ئەمەیان گۆڕی ئەو ئافرەتەیە کە ئێوە بە دویدا دەگەڕێن.

ئەوەی کە بەرپرسیان بوو، گوشی بێتەلەکەی هەڵگرت و بە مەلای گوت:

- قوربان! ئەم تەرمەی کە لە گۆڕمان دەرهێناوە، کیلۆیەك سمێڵی هەیە و لە ئافرەت ناچێ. ئەگەر فەرمان بدەن، دەتوانین بۆ دڵنیایی زیاتر چاو لە گشت جەستەی بکەین؟ من لە نیزیك ئەو کابرایە ڕاوەستابووم و گوێم لە قسەکانی مەلاکە بوو کە گوتی:

- بگەڕێنەوە دواوە و پێویست بەوە ناکا خۆتان ماندوو بکەن. ئەوان هەموویان لێم کۆبوونەوە و هەرکەسە و لە ڕاستی خۆی سەر و شەقیان تێسرەواندم!

لە دوایین چرکەدا کە دەیانویست بگەڕێنەوە، داوام لێکردن کە قۆڵم بکەنەوە تاکو گومەڵێك ئاو وەخۆم و لە ماوەی چارەگە کاتژمێرێکدا دادە وەنەوشیان بۆ لە گۆڕ دەرهێنمەوە، بەڵام کەسیان گوێیان پێوە نەبوو، تاکو بۆ منی ڕاگرن. لەو ماوەیە دا چەند جارێکی دیکەش داوای ئاوم لێ کردن، بەڵام کەس نەیوێرا قومێك ئاوم بداتێ.

ئێمە بەرەو گۆڕەپانی گوند گەڕاینەوە و بە گەیشتنەوەمان بەوێ، مەلا دوو کەسی لە پەڕۆ بەسەرکان کێشایە سوچێکی گۆڕەپانەوە و چەند سرتەیەکی لەگەڵ کردن. بە دوای ئەو سرتەکردنەدا، مەلا سەرکەوتە سەر زرێپۆشەکە و گوتی:

- ئێمە بەر لەوەی بۆ ڕزگارکردنی خاکی پیرۆزی ئێران لە دەستی دژە شۆڕش لەم ناوچەیە وەڕێکەوین، ناوی چەند کەسێکمان پێدرابوون کە ماکەی ئاژاوە و شێواندنی ئاسایشی وڵاتی ئازیزمان ئێرانن. بەو بۆنەوە و بۆ پاککردنەوەی خاکی ئێرانی ئیسلامیی لە گول و پیسەکان و لەنێوبردنی جیاێخوازەکان، لەلایەن ئیمام و دادگای شۆڕشەوە ئەمرمان پێکراوە کە ئەو کەسانەی ویستوویانە، یان دەیانەوێ بستێك لە خاکی پیرۆزی ئێرانی ئیسلامیمان لێ بکەنەوە، پاکانە حیسابیان لەگەڵ بکەین. لەم پێوەندیەش دا ئەم حەوت کەسەی کە ناوەکانیان دەخوێنمەوە، وەك تاوانبارانی سەرەکی، هەر لەم گۆڕەپانەدا بە سزای خەیانەت و خۆفرۆشی خۆیان دەگەیەنین. با بزانن کە دەستی تۆڵە ئەستاندنەوەی خودا چەندە درێژ و بەتوانایە!

١- جوامێر مەلەکشایی. ٢- سوارە مایەشتی. ٣- بەختیار کامیارانی. ٤- ساماڵ هەرسینی. ٥- کامەران یارسانی. ٦- وەنەوش دێلوڕانی. ٧- شوان ئەرکەوازی.

ئێستا کە شوان و وەنەوش لێرە نین، ئەسۆری ڕیشبڕاو و درۆزن لەگەڵ سەرکەوت گێلانی، کە درۆیان لەگەڵ ئێمە و خودا کردووە، دەکەونە بەر ڕق و تۆڵەی خودا و سزای مەرگیان بەسەردا دەسەپێ. ئێمە وەك پارێزەرانی

ڕاستی و جێبەجێ کەری حوکمی یەکسانی خودا و پێغەمبەرە مەزنەکەی، ئەرکمان لە سەرشانە و دەبێ ئەرکی یاسایی و ئایینی خۆمان بەجێ بگەیەنین، چونکە لە ئایینی ئیسلامدا درۆکردن حەرامە و خوداش ناتوانێ درۆزن ببەخشێ.

سەرکەوت کە زوو زوو چاوی لەملا و ئەو لێ دەکرد و ترسێکی زۆر لەشی داگرتبوو، لێدوانەکەی درێژەدا و گوتی:

- بە بیستنی ئەم هەواڵە، زارۆك و ئافرەتەکان دەستیان کردە هاوار و چریك و هۆڕ و بوو بە ڕۆمەڵ خەزایەك، کە کەس بەسەر کەس نەدەپرژا. لەپێشدا دەستەیەکی شەش کەسیان لە پاسدارەکان دیاریکرد، کە دوو بە دوو لە تەنیشت یەکتر ڕاوەستان، پاشان مەلاکە چووە سەر زرێپۆشەکە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی ناوەکان. لەپێشدا مامۆستا جوامێریان هێنا و لە نارەڕاستی گۆڕەپانەکە بە دەست و قاچ بەستراوی دایان نا. مەلاکە گوتی: ئەم سپلۆتانە ڕژێیان تەواو بووە و دەبێ بەرێ کرێن بۆ دۆزەخ، پاشان ئایەتێکی قورئانی خوێندەوە کە هیچی لێ تێنەگەیشتم. بە دوای ئەوەدا فەرمانی دا بە پاسدارەکان و گوتی:

بچنە پێش و هەر کەسە و فیشەکێك لە ناجوامێر بدەن! ئەوان لە بەر چاوی ژن و منداڵان مامۆستا جوامێریان خەڵتانی خوێن کرد. لە سەرەتادا لام وابوو کە دەمانترسێنن و دەیانەوێ بە هەڕەشە بمانهێننە ژێر ڕکیفی خۆیان، بەڵام بە دیتنی ئەو دیمەنە لە تەنیا چرکەیەك دا بڕیارمدا هەڵبێم، چونکە من قاچەکانم نەبەسرابوونەوە.

خەڵکەکە تاقەت و ورەی دیتنی ئەو دیمەنانەیان نەبوو. هەربۆیەشە زیاتر ڕوویان لە دەرەوەی گۆڕەپانەکە کردبوو و بە گریان و هاوارکردن، دڵی دڵداریان دەتەرەکاند. من لە سەداسەد لام ڕوون بوو کە تەنیا چەند خولەکێك زیاترم بۆ ژیان نەمابوو. هەربۆیە دوایین بڕیاری خۆم داو ڕێك لەو کاتەدا کە مام نەسۆریان بردە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بۆ گوللەباران کردن، خۆمم کردە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا و لە پشتەوە بەسەر پەرژین و کەڵەکەکەدا خۆمم هەڵدا خوارێ بۆ نێو باخەکان. ئەوان چەند دەستڕێژێکیان پێدا گرتم، بەڵام هیچیان نەیانپێکام. لەبەر ئەوەی کەڵەك و پەرژینەکانیش گەلێك بەرز بوون و بۆ خۆشیان دەست لەسەر پەلەپیتکە ڕاوەستابوون، چاوەڕوانی هەڵهاتنی کەسیان نەکردبوو. ئەوان درەنگ وەخۆکەوتن و من ئیتر ناوەم کرد بوو و گەیشتبوومە لای ئاسیاوەکە. لەوێ گورج خۆم کردە تەمویشەی ئاشەکەدا و خۆم حەشاردا تا لێڵە داهات. ئێستاش ئەوەتا گەیشتوومەتە لای ئێوە.

فرمێسك کە بە بیستنی ئەو هەواڵە زیاتر لە هەمووان دڵی پڕببوو، هاتە جواب و گوتی:

- دیار بوو کە میراتگرانی شا سمایل لەمێژبوو خۆیان بۆ خەڵتان بەخوێنکردنی ئەم خەڵکە ئامادە کردبوو. کەم نین ئەم چەشنە ڕووداوانەی کە بە درێژایی مێژوودا بەرانبەر بە ئێمە کراون، بەڵام مخابن، ئێمە چەندە دڵپاك و خەیاڵاوین، کە متمانە بەداگیرکەر دەکەین. پێرێ لە باکوور بە دەستی پانتورکەکان بە زیندوویی دەیان هاویشتینە نێو گۆلی وانەوە. دوێنێ لە باشوور و بە دەست عەرەب و سەردارەکانی قادسیە، پۆل پۆل بێ سەر و

شوێن دەکراین. ئەمرۆش لە ڕۆژهەڵات و بە دەست میراتگرانی شا سمایل و بە ڕێبەری ئیمامەکەی جەماران، پیر و لاو، ئافرەت و منداڵمان دەبنە سووتەمەنی پاوانخوازی و کۆنەپەرستی ئایینی.

ئێمە نەماندەزانی لە خەم و ماتەمینی کام لەو خۆشەویستانەدا بین. ئاخر ئەوانیش هەر وەك ئێمە و بە ملیۆنها مرۆڤی دیکەی کورد، بە دەیان ئاواتیان هەبوو، بەڵام لەبەر مافخوازی، بەدەستی تاریك بینان ئارا ڕاپێچی بەستەری مەرگ کران. تەنیا لەبەر ئەوەی کورد بوون و دەیانویست وەکو هەموو میللەتانی سەربەستی ئەو دونیا بەرینە، بۆ خۆیان بڕیاری چۆنیەتی ژیانی خۆیان بدەن.

هەروا بە تەواوی تاریك داهاتبوو و دەبا خۆمان لەو بارودۆخە ڕزگار کرابا. داخ و کەسەر بە دەیان و سەدانەوە نەمابوو و دڵی دەویست خۆڕاگرێ. ئاواتەکانی ئێمە گەلێك ئاسایی و مافی بێ ئەملا و ئەولامان بوو کە دەکرا بە دەستی خۆمان و لەسەر ویستی خۆمان وەدییان بێنین، بەڵام مخابن و...

ئەو شەوە بە هەر سەختڵەتێك بوو لە تاریکایی شەو کەڵکمان وەرگرت و لە پشتی ئاواییەوە بەرەو شاخ خۆمان دەرباز کرد. لەبەر ناشارەزایی و جەمام بوون، چەند ڕۆژێکمان پێچوو تاکو خۆمان گەیاندە شاخی شاهۆ. پێشتریش دەمانزانی کە لەو ناوچانە دا بەرخۆدان هەیە و شۆڕشگێڕانی کورد بەرەنگاری سوپای نەزانی دەبنەوە.

پاش ماوەیەك کە گەیشتبووینە جەرگەی خەبات و خۆمان لەنێو پۆلێك لە کچان و کوڕانی بوێردا بینیبۆوە و تێکەڵ بە کاروانی تێکۆشەران بووین، بەسەر ئەو هەموو کۆسەڵکۆسەوەش، فرمێسك قەت پرسیارەکەی لە مەڕ

حاجی هەمزە لەبیر نەچووبوو. ئەوکاتەی کە حاجی بە تیپ و تەنتەنەیەکەوە هاتبوون بۆ سەرەخۆشی بە بۆنەی کۆچی دوایی خاڵو شاسوارەوە و لەگەڵ من و شێرکۆ لەسەر بان پێکەوە قسەمان دەکرد، ئەمن بووم (شوان)، پێشنیارم پێکرد کە فرمێسک بچێتە لای حاجی و بەو لەنجەولارە جوانەی، بەهەشتی بەرینی بێنێتە بەرچاو.

فرمێسك درێژەی داو گوتی:

ـ شوانە! بۆ خۆت دەزانی کە لە مێژە دڵت بردووم و تەنیا چرکەیەکیش لەبیرم نەکردووی. تا ئەو ڕۆژەش خوێن لە دەمارەکانم دا دێن و دەچن، هێز و هەناومی. چۆن لەو ڕادەربڕینەم تێدەگەی پێوەندی بە خۆتەوە هەیە، بەڵام من قسەکانم بێ پەردەن و ئەتۆش کەیفی خۆتە. ئێستاش دەبێ پێم بڵێی مەبەستت لە ناردنی من بۆ لای حاجی هەمزە چی بوو؟

ـ فرمێسك گیان! ئەوە بزانە کە ئەوینەکەت یەك لایەنە نییە و منیش لە یەکەم چاوپێکەوتنت دا، ڕوحم چووە سەرت و ئێستا بێ یان ڕۆژێکی دیکە، ڕازی دڵم پێ دەگوتی، بەڵام سەبارەت بە ناردنت بۆ لای حاجی هەمزە: ئەو لە لێدوانەکەی دا کە لەگەڵ شێرکۆی برات هەیبوو، تا جارێك ناوی شاسواری بەزاردا هاتبا، چوار جاریش ڕەحمەتی خودای بۆ دەنارد و دەیگوت: ئەو ئێستا لە بەهەشتی بەرین لە پەنا دەست پێغەبەران دا دانیشتووە خورەی ئاوی بەهەشت سەرمەستی کردووە!

منیش بۆ ئەوەی ڕادەی بڕوای حاجی بەو خودا گەورە و بەو بەهەشتە بەرینە تاقی بکەمەوە، ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات کە، کێ دەتوانێ لە خۆت شۆخ و شەنگتر بێ بۆ ئەم مەبەستە، چونکە لەلایەکەوە حاجی بە مەبەستی

سەرەخۆشیکردن لە ئێوە هاتبوو، کەوابوو ئەتۆ هەر دەبا سوپاسێکت کردبا، بێجگە لەوەش ئەو بە تەمات بوو و خەڵوەتخانەیەکی لە داری حەیزەران بۆ دروست کردبووی کە بە حەفتا و دوو وێنە ڕەنگی جۆراوجۆر ڕازاندبوویەوە.

ـ ئاخ شوان، بریا ئەوکات زانیبام کە مەبەستێکی وات لە ناردنم بۆ لای حاجی هەمزە هەبووە! بەڕاستی ژیرانەیە. بۆ پێشتر پێت نەوتم؟ دەی تاقیکاریەکە سەری لە کوێوە دەرهێنا؟

ـ ڕاستت دەوێ فرمێسک گیان، لە کاتێکدا کە بەرەولامان هاتی ئەرزای باری کرد و دەست و پای خۆی لە بیر چوو، بەڵام کاتێك بەو لەنجە و لارەوە گەڕایتەوە دواوە و سمتت لەژێر کەلەکەتەوە ئەملاو ئەولای دەکرد، حاجی بە جەستە لای ئێمە بوو، بەڵام ڕوحی باری کرد بۆ بەهەشتی بەژنوباڵای بێخەوشی تۆ و بەهەشتی بەرینی وادە دراوی بە شاسواریشەوە بە تەواوی لەبیر کردبوو.

بە گێڕانەوەی ئەو بابەتە لەلایەن منەوە، فرمێسك چووبووە بیرێکی قووڵەوە و هەستمکرد کە سەبارەت بە دوارۆژی خۆی، دوایین بڕیاری دابێ.

هێشتا کۆتاییم بە قسەکانم نەهێنابوو کە فرمێسك سەری هەڵبڕیی و لەگەڵ ئەوەی کە هەناسەیەکی بە کوڵی هەڵکێشا، گوتی:

ـ من لەمێژە دوایین بڕیاری خۆم داوە، بەڵام لەو ڕۆژەوە دادە وەنەوش لە کۆبوونەوەکەی دەرەوەی ئاوایی قسەی بۆ کردین دوا بڕیارم بە نیشتمانەکەم دا. یان بەڵێنی خۆم بەجێ دێنم و خۆ لەدەست داگیرکەران و داب و نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵایەتی ڕزگار دەکەم، یان سەرم لە پێناو ئەو ئامانجانە دا دادەنێم. شوانە گیان! لە بیرتە دادە وەنەوش گوتی چی؟ ئەو گوتی:

- دەمرم بۆ ژیان، ناژیم بۆ مردن.

پاش ئەوەی وتەکانی کۆتایی پێهێنا، لەوپەڕی باوەڕبەخۆبوون و خۆشەویستی دا کە لە ناخی دڵیەوە سەرچاوەی دەگرت، هەردووك باڵی وەك باڵی شابازی چیاکانی کوردستان بڵاو کردەوە و لە حاڵێکدا فرمێسك بە خوڕ لە گۆنای دەتکایە خوار، ئامێزی بۆ کردمەوە.

هێشتا باڵەکانمان بەتەواوی نەگەیشتبووە جێگایەك کە یەکتری لە ئامێز بگرین و هەست بە گەرمایی لەشی یەکتر بکەین. هێشتا نەهاتبووینە زمان تاکو بەڵێن و پەیمانێك بە نیشتمانە لەتوپەت کراوەکەمان بدەین، هێشتا شەرمان لە یەکتر نەشکابوو تاکو بۆ چرکەیەکیش بووە چێژ لە دەریای بێ بنی خۆشەویستی وەربگرین، کە لە نەکاو گرمەی بۆمبای فڕۆکە شەڕکەرەکانی دێوەزمەی نەزانیی، لێکی جویێ کردینەوە. فڕۆکەوانی فڕۆکەکانی دەسەڵاتی شومی داگیرکاری، بە فڕێدانی هەشت بۆمبای هێشوویی، ئەو چرکە ساتەی لێکردینە ئەو دۆزەخەی کە بۆ خۆیان قەت باوەڕیان پێی نەبووە. لە یەکەمین چرکە دا ژمارەیەك لە هاوەڵەکانمان دەستبەجێ گیانیان لەدەست دا و ئێمەش هەردووکمان بریندار بووین. من چەندین پریشك بەر قاچ و پشتم کەوتبوو، بەڵام فرمێسك پارچەیەك وە سینگی و پارچەیەکیش وە پەراسووی کەوتبوو. ئەو هاوەڵانەی کە بە ساغی دەرچووبوون، گەیشتنە سەرمان و دەستیان کرد بە تیمارکردنی بریندارەکان. فرمێسك لە حاڵێکدا فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوار و تێکەڵ دەبوو لەگەڵ فەقارەی خوێنی سینگی، هاواری کرد: «بمرن ئەوانەی ئەم بەهەشتەیان لە ئێمە کردۆتە دۆزەهههه،خخخخ».

ئەو نەیتوانی بە ڕێکوپێکی دوایین وشەی ڕستەکەی تەواو بکا و بەبێ ئەوەی چاوەکانی لەسەریەك دابنێ، بەو جۆرەی کە سەری نابووە سەر لاقە شکاوەکەم، دواهەناسەی هەڵکێشا و چووە خەوی یەکجارییەوە.

دیمەنی گیاندانی فرمێسك و ئەو هەواڵانەی دیکەم، دەرفەتی بیرکردنەوەی دیکەی پێنەدەدام و سەرەڕای هەوڵی زۆری هاوڕێیانی بەشی دەرمانی، خوێنی زۆرم لە بەر دەچوو. وادیار بوو ئەو پارچەیەی کە وە پشتم کەوتبوو کاری خۆی کردبوو و بڕبڕەی پشتمی شکاندبوو. پاش هێندێك سەر جووڵاندن، هەواڵی شەپۆل، چیمەن و شێرکۆم لە نیشتمان پرسی، کە خەریکی تیمار کردنی برینەکانم بوو.

ئەو لە وەڵامدا گوتی:

ـ ئەوەندەی دەزانم شێرکۆ بە سووکی بریندار بووە ئەوانی دیکەش سەلامەتن. شوانە! ئەمە ڕێگایەکە خۆمان هەڵمان بژاردووە و نە پێویست بە دڵتەنگی و گریان هەیە و نە بەبێ هیوایی و دەستەوئەژنۆ دامان. دەزانم ئێستا خەم و خەفەتی زۆرت لە دڵدایە و ئازاریشت زۆرە. کاتی ئەوەش نییە کە ئەم قسانە بکەم، بەڵام بەر لە هەموو کەسێك ئەوە بۆ خۆمانین کە تەمەنی داگیرکاریمان درێژ کردۆتەوە.

چرکە بە چرکە باردۆخی ژیانم بەرەو خراپییەوە دەچوو و لەنێوان مان و مردن دا گیانم دەکەند. نیشتمان سەرقاڵی بەستن و تیمارکردنی برینەکانی لەشم بوو و هێشتا گیانم تێ دا بوو کە تەواوی ڕووداوەکانی ئەم دواییانە وەکو فیلم دەهاتنەوە بەرچاوم. بیرەوەرییەکانم لەگەڵ هاوالانی کۆن و چەپی بێ ئاکامم. لە مانگا دۆشین و گەوڕ ماڵینەوە بگرە تاکو سووتانی پاڵتاوی

کرێکارە هەژارەکەی کوورەخانەی خشت لە سەرپێڵی زەهاو. بیرەوەرییەکانی ئەم چەند مانگ و ڕۆژانەی دوایی هەر لە فێربوون بە خوێندن و نووسینی کوردییەوە بگرە تاکو مردنی خاڵۆ شامار و لەگۆڕ دەرهێنانەوەی لە جیاتی مەیتی وەنەوشی دایکم، گوللەباران کرانی سوارە، جوامێر، بەختیار، سامان، کاروان و مام نەسۆر. بێبەختی دادە گەرشە و موڵك و سەروەت و سامانی خەیاڵی شاسوار. ماڵی لە دارحەیزەران دروستکراوی حاجی هەمزە بۆ بێتاقەتی شەوانی لەگەڵ فرمێسك. وڵامی تاقیکاری لە کرماشان و دووگیان بوونی شێرزاد، وتەکانی دوکتۆر نەبەز لە سەرپێڵ و دوکتۆر زەردەشت لە ئیلام. بەسەرهاتی سەیران و شاهۆی بە موحەممەد کراو. ئەو یاساوڵەی کە بە جلی ئافرەتانەوە هاتبۆە خەونم. نیشتمان هێشتا خەریکی تیمار کردنی برینەکانی پشتم بوو و منیش بەهۆی لەبەرچوونی بەفەقارەی خوێنی لەشم، کات لەگەڵ کات بێ هێزتر دەبووم. تارمایی مەرگ وەك پەردە باڵی بەسەر چاوەکانما کێشابوو. سەرەڕای ئەوەش بەدەم گیانەوە خەونەکەم بۆ نیشتمان گێڕاوە و لێمپرسی:

- چی لەم خەونە تێ دەگەی؟

- ئەوەندەی لێ حاڵیم کە ئەو یاساوڵە دایکی نیشتمانە و ئەویش هەروەك ئێستای خۆت فەقارەی خوێن لەبەرچوونی جەستەی چوارلەتکراوی ڕاناگیرێ و ڕۆژ نییە کە بە هەزاران لیتر خوێنی ڕەشی لەبەر نەچێ!؟

هێشتا قسەکانی نیشتمان لە گوێم دا دەنگیان دەدایەوە و زمانم بە هاستەم لە زارم دا دەسۆڕا کە بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە چوار دەنگ مۆر، وەك چەمەری و دوایین ماڵئاوای بۆ چارەڕەشی گەل و وڵاتەکەم چڕی.

من وەی بەخت شەڕ بێ نسیوەوە وەی جەرگ بڕیاگ دڵ وەخوینەوە

وەی شین و ڕۆڕۆی کەس نەزانەوە وەی شوڵەی ئاگر خەم گڕانەوە

کزەی زامەکان وەدەم سۆزەوە دەروون پڕ لە داخ گەل و هۆزەوە

من سوزیام وەداخ نیشتمانەوە داخێ ها وە بان گشت داخانەوە

ئەوەندەم هەست پێکرد کە نیشتمان دەستەکانی لەسەر چاوم دانا و بە گوێی دا چرپاندم:

- "شوانە! دەستی زۆرداری ئێوەی لە ئێمە سەند و تۆ ئیتر بۆ هەتاهەتایە دەنوی. دڵنیابە کە ئاواتەکانتان دێنە دی".

ئیقبال سەفەری

سوئێد ستۆکهۆڵم

٢٠٠٦-٢-١١

## کورتەیەك لەسەر نووسەر:

ئیقباڵ سەفەری لە ساڵی ١٩٥٣ زایینی لە گوندی زەردە لە دایك بووە. ئاوایی زەردە سەر بە شارستانی داڵەهۆ لە پارێزگای کرماشان و ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. خەڵکی ئەو ناوچەیە بە هۆی هەڵکەوتنی جوگرافی و ستراتیژی بوونی لە لایەك و خۆڕاگری و بەربەرەکانی لەگەڵ داگیرکەرانی بێگانە دا، ڕەسەنایەتی کولتوری و کەلەپوری کوردی خۆی پاراستووە. نووسەر یەکێکە لە بناغەدانەرانی هێز و کۆمیتەی داڵەهۆی حیزبی دیموکراتی کوردستان بووە. ساڵانێکی دوور و درێژ لە سەنگەری خەباتی بەرگریی لە نەتەوە و نیشتمانەکەی دا تێکۆشاوە و چەند جار خوێنی ڕژاوەتە سەر خاکی کوردستان. لە ساڵی ١٩٩٥ی زایینییەوە پەڕیوەی هەندەران بووە و لە وڵاتی سوئێد گیرساوەتەوە. لە هەندەرانیش لە پێناو ناساندنی دۆزی ڕەوای گەلەکەی دا چالاکە.

## ڕێز و پێزانین:

جێی خۆیەتی لە کانگای دڵمەوە سوپاسی هاو سەنگەر و هاوڕێیانی خۆشەویست و ماندوویی نەناسەم بەڕێزان: هاشمی ڕۆستەمی، حەسەن ئەهوەن، کەماڵ گروێسی، جوتیار هەورامی و حەسەن حاتەمی بکەم کە سەرەڕای کار و ماندووبوونی ڕۆژانەی خۆیان، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هاوکاریان کردم لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ڕۆمانە. هەروەها سۆپاس و پێزانینی خۆم پێشکەش بە کاك سامرەند بکەم بۆ ماندووبوونی بە کێشانەوەی وێنەی شیاو بۆ ڕووبەرگی ڕۆمانەکە.

# فەرهەنگۆك

## ئا/

ئاخداخ: شاخێکی نێوان شارەکانی قەسەرشیرین و خانەقینە

ئالیخانی: شەدە

ئاسیاو: ئاشەبەردینە

ئەرخەوا: کەسوکار

ئەرواح: روح

ئیجباری: سەربازی

## ب/

بالۆرە: گۆرانیی، بەیت (جۆرێك لە گۆرانیی)

بانگلان: بان گێڕان ( لە کاتی باران و یا پێش و دوای باران بارین)

بەخیل: بەغیل

بزگیری: چێوداری

بگار: بوار ( تەنکاو )

بلیاق: لەجێ دەرهاتن. چەوێ لە بلیاق دەرچییە

بلچ: گوێژ

بەروبووم: بەرهەم ( بەرهەمی دەغڵ و دان)

بەلادەمێکەوە: بەبێ مەیلیەوە، بە لالوتیەوە

بەیتە: سەڵت، وێڵ

بەیتە: چارەوای ڕەبەن و وێڵ

بینگ: بین

بێدەنگ: نەبزوێن. پیتە!

بێکرچە: بەئەسپایی (لە سەرەخۆ)

## پ/

پاخەوا: قوڕی گیراوە

پارێنە: گوێلی پار

پاسار: لێواری بان، گوێ سوانە

پاوەڕۆژ: مانگ و ڕۆژی منداڵبوون

پشتکۆڵ: داخستن، قایمکردنی دەرگا

پلە: پەیژە (نێردیوان)

پوشەن: راخەر، لێفە و دۆشەك

پەرمین: لەخۆڕا دیتن

پەرەشوت: چەتری خۆهەڵداشتن

پەس: ئاژەڵ

پەنەمین: ئاوسان، هەڵمساو

## ت/

تۆخس: نەگونجاو

تۆشو: خواردەمەنی

جۆر تەشیلە: گورج و گوڵ

تەلار: بەرهەیوان

تەمویشە: قولکی ئاشەبەردینە

تەو: تا، پلەی گەرمای لەش

تیانچە: قەزان، مەنجەڵ

## ج/

جەمام: خاوبوون

جەمام بوون: خاوبوون، لەشی خاو

جەوی: کەتیرە

## چ/

چپەچپ: پچە پچ، لەسەرەخۆ دران

چرچ: گرژ، گنج

چلوچاو: چاوڕاو، دەنگۆ

چلوفل: نەسرەوتوو

چنگ کردن: چەمبۆڵە لێنان

چەقین: ڕۆچوون

چیخۆڵکە: چیفی چووکە

## ح/

حاڵبردن: بێهۆشبوون لە کاتی منداڵبوون دا

## خ/

ختوورە: پەژارە

خڕخواردن: خولانەوە

خرت: نێری دووساڵە

خۆرەتاو: بەربەرۆچکە

د/

داخکردن: سووتاندن

دارسان: لێرەوار

دامردن: دامرکان

دڵ خاییس بوون: دڵ لە ژێلێلا هاتن

دورنج: قورم

دووگیان: زگ پڕ، حامیلە

دەپەڕمێ: لەخۆڕادێتن

دەرە: سەریخۆ هەڵگرتن

دەژ: نەژاکاو، دەست لێنەدراو

دەسەوارە: نەردوو، بۆ نان بەکار دەبرێ

دەشایی: نیوقرۆش

دەفر و دۆڵە: قاپ و قاچاغ

دەنگدار: بزوێن

ڕ/

ڕێخەڵۆە کوێرە: ئاپاندیسیت

ز/

زرمە، رمە: گرمە

زوخاڵ: خەڵۆز (ڕەژی)

زێرەوانی: لەشکری

ژ/

ژەیك: شیری ئاژەڵ کاتی زایین

س/

ساجکەڵە: تازەپێگەیشتوو

سپلۆت: گلاو، گول و پیس

سەرماوقۆتان: سەرمەقلانێ

سەرەپەڕ: خێرا، ( بیور کە لەکاتی دارشکاندندا دەردەچێ).

سەما: هەڵپەڕکێ

سەڵتە و زوون: جلی ئافرەت

سەهەنە: سەحنە، ناوی شارێکە

سیاون: بزن، گیسك، کار

سیپاڵ: جلوبەرگ

سێ شەش: هەژدە ڕۆژی ئەوەڵی وەرزی بەهار

ش/

شام کوشتن: کوشتنەوەی ئاژەڵ بەبۆنەی دوامالئاوای لە کۆچکردوو

شاوێر: ناونیشان

شەکە نێر: نێری دووساڵە، کاوڕ

شوێن و هەتەر: شوێنەوار

شەوق: ڕووناکایی

شێرپەنجە: سەرەتان

شێرەکە: لەخۆباییبوون

ف/

فەرەنجی: کوڵەباڵ

فەڕاشە: کلیل، کلیر

ق/

قازان: مەنجەڵی گەورە

قشقاڕە: قشقەڵە، مەلێکە

قەڵاف: کاڵان

قۆڵە: قیبلە، لە وڵاتی سعودیە

قۆرغ: پاوان

قیژاندن: چریکاندن

ک/

کوارکردن: کۆکردنەوەی بەروبوومی کوێستان

کوانگ: ئاورگ

کوانوو: ئاورگێ

کوناواجە: کون بۆ هەوا و ڕووناکایی ژۆر

کونەڵان: جێگای کونە و ئاو

کۆڵ کێش: کۆڵبەر

کویزە: گۆزە

کۆسەلکۆس: کۆست کەوتن

کۆڵەبڕک: پلار، خێرا، گورج

کەپەلویران: با و بۆران

کەرە: فەریکە ڕۆن

کەلێن کردن: بەستنەوە

کەلاوە: ماڵی رووخاو، ماڵێ تێکتەپیو

کەوان: رمبێك

## گ/

گرا: دەرەجە، گراد

گرەلێکەوتن: گەشانەوە

گزگل: بەری دارمازوو

گل وپل: جموجۆڵ

گلێم: بەڕە

گۆمەڵ: لوێچ

گەوڕ: هۆڵی ئاژەڵ

گەوەن: گوێنی

گێجەنگە: رەسمە

## ل/

لاپەڕە: کاغەز

لاکێشکردن: خوارچوون، چەوت

لفانە: دوانە

لوقمان: حەکیم، دوکتۆری گیایی

لەشولار: قەد و باڵا

لەشین: هاڵبەستنی چارشێو

لەشین: هەڵوێزنینی چارشێو

لیتکە و پیتکە: نێو و نیتکە

لیلق: بنج و بناوان، ڕەگ و ڕیشە

م/

مزیور: کرێکار، پێشخزمەت

مژپیێوەنان: هینگ پێوەنان

مق: مرتەق

مل وەپێە کردن: تووشبونی لەنەکار

ملۆوچە: پێچانەوە، گنۆڵە کردن

مەلاق: مەڵاشوو

مەمەر: هۆکار، سەبەب

مەوج: جاجم

میخوڕ: بەری دارمازو

میمك: پوور

ن/

ناخەوا: پلوسك

نافە: ناوکە، ناوك

نەوگ: لباد

و/

وازگوفت نەو: پاشملە ( چاکەکردن بۆ کەسێك، بەڵام لەملاو لەولا باسی نەکەی!

ولێوبوون: گەورە بوون

وەچ، وەچەکان: جیل، جیلەکان

وەرکوڵ: بەرکوڵ، پێش ناغواردن

وەك تەشیلە: گورجوگۆڵ

وەنۆز: چاوگەرمکردن،سەرخەوشکاندن

هـ/

هارونئاوا: شائاباد، ئیسلامئاباد

هنگ: فم کردن

هەپك: وشك بوون، ڕێ لەبەر نەچوون، حەبەساو

هەچەڵ: لەداوکەوتن

هەشەکە: بڕست لیبڕان، لە ترسان

نان هەڵاتە: نان کە لە هەویری تورشاو دروست دەکرێ

هەن: لا، جێگا

هەنجینە: لەتلەت، لەتوپەت

هەورە تەرەقە: هەورەتریشقە

هەونەنگ: دەسکاونگ

هەوێل: تەوژم

